فاروق عەلی عومەر



# ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا

بەراییەکان
١٩١٤-١٩٣٩

و: تاریق کاریزی

عەبدوڵلا زەنگەنە
دەقە ڕۆژنامەوانییە کوردییەکانی ساغ کردۆتەوە

فاروق عەلی عومەر

# ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا

## بەراییەکان

## ١٩١٤ - ١٩٣٩

لێکۆڵینەوەیەکە وەک بەشێک لە پێداویستییەکانی وەرگرتنی پلەی ماجستێری ئاداب لە ڕاگەیاندن، پێشکەش بە ئەنجوومەنی کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدا کراوە

**تاریق کارێزی**

کردوویە بە کوردی

**عەبدوڵڵا زەنگەنە**

دەقە ڕۆژنامەوانییە کوردییەکانی ساغ کردوەتەوە

چاپی یەکەم - هەولێر
2001

**دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی موكريانی**

**كوردستان ت. «٢٢٢٩٩٩٢»**

**e.mail:mukriani@yahoo.com**

- **كتێبی ژمارە: «٨٦»**
- **كتێب: رۆژنامەگەريی كوردی لە عێراقدا بەراييەكان (١٩١٤ - ١٩٣٩)**
- **نووسينی: فاروق عەلی عومەر**
- **وەرگێڕانی: تاريق كارێزی**
- **ساغ كردنەوەی دەقەكان: عەبدوڵڵا زەنگەنە**
- **هونەركاری ناوەوە: قاسم قادر**
- **بەرگ: محەمەد قادر**
- **چاپی يەكەم: هەولێر - ٢٠٠١**
- **ژمارەی سپاردن «٢٤٠»ی ساڵی ٢٠٠١دراوەتێ.**
- **چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر**

# کورته پەیڤێک

لەسەر خواستی دەزگای رۆژنامەنووسیی برایەتی و خەبات و، ئەرکی وەرگێرانی ئەم (ئەترووحە - کتێب)ـەم گرتە ئەستۆ، هەفتانە - وەک کتێبی ژمارە ٢٣ی برایەتی - یەک ئەلقەی بە یەک لاپەڕەی تەواوی رۆژنامە لێ بلاو دەکرایەوە.

سەرەتا ئەلقەی یەکەمی لە ژمارە (٣٠١٢)ی رۆژی ٢٠٠٠/١/٢٠ی رۆژنامەی برایەتی بلاو کرایەوە، لە ئەلقەی (٩) بە دواوە تا ئەلقەی ژمارە (٢١) کە دوایین ئەلقەی بوو لە ٢٠٠٠/٦/١٦دا، لە هەفتەنامەی (برایەتی ئەدەب و هونەر)دا بلاو کرایەوە.

بە سوپاسەوە دەزگای چاپ و بلاو کردنەوەی موکریانی پێشنیاری کرد، دەقی وەرگێرانە کوردییەکەی (رۆژنامەگەریی کوردی لە عیراق دا) بە شێوەی کتێب چاپ و بلاو بکاتەوە. ئەم کارو پێشنیارە بۆ نووسەری ئەترووحەکە بەرێز فاروق عەلی عومەر و منی وەرگێر مایەی خۆشحالییەکی زۆر بوو. لەو لاشەوە بەرێز عەبدوللا زەنگەنە پسپۆر و شارەزای بواری رۆژنامەنووسیی کوردی، ئەرکی قورس و پیرۆزی ساغ کردنەوەی دەقە رۆژنامەوانییە کوردییەکانی گرتە ئەستۆ، بۆ ئەوەی ئەم کتێبە وەک ژێدەرێکی شایستەو پوخت بکەوێتە بەر دەستی خوێنەران، هەروەها قوتابیانی بەشەکانی راگەیاندن لە پەیمانگاو زانکۆکانی کوردستان، بۆ ئێستا و داهاتوو سوودی لێ وەربگرن.

**تاریق کارێزی**

# پێشەکی

ڕۆشنبیرانی کورد، بە هۆی بارودۆخێکی پەیوەست بە گەلەکەیان وا ڕاهاتوون کە داوێنگیری هەر کارێک بن کە لە بواری ڕۆشنبیری دا بە خزمەتێکی گشتی دابندرێت، بۆیە بە لامانەوە سەیر نابێت، کە دەزانین سەرگەرمن و لە بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە و پشکنین و دۆزینەوە و شی کردنەوە و خستنەڕوو ماندوو نابن.

لە بواری لێکۆڵینەوە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیش دا دریغییان نەکردووە، ئەم ڕۆشنبیرانە وەک چۆن لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و بە تایبەتی شیعر دریغییان نەکردووە، بەڵام سەبارەت بە ڕۆژنامەگەری، ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەمانەن:

١- پتر باسی ڕۆژنامەنووسان و بە تایبەتی سەربردەو ژیننامە و نووسینەکانیان کراوە، نەک ڕۆژنامەکان خۆیان.

٢- هەر تەنیا کورتەیەکیان لەبارەی گوتارو ڕۆژنامەو گۆڤارەکان تۆمار کردووەو ئەرشیفیان کردوون.

٣- لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژنامەگەریی کوردی بە دەگمەن نەبێت بەلای کاری مەیدانی و ئەکادیمی و زانستی دا نەچوون.

٤- بە هەڕمێن بوونی گەلێ هەڵە و جێگیر بوونیان.

٥- لێکۆڵینەوەو کاری وەرگێڕدراو سەبارەت بە ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراق دا بە زمانی عەرەبی، کە لێرەدا مەبەستی ئێمەیە، وەک پێویست نییە.

سەبارەت بە ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراق دا، ئەوەی بەزمانی عەرەبی لەبەر دەست دایە هێندەی پەنجەکانی یەک دەست نابن.

جا ئەوەی یەکسەر دێتە بەر زەین، ئەوەیە کە لە کتێبەکەی عەبدولڕەزاق

ئەلحەسەنیی مێژوونووس دایە (تأريخ الصحافة العراقية) کە تا ساڵی ١٩٣٣ دەگرێتەوە، هەروەها کتێبی (كشاف الجرائد والمجلات العراقية)ی زاهیدە ئیبراهیم، بەڵام ئەوەی کە تێبینی دەکرێت زانیارییەکانیان ئەوەندە وردنین و پڕیشن لە هەڵە، لەبەر هۆیەکی ئەوتۆ نا، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە زمانی کوردییان نەزانیوە، هەروەها لەبەر لەمپەری نەزانینی زمانەکە، خۆیان بە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان دا نەچوونەتەوەو نەیان خوێندونەتەوە.

ئەو هەوڵ و کۆششانەی دی کە شایستەی ناوهێنان بن، کتێبی (تأريخ الصحافة الكردية في العراق)ی جەبار جەباری و کتێبی (ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی)ی جەمال خەزنەدارە، یەکەمیان بیبلیۆگرافیایەکی هەمەکیی زۆر خێرایە، دەربارەی ڕۆژنامە و گۆڤار و چاپخانە و ڕۆژنامەنووسەکان، هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەشی تێدایە کە لە سەرەتای ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراق دا تا دەگاتە ساڵانی حەفتا لە بارەیانەوە نووسراون. هەرچی دووەم کتێبیشە بە هۆی ئەوەی بە هەر سێ زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی دەرچووە، ئەوە کەمتر سوودی لێ وەرگیراوە، لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت کە خوێنەری عەرەب بە جۆرە کارێکی وا ڕانەهاتبێت، بێ لەوە کتێبەکە بریتییە لە ئەرشیفێکی پوخت و بە پەلەی ڕۆژنامەگەریی کوردی چ ئەوەی لە عێراق دا بوو بێت یا لە دەرەوەی عێراق دا.

بە گشتی هەردوو کتێبەکە ماوەیەکی زۆرە لە بازاڕدا نەماون و سەبارەت بە خوێنەر و لێکۆڵەری غەیرە کورد چوونەتە ڕیزی لەبیر چوونەوە. لەبەر ئەو هۆیانە و پێویستی هەبوونی لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی زانستیی ئەکادیمیانە دەربارەی ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراق دا، نووسین لەم بوارەدا بووە بابەتی هەڵبژاردەم و پەیڕەوی میتۆدی وەسفکارانەشم تێدا کرد، کە زانیاری دەربارەی ئەو بەشە شاراوەیەی ڕۆژنامەگەریی عێراق - هەڵبەت زمان لەم بارەیەوە لەمپەرێک بووە - بە دەستەوە دەدات، جا بە هۆی درێژیی ماوەی کاروانی ئەم ڕۆژنامەگەرییە لەودەتای یەکەمین گۆڤاری کوردی لە ساڵی ١٩١٤ لە عێراق دا دەرچووەو، زۆربەی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی لەو ساڵانەدا دەرچوون، بۆیە خۆم لە قەرەی ئەو ماوەیەی

دەکەوێتە نێوان هەردوو ساڵی ١٩١٤ و ١٩٣٩داوە، کە من لە عێراق دا بە سەرەتای ڕۆژنامەگەریی کوردیم داناوە، لەبەر چەند هۆیەکی کە لەوانەیە پەیوەست نەبن بەم قۆناغەوە بە قەدەر ئەوەی پەیوەستن بەو هەنگاوە گەورانەی ڕۆژنامەگەریی کوردی لە ساڵی ١٩٣٩دا پێیان دا تێپەڕی، کە ئەو ساڵە بە سەرەتای قۆناغێکی نوێی پێشکەوتووتر لە قۆناغی سەرەتاکان دادەندرێت... هەندێ لەو گۆڕانکارییانەش ئەمانەن:

١- دەرچوونی (گۆڤاری) گەلاوێژ لە کانوونی یەکەمی ١٩٣٩دا، کە تاکو ئێستا لە نێو کۆمەڵگای کورد، بە تایبەتی لە نێوەندی رۆشنبیری دا، بە کاراترین و کاریگەرترین گۆڤار دادەندرێت، هەروەها زۆر کەس بە چاکترین گۆڤاری ئەو سەردەمەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی داناوە.

٢- دەرچوونی ڕۆژنامەی (ژین) لە بیست و شەشی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٩دا، کە بە تەمەن درێژترین ڕۆژنامەی کوردی دادەندرێت، لە سەرەتای پەنجاکان ژمارە هەزاری دەرچووە و بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ تا ساڵانی حەفتا لە دەرچوون بەردەوام بووە.

٣- بەگەڕکەوتنی ئێزگە لەو ساڵەدا وەک هۆیەکی ڕاگەیاندنی یارمەتیدەر بە ڕۆژنامەگەری لە لای کورد، لە کۆتایی کانوونی دووەمی ئەو ساڵەدا ئێزگەی کوردی لە بەغدا کرایەوە، لە ساڵانی شەڕی دووەمی جیهانیش دا بەشێکی کوردی لە ئێزگەی ڕۆژهەڵاتی نزیک لە یافا کرایەوە، کە هاوپەیمانان بۆ بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە دژ بە دوژمنانیان دایانمەزراند بوو.

بە ڕای ئێمە ماوەی نێوان ساڵی ١٩٣٩ تا ساڵی ١٩٩١یش قۆناغێکی سەربەخۆ پێک دەهێنێت، کە گەلێ گۆڕان و پەرەسەندنی بەخۆوە بینیوەو بڕیوە، هەروەها گەلێ وێستگەی دیاری لە هەڵکشان و داکشان تێپەڕاندووە، لە ساڵی ١٩٩١ەوە قۆناغی سێیەم و تازەو لەوانی پێشتر تەواو جودا دەستی پێکردووەو تا ئەمڕۆش درێژەی هەیەو بەردەوامە.

سەبارەت بە قۆناغی بەرایی کە بە ساڵانی نێوان ١٩١٤ تا ١٩٣٩ دیاریمان

کردوه، دەکرێ تێبینیی سێ وێستگەی دیاری تێدا بکەین کە ئەمانەن لە:

١- ماوەی ١٩١٤ تا ١٩٢٤، واتە هەر لە دەرچوونی یەکەمین گۆڤاری کوردی لە سەردەمی عوسمانی دا و، پاشان ئەو ڕۆژنامانەی کە دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز دەریکردن تا دەگاتە ئەو ڕۆژنامانەی حوکمداریتی شێخ مەحمود دەریکردوون.

ئەم ماوەیە خەسڵەتی ناجێگیریی پێوە دیارە، بە ڕادەیەک یەکێ لەم ڕۆژنامانە لە کاتێ کە ئینگلیزەکان خەریکی ڕاوەدوونانی شۆڕشگێڕانی کورد بوون لە ئەشکەوتی دەڤەرێکی شاخاوی دەرچووە، ئەم سەردەمەمان کردە ناوەڕۆکی بەشی دووەمی باسەکە.

٢- (ژیانەوە) لە ساڵانی نێوان ١٩٢٤ و ١٩٢٦، ئەمەش سەردەمێکە لەگەڵ دووەم سەردەمدا تێکەڵ دەبێت.

(ژیانەوە) بەوە دەناسرێت کە ڕێ خۆشکەر بووە بۆ سەردەمی دوای خۆی، لەبەر ئەم دوو هۆیە بە سەردەمێکمان داناوە، یاخود وەک دووەمین وێستگەی چێوەی قۆناغی سەرەتاکان.

٣- دووەمین سەردەم، کە بێ لە (ژیانەوە)، بە دەرچوونی (ژیان) لە ١٩٢٦دا دەست پێ دەکات، بەر لەویش گۆڤاری (دیاری کوردستان) لە ساڵی ١٩٢٥دا دەرچووە.

ئەم سەردەمە بەوە دەناسرێتەوە کە دەکرێ ناوی بنێین جێگیربوونی دەرچوونی ڕۆژنامەی (ژیان)، کە سێزدە ساڵ بەردەوام بووە، دواتر ڕاوەستاوەو سەرلەنوێ بە ناوی (ژین)ەوە دەرچۆتەوە.

هەروەها بەوە دەناسرێتەوە کە گەلێ گۆڤاری تێدا دەرچووە، کە لە پتر لە شارێکدا دابەش دەکران، بۆ ئەوەی ئەو قۆرخەی شاری سلێمانی سەبارەت بەم هۆیە ڕۆشنبیرییە هەیبوو، ببەزێنێ، ئەم سەردەمە ساڵانی نێوان ١٩٢٤ و ١٩٣٩ دەگرێتەوەو کردوومانەتە ناوەڕۆکی بەشی سێیەم.

هەرچی بەشی یەکەمیشە وامان بە چاک زانی کە بۆ بەسەرکردنەوەی ڕەوشی

کۆمەڵگای کورد و گەلی کورد لە بوارەکانی ڕامیاری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووری، هەروەها دەسپێکی کوردو ڕۆژنامەگەریی تەرخان بکەین، ئەویش لەبەر چەند هۆیەکی بابەتیانەی پەیوەست بەو پەیوەندییە بەتینەی لە نێوان ڕۆژنامەگەری و کۆمەڵدا هەیە، هەروەها لەبەر چەند هۆیەکی تایبەت بە گەلی کورد، ئەو کارە پاشینەیەکی دروست و ڕەوانی ڕۆژنامەگەریی کوردی پێک دێنێ.

بە ڕای ئێمە ئەوەی کە پتر هەوڵەکەمانی بایەخدارتر کردووە، ئەوەیە کە بە زمانی عەرەبییە، بۆیە گەشتێکی هەمە لایەن و فراوان و چەند نموونەیەکی وەرگێڕدراو لەو ڕۆژنامەگەرییە و ئاراستەکانی دەخاتە بەردەم لێکۆڵەر و خوێنەرانی عەرەب.

لە پێناو گەیشتن بەو ئامانجە پشتمان بە ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان بەستووە کە لە ماوەی تایبەت بە لێکۆڵینەوەکەمان دەرچوون، هەروەها پشتمان بەو جۆرە کتێبانەش بەستووە کە باسی ڕۆژنامەگەریی کوردی و ئەوانەی کاریان تێدا کردووە، دەکات، هەروەک چۆن سوودم لە زۆر دیمانەی تایبەتیش بینیوە، کە لەگەڵ ژمارەیەک لە مێژوونووس و هزرەوەر و کەسایەتیی کورددا ساز دراون، وەک: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد و، سەلاح سەعدوڵلا و، (سینەم خان)ی هاوسەری، کە کچی جەلادەت بەدرخانی خودان چەندین ڕۆژنامە و گۆڤاری دەرەوەی عێراقەو، یەکێکە لە خانەوادەی بەدرخانیان کە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردییان هێناوەتە ئاراوە و، ڕۆڵێکی گەورەشیان لە زیندووکردنەوەی ڕۆحی نەتەوەیی لە لای سەرجەم گەلی کورد و هۆشیار کردنەوەیان بە گرنگیی ڕۆژنامەگەری هەبووە، بێ لە کەسانی دیکەی وەک بەڕێز ڕەفیق ساڵح کە یەکێکە لە ڕۆشنبیرانی سلێمانی و لە نێو یادەوەری خۆی و کتێبخانە تایبەتییەکەیدا، گەلێ شتی پێیە کە لەم باسەدا یارمەتیی لێکۆڵەرەوە دەدات.

بۆ نووسینی پەراوێزەکانیش سوودم لە ژمارەیەکی زۆر لە کتێب و گۆڤار وەرگرتووە کە لە چوارچێوەی ژێدەرەکانی باسەکەدا ناوم هێناون، بەڵام سوودی هەرە گەورەم لە کتێبی (اعلام الکرد)ی (میر بەسری) وەرگرتووە.

سەبارەت بەو ئاستەنگانەی لە نووسینەوەی باسەکەدا ڕووبەڕووم بوونەوە، لەو

باوەڕەدام هاریکاریی دۆستان و خاترجەم بوونم لە کتێبخانە تایبەتییەکانیان و پشتگیری کردنیان لێم بەو زانیاری و ڕۆژنامە و گۆڤارانەی کە لایان بوو یا لە یادو یادەوەریاندا مابوو، کارەکەمی فرە ئاسان کرد.

بەڵام زەحمەتییەکە لەو زمان و شێوازەدا بوو کە لە ڕۆژنامەگەریی ئەو ڕۆژگارەدا بەکار دەهات، لەو باوەڕەش دام کە ئەو زەحمەتییە ڕووبەڕووی ئەو لێکۆڵەرەوانەش دەبێتەوە، کە خۆیان لە قەرەی ڕۆژنامەگەریی عەرەبیی زمانی ئەوسای عێراق دەدەن. بۆیە لە وەرگێڕان دا تووشی سەر ئێشەی کردم، لە دواییشدا وام بڕیار دا، کە ئەو نووسینانە بە زمانێکی نائەدەبی و دوور لە زمانی دروستی ڕۆژنامەگەری وەربگێڕم، نەک وەک ئەوەی ئەمڕۆ لە ڕۆژنامەگەریدا بەکار دێت.

بەڵام مەسەلەکانی دیکەی وەک یەکخستنی زاراوەیەک یا ناوێک ئەوا بە ئەرکی خۆمم نەزانین، بەڵکو ئەوەی کە گرنگ بوو لە لام گەیاندنی زانیارییە پێویستەکانە، هەر بە نموونە سەبارەت بە ناوی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی دەسکاریی ناوە جیاجیاکانیم نەکردو وەک خۆیم لێگەڕا.

بەم جۆرە ناوی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان هەر بە ڕێنووسی کۆن و ڕێنووسی تازە و چەسپاو تۆمارو جێگیرم کردوون، فرسەتێکی زۆرتریشم داوەتە فۆرمی دووەمیان بە تایبەتیش لە نێو لیستی ناوەڕۆک یا سەرچاوە یا هەردوو خشتەی پاشکۆ.

بە گشتی - هەر وەک من بۆی دەچم- ئەم شتە وەک گرفتێک دەمێنێتەوە، چونکە ئەو ناوەی لەسەر ڕۆژنامەکەدایە بە پێی ڕێنووسی کۆن نووسراوە، بەڵام هەرچۆنێک بێت وێڕای ئەو جیاوازییەی لە فۆرمی نووسینەکەدا هەیە واتای دەلالەیەکی دیاری کراو و چەسپاو دەگەیەنێت.

بە هەرحاڵ ئامێرەکانی ئێستای کۆمپیوتەر بە تایبەتی ئەوانەی لێرەدا (مەبەستم بەغدایە) بەکار دێن، تا نەهۆ بەوە ڕانەهاتوون پیتی کوردی بەکار بهێنن، بۆیە بە کارێکی دروستم نەزانی کە دوای چاپ ئەو پیتانەی بخەمە سەر، بە ئومێدیشم هەموو لایەک لەمە حاڵی بووبێ.

لە کۆتاییشدا بە پێویستم زانی پێرستێک بە ناوی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییانە دابنێم، کە لە سالانی لێکۆڵینەوەکەمدا لە دەرەوەی عێراق دەرچوون، وەک قەناعەتێکی نووسەری لێکۆڵینەوەکە بەو پەیوەندییە بەتینەی لە نێوان تێکڕای ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا هەیە، بەوەی یەک ڕۆشنبیریی تاکە گەلێک پێک دەهێنن، هەروەها بەرگی چەند ڕۆژنامە و گۆڤارێکی ئەو ماوەیەشم داناوە، جگە لە دوو خشتەی تایبەت بە پوختەی ڕۆژنامەگەریی بەراییەکان، وەک پاشکۆیەکی تەواوکەری پێکهاتەی ئەو ڕۆژنامەگەرییەی کەوتۆتە بەر باس.

جارێکی دیکە سوپاسی مامۆستایانی بەڕێزم و گشت ئەوانەی یارمەتییان دام، دەکەم، هیوام وایە هەموو ئەو بەڕێزانەی لێکۆڵینەوە سادەکەم دەخوێننەوە، لە هەر کەموکوڕی و هەڵەیەکی دوور لە مەبەستم، ببوورن، کەماڵیش هەر بۆ خودایە، هەر ئەویش پشت و پەنایە، سوپاس و ستایشیش هەر شایەن بەوە.

# کۆمەڵگای کورد و
# پەیدابوونی ڕۆژنامەگەریی کوردی

## سەرەتا

مرۆڤ پێویستی بە ئیدراکێکی زۆر نییە، تا بزانێت کە دامەزراندن هەرگیز کارێکی ئاسان نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا لە هەموو شتێ زیاتر کارێکی پێویست و حەتمییە.

هاوکات پێویستە هەلومەرجی بابەتیانەی پێویست بۆ سەرکەوتنی پرۆسەی دامەزراندن سازا بێت.

سەبارەت بە سەرهەڵدانی ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا، مێژووی ساڵی ١٩١٤[١] بۆ لەدایکبوونی یەکەمین چاپکراوی ڕۆژنامەوانیی کوردی، کاتێکی درەنگ و لەدوایە، بەڵام ئاگادار بوون لە هەلومەرجی ناوچەی کوردنشین بێگومان زۆر لە هۆکارەکان ڕوون دەکاتەوە.

ئەو ماوەیەی لە نێوان هەردوو ساڵی ١٩١٤ و ١٩٣٩دایە، کە بە ماوەی دامەزراندن و سەرەتای پەیدابوونی ڕۆژنامەگەریی کوردیمان، لە عێراقدا داناوە، گەلێ گۆڕانکاری و ڕووداوی گەورەی بەسەردا هاتووە، کە ناوچەکەی هەژاندووە و، نەیهێشتووە ئارام بێت و بەرەو داهێنان و تازە بوونەوە بچێت.

دیارە لە پێشەوەی ڕووداوە گەورەکانیش، ئاڵوگۆڕ کردنی دەسەڵات لە عوسمانییەکانەوە بۆ هێزە داگیرکەرەکان دێت، دواتر ماندادتی بەریتانی و، ئینجا حکومەتی تازە پێکەوەنراوی نیشتمانی لە بەغدا دێت.

جا لەپێناو تێگەیشتنی ئەو هەلومەرجەی کە ڕۆژنامەگەریی کوردی لە

کوردستانی عێراق تێیدا لەدایک بووە، پێویستە لە هەموو لایەنەکانی ناوچەکە بکۆڵینەوە، چونکە ڕۆژنامەگەری[٢] هەروەک ئاشکرایە، ئاوێنەی بالآنومای چالاکییەکانی دیکەی کۆمەڵە و، بەرکێشەی سروشتیی گردبوونەوەی لایەنە سیاسی و ژیانییەکانی گەلە.

# کۆمەڵگای کوردەواری

## لایەنی سیاسی

کورد لە عێراقدا لە بەشی باکووردا بە چڕی هەن... بێ ئەوەی بچینە ناو گفتوگۆ کردنەوە دەربارەی ئەو ڕا جیاوازانەی سەبارەت بە سنووری ناوچە کوردنشینەکان لە ئارادان، کە دیدو بۆچوونە بەرامبەرەکان دەیورووژێنن، ئێمە لە دیاری کردنی ئەم شتە، تەواوی ناوچەی ویلایەتی مووسڵ لە سەردەمی عوسمانییەکان دەکەینە بابەتی باسەکەمان؛ وەک بناغەیەک بۆ دیاری کردنی جوگرافیای باسەکەمان پەیڕەوی دەکەین بە هۆی ئەوەی - لێکۆڵینەوەکەمان- دەکەوێتە سەردەمی عوسمانییەکان و، بەردەوام بوونی (کەسایەتیی) ویلایەتی مووسڵ تا یەکلاکردنەوەی کێشەکەی لە لایەن کۆمەڵەی گەلانەوە لە شازدەی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ز، کە بە ڕەسمی خرایە سەر عێراق.

مینۆرسکی [٣] دەڵێت: **(بە شێوەیەکی سەرەکی کورد لە ویلایەتی مووسڵدا نیشتەجێن، ئەویش ناوچەیەکی بە تەواوەتی کوردنشینە)** [٤].

ویلایەتەکەش لە سێ سنجاق پێک هاتبوو، ئەوانیش:

١- سنجاقی ناوەند- واتە مووسڵ- ئەم قەزایانەی دەگرتەوە: دهۆک، زاخۆ، شنگار و ئاکرێ.

٢- سنجاقی کەرکووک، ئەم قەزایانەشی بە سەرەوە بوو: هەولێر، ڕانیە، ڕواندوز، کۆیەو کفری.

٣- سنجاقی سلێمانی، ئەم قەزایانەی دەگرتەوە: بارزان [*]، هەڵەبجە، شارەزوور و مەرگە [٥].

به هۆی ئەوەی ویلایەتی مووسڵ بەشێک بووە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و بە هۆی سروشتی کوردانەیەوە، چەندین پەیوەندیی هەبووە بە ویلایەتە کوردییەکانی دیکەی نێو ئیمپراتۆریەتەکە، هەروەها کەمتریش لەگەڵ ناوچە کوردنشینەکانی ئێراندا[٦].

دواتر لەگەڵ هەردوو ویلایەتی بەغدا و بەسرا، مەملەکەتی عێراقیان لێ پێکهات، فەیسەڵ بن ئەلحوسەین-یش بووە مەلیکی ئەم مەملەکەتە.

بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکە ئاسان و ورد بێت، لە رووی جوگرافییەوە هەر دەبێ باسی رەوشی تێکڕای عێراق بکەین، هەر کاتێ کە پێویست بوو باسی تێکڕای ناوچە کوردنشینەکان دەکەین، بەتایبەتی ئەوانەی لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوون.

ئەمە لە ڕووی جوگرافییەوە، بەڵام لە ڕووی زەمانەوە، باس کردنی ڕەوشی ئەو ناوچە جوگرافیاییانە لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، (١٩١٤- ١٩٣٩ز)، بەبێ گەڕانەوە بەرەو دوا، تەواوکار نابێت، بە تایبەتیش بەرەو کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیست، بۆ ئەوەی لەوێوە دەست پێبکەین و بە شێوەیەکی چاکتر لەوەی لەمەو دوا ڕووی داوە، بگەین.

دیارە بە هۆی ئەوەی ناوچەی کوردنشین- کە پێی دەگوترێت کوردستان- ناوچەیەکی گرنگ بووە، بەردەوام ڕووبەڕووی کێشە و ململانێ و شاڵاو بووەتەوە، بەوەی **(بایەخێکی گەورەی جوگرافی و ئابووری هەبووە، یەکێکە لە ئەڵقەکانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا)**[٨]، چونکە **(هەڵکەوتی ستراتیژیی کوردستان لە ناوجەرگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، هێزێکی گرنگی دیکەی بزوێنەری سیاسەتی ئەو دەوڵەتانە (ڕۆژئاواییەکان - لێکۆڵیار) بوو بەرامبەر بە دواڕۆژی کوردستان)**[٩].

**(لە ماوەی نێوانساڵی ١٥١٤ز و نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا چەند میرنشینێکی (کوردیی نا یەکگرتوو- لێکۆڵیار) دامەزراون، کە هەر کامێکیان لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا سەربەخۆ بوون)**[١٠].

بەڵام **(سەرلەنوێ داگیرکردنەوەیان «لە ساڵی ١٨٣٤ز و دواتر- لێکۆڵیار» بووە**

**هۆی ئەوەی کوردەکان لە ساڵانی ١٨٤٣ز- ١٨٤٦ز بە سەرکردایەتی بەدرخان پاشا بۆ یەکەمین جار بزاڤێکی نەتەوەیی دەست پێ بکەن)**[١١].

دەسەڵاتی عوسمانییەکان نەگەیشتە ئەوەی **(بەسەر ئەو ڕاپەڕینانەدا زاڵ بێت، تا لە ساڵی ١٨٤٨ز هەراو پەشێوی و نائارامی دووبارە بووەوە)** [١٢].

ئەم حاڵەش لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی دی درێژەی کێشا **(تورکەکان لەو ململانێیە سەختەدا، جار ناجارێک سووکە سەرکەوتنێکیان بەدەست دەهێنا، بەڵام دەسەڵاتیان لە کوردستاندا هەر بەناو بوو)**[١٣].

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە گیانەڵڵادا بوو، دەوڵەتانی ئیستیعماری، چاویان بڕیبووە دابەشکردنی میراتی (بابی عالی)، **(دەستپێکی سەدەی بیستەم ململانێیەکی توند لە نێوان رووس و بەریتانیا و فەرەنساییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پەیدا بوو، بە هاتنە مەیدانی ئەڵمانەکانیش وەک رکابەرو هێزێکی نوێ، ململانێکە دژوارتر بوو. ئەم ململانێیە کوردستانیشی گرتەوە، کە بووە پێگەی بەیەک گەیشتنی جۆرەها سیخوڕی وڵاتانی ئیستیعماری، هەر لە دیپلۆماتکارانەوە بیگرە تا دەگاتە مژدەبەران«**»**[١٤]).

زانای هاوچەرخی سۆڤیەت بۆریس دانتسیگ [١٥] نزیکەی سەد گەشتی تۆمار کردووە، کە تەنها هاووڵاتە رووسەکانی لە ماوەی سەدەی دوازدەهەمەوە تا سەرەتای یەکەمین جەنگی جیهانی سەردانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان کردووە، نزیکەی نیوەی ئەم گەشتانە لە سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا کراون، بە رادەیەک چالاکییەکانیان وای لە زۆر لە پێشەوا کوردە چەوساوەکانی دەوڵەتی عوسمانی، وەکو عەبدولڕەزاق بەدرخان [١٦]، کردبوو باوەڕ بێنن کە **(بە یارمەتیی رووس دەتوانن کوردستانی سەربەخۆ دابمەزرێنن)**[١٧].

**«جگە لە بەریتانیاو ئەڵمانیاو رووسیا، فەرەنساو ئەمریکاش هەر یەکەیان سیاسەتیان بەرامبەر دوارۆژی دەوڵەتی عوسمانی و بەرژەوەندییەکانی خۆیان بایەخیان بە کوردستان دابوو، ناردنی ئەدمیرال چێستەر یەکێکە لە بەڵگەکانی ئەو بایەخ پێدانە لە لایەن ئەمریکییەکانەوە»**[١٨]، بێ لە چەندین مژدەهێنی ئەمریکی

کە ساڵانێکی زۆر بوو بە گەرمی لە کوردستان لەگەڕدا بوون و جموجۆڵ و هاتووچۆیان گەلێ دەڤەری کوردنشینی گرتبۆوە، پەیوەندییان لەگەڵ کەمینەکاندا لەوانە ئاسوورییەکان دامەزراند بوو، کە هەندێکیان بوونە پرۆتستانت و بە دەست لە پشت دانی ئەمریکییەکان وازیان لە کڵیسەی کاتولیکی هێنا.

**(سوپاکانی بەریتانیا لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا عێراقیان داگیر کردو، لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ تورکەکان و نوێنەرێکی هاوپەیمانان ئاگربەسی مەندروسیان ئیمزا کرد) و (زۆربەی ویلایەتی مووسڵ لە کاتی ئیمزاکردنی ئاگربەسەکە هێشتا داگیر نەکرابوو، هەرچەندە ڕۆژی ٢٥ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨، هێزەکانی بەریتانیا، کەرکووکیان داگیرکردو کاتێ بەریتانییەکان دوای تورکەکان کەوتبوون، کە بەرەو زێی گچکە پاشەکشەیان دەکرد، گوێبیستی ئاگربەست بوون، بەڵام ئینگلیزەکان دواتر هەولێر و بەشەکانی دیکەی ویلایەتی مووسڵیان داگیر کرد)**[١٩].

لەو میانەشدا شێخ مەحمودی نەمر [٢٠]، کە پێش ماوەیەکی کەم تورکەکان وەک بەرپرسی دەڤەرەکە دەست نیشانیان کردبوو، چەندین جار پەیوەندیی بە ئینگلیزەکانەوە کرد، بە مەبەستی ئەوەی بەڵێنی ئەوەی بدەنێ لەژێر چاودێریی ئەوان و بە سەرۆکایەتی خۆی **(حکومەتێکی کوردی لە ناوچەی سلێمانی)** دابمەزرێنێت.

بۆیە (مەیجەر نۆئێل)ی ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە کۆبوونەوەیەکی گشتیدا لە یەکەم ڕۆژی تشرینی دووەمی ١٩١٨ و لەبەر دەرکی سەرا و بە ئامادەبوونی **(علماو ئەشراف و سادات و ئامرەکان و رەئیسەکانی عەشایرو لە هەموو دەستەکانی تری ئەهالی تیا بوو)** بە ناوی نوێنەری دەوڵەتی بەریتانیا لە عیراق (واتە بە ناوی حاکمی عام)و بە فارسی وتارێکی دوورو درێژی خوێندەوە، هەر لەم وتارەدا بڵاوی کردەوە کە **«شێخ مەحموود، لە لایەن حاکمی عامی عیراقەوە بە (حوکمداری کوردستان) ناسراوە»**[٢١]، بەڵام شێخی نەمر کەوتە ناکۆکی لەگەڵ (مەیجەر سۆن)ی تازە ئەفسەری سیاسی لەگەڵ هاتنی مانگی مارتی ١٩١٩، مەیجەر سۆن ناچار بوو بەرەو کەرکووک هەڵبێت[٢٢]، پاش ئەوەی ئینگلیزەکانی ناو شار

دەستگیر کران، ئەوەندەی نەبرد هێزەکانی بەریتانیا دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی خۆیان بەسەر سلێمانیدا سەپاندەوە، دوای ئەوەی لە شەڕی دەربەندی بازیان لە ١٩١٩/٦/٩ بە بریندار شێخیان بەدیل گرت و دواتر بۆ هیندستان دووریان خستەوە، بەڵام پەشێوییەکی زۆر سلێمانی و ناوچە کوردنشینەکانی دیکەی گرتەوە، کە دەسەڵاتی بەریتانیی ناچار کرد شێخ مەحمود بهێنێتەوە سلێمانی و لە ئەیلوولی ١٩٢٢ سەر لەنوێ بە (حوکمدار) دایانمەزراندەوە، کە ڕاستەوخۆ کەوتە ژێر دەسەڵاتی (المندوب السامی)ی بەریتانیا، نەک دەسەڵاتی حکومەتی تازەی عێراق، کە لە بیست و پێنجی مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ [٢٣] لە بەغدا دامەزرا، بەڵام **(ئەوەندەی پێنەچوو بە ڕووی حکومەتی عێراقدا ڕاپەڕی «لە ڕاستی دا بە ڕووی دەسەڵاتی بەریتانی دا - لێکۆڵیار» و لە تشرینی دووەمی ١٩٢٢ خۆی بە مەلیکی کوردستان دانا)**[٢٤].

بۆیە **(فڕۆکەکانی ئینگلیز لە سەرەتای ئاداری ١٩٢٣ بۆمبابارانی سلێمانییان کرد، شێخ و هێزەکانی لە شار چوویوونە دەرەوە، دواتر لە کۆتایی تەمووزی هەمان ساڵدا گەڕانەوە نێو شار تا ١٩ی تەمووزی ١٩٢٤ کاتێک جارێکی دی هێزەکانی ئینگلیز و «هێزەکانی عێراق- لێکۆڵیار» چوونەوە ناوی)** [٢٥].

لە شەشی ئەیلوولی ١٩٣٠ لە ئاکامی بەستنی پەیماننامەی عێراقی- ئینگلیزیدا لە حوزەیرانی ١٩٣٠، جموجۆڵی تازە لە سلێمانی سەری هەڵدایەوە، کە بەندی تایبەت بە دۆزی کوردی تێدا نەبوو، ڕووبەڕوو بوونەوەی خوێناویی لێ کەوتەوە و شێخ مەحمود سوودی لێ وەرگرت و دووبارە دەستی بە شەڕ کردەوە، داوای **(کوردستانێکی یەکگرتووی دەکرد هەر لە زاخۆوە تا خانەقین لە ژێر مانداتی بەریتانی)**[٢٦]. بە درێژایی زستانی ١٩٣٠ و سەرەتای ١٩٣١ تا ئاداری ١٩٣١ شەڕ بەردەوام بوو، نزیک بە دووزخورماتوو لە شەڕی گوندی ئاوباریک دا شکا، بۆ ئەوەی پەردە بەسەر سەردەمێکی مێژوویی گەلی کورددا بدرێت، کە بە ڕوونی و ڕەوانی جێ پەنجەی خۆی بەسەر ڕۆژنامەگەریی کوردییەوە جێ هێشت، وەک لە میانی لێکۆڵینەوە لە خودی ڕۆژنامەکانەوە، لە بەشەکانی داهاتوودا بۆمان روون دەبێتەوە.

هەرچی ناوچەکانی دیکەی کوردستانی عێراقە، بە هەمان شێوە شۆڕش و ڕاپەڕینی چەکدارانەیان لە ساڵی ١٩١٩دا، بە تایبەتی ناوچەکانی ئامێدی و زاخۆ و ئاکرێ، تێدا بەرپابوو.

**(لە ساڵی ١٩٣٢دا لە چیاکانی بارزان لە بەشی شیمالی کوردستانی عێراقدا ڕاپەڕینێکی دی، بە سەرکردایەتی شێخ ئەحمەد تەقییەوە، کە برا بچووکی شێخ ئەحمەد، مستەفا بارزانی، لەو ڕاپەڕینەدا بۆ یەکەم جار نەخشێکی گرنگی یاری کرد)** [٢٧].

هەر هەموو ئەو ڕووداوانە شوێنەوارێکی قووڵیان لە لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووریی کۆمەڵگایەکدا جێ هێشت، کە هەرگیز نەگەییوەتە ڕەوشێکی ئارام.

## لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابووری

**(پاش نەمانی حوکمی عوسمانییەکان، ڕێک دوای یەکەمین جەنگی جیهان، کە بە ڕاستی وەک خاڵێکی زەبەلاحی وەرچەرخان دادەندرێت، ئاسۆگەلێکی نوێ بە رووی عێراقییەکاندا کرایەوە، کە پێشتر لە مەزەندەیاندا نەبوو و هیچیان لێ نەدەزانی، چونکە دابڕا بوون)** [٢٨].

هەرچی کوردیش بوو **(بەسەر خێڵی کۆچەر و شارستانیدا دابەش ببوون و بە تێکەڵی لەگەڵ یەکدی دا دەژیان، خێڵە ڕەوەندەکانیش زۆربەیان لە باکووری مێزۆپۆتامیا دەژیان... ئەوەی شایانی ئاوڕلێدانەوەیە ژمارەیەکی زۆر لەو خێڵانە بەرەو ژیانێکی نیمچە شارستانی گۆڕان)** [٢٩].

«دەبەلیو. ئار. هی» حاکمی سیاسیی هەولێر لە سەردەمی داگیرکاریی بەریتانیا وەسفی کورد دەکات کە گەلێکی شوانکارەیە و **(ئامادەیە نیشتەجێ بێت، هەر کاتێکی کە یەکێکیان وای بە باش بزانێت)** [٣٠].

مۆرکی یەکلاکەرەوەی کۆمەڵگای کوردەواری، گوندنشینیی کشتوکاڵ و شوانکارەیی بووە، **(دەکرێ بڵێین مۆرکی عەشایەر و دەرەبەگیانەی کۆمەڵگای**

**گوندی کوردی عێراقی لە ڕۆژگاری یەکەمین جەنگی جیهانیدا بەشێک بوو لە مۆرکی گشتیی سەراپای کۆمەڵگای عێراق. سروشتی شاخاویی وڵاتی کوردان و دوورە پەرێزی و سەختی و کەمیی هۆیەکانی نوێی گەیاندن لە نێوان ناوچەکانیان، لە پێشەوەی ئەو هۆکارانە بوون کە ناوچەی کوردنشینی بە پاشکەوتووتر هێشتەوە)**[٣١]، بەوەی **(لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا خێڵە ڕەوەندەکان سێیەکێکی دانیشتووانی کوردستان بوون)**[٣٢].

**(لە کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەدەی بیستەمدا، نیشتەجێ بوونی عەشیرەتە کۆچەرەکان و دروست کردنی گوندەکان بە چەشنێکی کتوپڕ پەرەی سەند)**[٣٣].

لە ساڵی ١٩٢٥دا یەکێ لە لیژنەکانی کۆمەڵەی گەلان کە بۆ کوردستان ناردرا بوو لە راپۆرتی خۆیدا گوتوویەتی **(ئێستا زۆربەی نێزیک بە تەواوی کوردەکان نیشتەجێ بوون و بەشێکی کەم نەبێ لەسەر سنووری نێوان عێراق و ئێران، کۆچەری نەماوە، بۆیە ئێستا بە هیچ جۆر ناکرێ کوردەکان بە نیوە کۆچەریش دابنێین)**[٣٤]، لەوەوە دەردەکەوێ کە بۆچی لە سەروبەندی دەست پێکردنی یەکەمین جەنگی جیهانی لەسەر سنووری عێراق- ئێران تەنیا چەند خێڵێکی کەمی ڕەوەند مابوون.

**(پاش دابەشکردنی دوایی کوردستان و داخرانی سنوور، بە تایبەتی لە نێوان تورکیا و ئێراندا، عەشیرەتەکان ڕێگای گەرمیان و کوێستانیان لێ گیرا)**[٣٥].

ڕاپۆرتێکی ئیداریی ناوچەی لیوای سلێمانی کە لە ساڵی ١٩١٩دا دەرچووە **(ژمارەی خەڵکی کۆچەری بە (٤٠) هەزار کەس داناوە، لە ساڵی ١٩٣٠ واتە دە ساڵ دواتر، داوسون**[٣٦] **خەڵکی ڕەوەندی لە لیواکەدا تەنها بە (١٥) هەزار کەس خەملاندووە)**[٣٧].

هەرچی خێڵە نیشتەجێکانیشە بە کشتوکاڵەوە خەریکن و لە گوندەکاندا دانیشتوون، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ ژمارەی دانیشتوانی گوندنشین گەیوەتە (١٨٤٥٤٥) کەس، تێکڕای ژمارەی دانیشتوانی لیوای سلێمانی ئەو کاتە (٢٢٦٤٠٠) کەس[٣٨] بووە، کەچی لە سەرژمێری ١٩٦٥دا ژمارەیان گەیشتە نزیکەی (٢٧٦٩٧٢) کەس لە تێکڕای ژمارەی دانیشتوانی لیواکە، کە ژمارەیان

(٤٠٨٢٢٠) کەس بوو، ڕێژەشیان ٦٨٪ بوو [٣٩].

هەرچی شارەکانی لیواکەش بوو، کە سلێمانی و هەڵەبجە و قەڵادزێ بوون، (٤١١٦٤) کەس لە دانیشتوانی شارنشینیان گرتبووە خۆ، ئەوە بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧، سەرباری (٩٧٠٢) کەسی دی لە مەڵبەندە نیمچە شارییەکاندا [٤٠].

خۆ گەر بگەڕێینەوە بەرەو ژمارەی دانیشتوان لە ساڵانی بیستەکاندا، ژمارە هەرە نزیکەکان لە واقیع بریتین لە **(ژمارەکانی لیژنەی ساڵی ١٩٢٤ی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ بڕیاردانی دوارۆژی ویلایەتی مووسڵ کە لە چاو ئەوانی دیکەدا، کۆمەڵێک ژمارەی دەرەنجامی لێکۆڵینەوەو بەراوردو ساغ کردنەوە، ئەوا ژمارەی دانیشتوانی ئەوسای لیوای سلێمانی گەیشتۆتە نزیکەی (١٩٢) هەزار کەس، بەڵام دانیشتوانی شارەکە خۆی، لە هەمان ساڵدا ڕاپۆرتەکانی ئینگلیز بە بیست هەزار کەسیان مەزەندە کردوە، ئەم ژمارەیەی دواییش بریتیە لە دوو هێندەی مەزەندەکاریی ساڵی ١٨٢٠و نزیکەی نیوەی دانیشتوانی شار لە کاتی هەڵگیرسانی دووەمین جەنگی جیهانی دا)** [٤١].

ئەگەر ئەوەمان قبووڵ بێت کە ژیان لە سەرانسەری عێراق، گەر بە شێوەیەکی ڕێژەییش بێت، چوون یەکە، ئەو وەسفەی د. غەسان ئەلعەتییە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیی بەر لە یەکەمین جەنگی جیهانی، وا پێدەچێ ڕاست بێت، بە تایبەتی لەگەڵ ئەوەدا وای بۆ بچین کە بە **(گەیشتنی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی بە دەسەڵات لە ئەستەمبوڵ «١٩٠٨- لێکۆڵیار» گۆڕانێکی بنەڕەتی لە ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتیی عێراق ڕووی نەدا)** [٤٢].

بەم جۆرە شارەکان **(لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە دابەش دەبوونە سەر چینێکی باڵای موڵکدار و بازرگان، لە خوار ئەوانەوە خاوەن پیشە بچووکەکان و پیشەسازکاران، دواتر خەڵکی هەژاری خێڵەکانی دەوروبەر دەهاتن)**. داب و نەریتەکانی خێزان و عەشیرەتگەری هێشتا زۆر بەهێز بوون، چونکە زۆربەی دانیشتوان بە ڕەسەن خێڵەکی بوون، هەرچی پەیوەندیی نێوان خەڵکی شار و ئەو خێڵانەی دەوروبەر بوو، پەیوەندییەکی گومان لەیەک کردن بوو **(ڕۆڵەی خێڵەکان ڕقیان لە فەرمانبەرانی**

**ئیداریی نێو شار دەبووەوە، کە کاریان تەنیا بەدەست هێنانی هەرچی زۆرتری داهات بوو لە خێڵەکان، لە کاتێکدا فەرمانبەرانیش بەو چاوە سەیری ڕۆڵەی خێڵەکانیان دەکرد، کە وەحشین و پێویستە کەوی بکرێن)** (٤٣).

**(لەنێو دانیشتوانی شاری سلێمانیدا - هەر هەموو کوردی موسڵمان نەبوون- (١٥٥٠) جوولەکە هەبوون لە گەڕەکێکی تایبەت بە خۆیان، هەروەها (١٠٠) مەسیحی لە کلدان و ئەرمەن هەبوون ئەوانیش لە گەڕەکێکی تایبەت بە خۆیان دا بوون، جگە (٧٥) کەس لە عەرەب، بە گوێرەی مەزەندەی سەرەتای بیستەکان)** (٤٤).

شارەکەش سیمایەکی تەواو کشتوکاڵیانەی هەبوو، کە بە درێژایی ڕۆژگار و لەگەڵ داگیرکاریی ئینگلیزەکان دا پەرەی سەند، هەروەها بە چەسپاندنی دەسەڵاتی ناوەندیی حکومەتی بەغداش، **(زۆر لە خەڵکی شار بزن و مەڕ و مانگا و مریشکیان لە نێو ماڵاندا بەخێو دەکرد، گەڕانەوەی مێگەل و ڕانەکان لە لەوەڕگاکانی دەوروپشتەوە بۆ نێو شار، دیمەنێکی باو و ئاسایی ساڵانی بیست بوو)** (٤٥).

بە هۆی ئەوەی زۆربەی دانیشتوانی لیواکەو بگرە شارەکەش خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوون، بۆیە **(ئەم هەڵکەوتە زۆر بە زەقی لە شێوەی شارو خێرایی پەرەسەندنی لە قۆناغی نێوان هەردوو جەنگدا، ڕەنگی دایەوە، بازاڕ و بازرگانی و بەرهەمی پیشەیی متمانەی دەکردە سەر دێهاتی لیواکە)** (٤٦).

لە کاتێکدا ژمارەی ئەو خانانەی بۆ خزمەتی جوتیاران و وەڵاخی بەرزەیان لە نێو شاردا تەرخان کرابوو لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگدا گەییە بیست خان. یەکەمین ئوتێل لە شاردا لە کۆتایی بیستەکاندا دروست کرا، بێ لە خانەکان **(دەیان شوێن و دوکانی شار خەریکی دروست کردنی کورتان و زین بوون بۆ باربەری گوندنشینان و خزمەتی دیکەی پێشکەش دەکردن، هەروەها ژیانی زۆربەی بازرگانانی شار و شوێنە گشتی و پیشەییەکان و دەرامەتیان بە شێوەیەکی بنەڕەتی متمانەی دەکردە سەر لادێ، تەنانەت ماڵەکانی ناو شارو شوێنە گشتی و پیشەییەکانی، بۆ سووتەمەنیی**

**خۆراک و کارو خۆ گەرم کردنەوە، پشتیان بەو خەڵووزە دەبەست کە لە دار دروست دەکرا و ئەو دارەی کە لە ناوچە شاخاوییە نزیکەکانەوە ڕۆژانە بۆی دەهات)**[٤٧].

**(دیارترین بازرگانانی شار و دەوڵەمەندترین کەسیان بە شێوەیەکی سەرەکی متمانەیان دەکردە سەر بازرگانیی تووتن)** [٤٨].

هەروەها **(بە پلەی یەکەم دراوی بەکارهاتوو لە گوندەکاندا، کە نرخی دانەوێڵە و خێرو بێری پێ دیاری دەکرا و کڕین و فرۆشتنی پێ دەکرا، هەر لیرەی تورکی بوو، ئەمە بەر لە جەنگ بەرامبەر بە نزیکەی (پاون)ێک بوو، هەروەها ڕێژەی ئەو زێڕەی ئاڵووێری پێ دەکرا زۆر گەورە بوو. وا باوبوو حکومەتی بەریتانیا، بە غەیری ڕوپیە ڕازی نەبوو داهات وەربگرێت، بۆیە بووە دراوی بەکار هاتووی نێو شاران)**[٤٩].

**(بە شێوەیەکی ڕێژەیی خزمەتگوزاریی گشتی لە سلێمانی پاش جەنگی یەکەمی جیهان، کە زۆر ئازاری ئەو شارەی دابوو، بەرەو پاش دەچوو، دیاردە هاوچەرخەکان بەرە بەرەو بە هێواشی و بێ پسانەوە بەرەو شار هاتن)**و، بە هۆی شوێنی بەرزبییەوە، سلێمانی تەنیا شارێکی عێراق بوو کە لە ساڵی ١٩٢٦دا ئاوەڕۆکانی داپۆشرابوون، یەکەمین پرۆژەی هاوچەرخی ئاوەڕۆش لە ساڵی ١٩٢٩ لە شارەکەدا دامەزرا، یەکەمین وێستگەی بەرهەمهێنانی کارەباش لە ساڵی ١٩٣٠ بوو.

لە ساڵی ١٩٣٨دا یەکەمین جادەی قیرتاوی تێدا کرایەوە، بەر لە بەرپابوونی دووەمین جەنگی جیهان هەر یەک یانە لە شارەکەدا هەبوو، لە بەرامبەردا دەیان چایخانەی گەورە و بچووک هەبوون لەوانە دوانیان تایبەت بە جووەکان بوون لە گەڕەکەکەیاندا (جوولەکان). لە ساڵی ١٩٢٥ یەکەمین شوێنی بە ئاشکرا فرۆشتنی مەی و شەراب کرایەوە، کە ژمارەیان دەگاتە دە شوێن بەر لە جەنگی (دووەم- لێکۆڵیار). یەکەمین کامێرای فۆتۆگراف و یەکەمین چاپخانەو یەکەمین ئوتومبێل و یەکەمین ئامێری تەلەفۆن لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان پاش کۆتایی هاتنی یەکەمین جەنگی جیهان هاتنە سلێمانییەوە.

هاتنی ئوتومبێل و بە فراوانی بەکارهێنانی، کاری ڕاستەوخۆی کردە سەر باری ئابووری و کۆمەڵایەتیی شار، بە نموونە لە ساڵی ١٩٢٦دا (***) ئوتومبێلەکان

(٣٠٠) جار له نێوان سلێمانی و کەرکووک دا، کە ڕێگای ڕووەو بەغدایە، هاتوچۆیان کردووە. لە ساڵی ١٩٢٤ ژمارەکە بۆ (١٣٤٣) بەرز بوەتەوە و دواتر لە ساڵی ١٩٢٨ بووە بە (٢٤١٤)[٥٠].

پەیدابوونی ڕۆژنامەگەری، ئەویش یەکێک بوو لەو تازە گۆڕانکارییانەی وەک ڕووداوێکی دیار و بزووێنەری لایەنەکانی داهێنان و ئەفراندن لە ژیانی تازەدا. سەبارەت بە گواستنەوە، عێراق لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا یەکەمین فەرمانگەی پۆستەی تێدا کرایەوە. **(لە ١٨٦٨ز-دا فەرمانگەیەکی پۆستەی بەریتانی- هیندی لە بەغدا و بەسرا کرایەوە)**[٥١]، پاشان **(فەرمانگەی جیاجیای پۆستەی تورکی پێ بە پێ کرانەوە، دەزگایەکی ناتەواو هاتە کایەوە، هەرچەندە جێی متمانە نەبوو و بە چەوتییش بەکار دەهێندرا، وێڕای ئەوە، بە شێوەیەکی گشتی، فریای پێداویستییە کەمەکانی عێراق دەکەوت. دواتر هێڵی تەلگراف گەیەندرایە گشت شارۆچکە گەورەکان، لەم بارەیەوە عێراق بووە ناوچەیەکی کراوە بەرەو ڕووی جیهان**[٥٢] **،کە هەرچەندە نە متمانەی تەواو هاتە ئاراوە و نە ونبوونی نهێنییەکانیش کەم بوونەوە)**[٥٣].

هەرچەندە وەک لۆنگریک دەڵێت: **(هاتووچۆی زەمینی لە ئاستێکی پێشکەوتوودا بوو)**[٥٤]، بەڵام د. شاکر خەسباک پاش نزیکەی یەک سەدە دەربارەی ڕێگاوبانەکانی باکووری عێراق دەڵێت: **(زۆربەی ئەو ڕێگایانە خۆڵاوین، بەو واتایەی مەحاڵە لە کاتی وشکاییدا نەبێت، مرۆڤ بتوانێ پێیاندا گوزەر کات، چونکە دەبنە قوڕ و لیتەیەکی ئەوتۆ، کە ئەستەمە مرۆڤ بتوانێ لە کاتی باران و بەفر بارین دا پێیاندا تێبپەڕێ)**[٥٥]، **(هەرچی بەشی باکووری عێراقە لە هێڵی شەمەندەفەر، بە بەراورد لەگەڵ ڕووبەرەکەی، زۆر کەمە)**[٥٦].

بۆ ئەوەی وێنەیەکی چاک سەبارەت بە کۆمەڵگای کوردەواریی سەرەتای ئەم سەدەیە و ساڵانی دواتر بەدەستەوە بدەین، دەبێ ڕەوشی ئافرەت لەو کۆمەڵگایەدا بزانین چۆنە **(ئافرەت بێ هیچ گومانێک لە لای کورد کەسایەتییەکی هەیە)**[٥٧] و **(ئافرەتان بێ پەچەن، بەو پەڕی ئازایەتی بێ شەرم کردن لە نێو مەجلیسدا**

**دادەنیشتن، زۆر جاریش لە گفتوگۆ کردندا بەشداریی پیاوان دەکەن)**[٥٨]، لەوانەیە لە جێی خۆیدا بێت، کە هەر هەموویان، لەوانە مینۆرسکی و مەیجەر سۆن، لەوەدا کۆکن، و تەبان کە عادیلە خانم سالآنێکی زۆر بە کردار سەرکردەی (ئەمە گوزارەی مینۆرسکییە) دەڤەری هەڵەبجەی (نزیک بە سلێمانی) بوو. مینۆرسکی لەبارەیەوە نووسیویەتی (کە لە ساڵی ١٩١٤ دیویەتی)، هەروەها مەیجەر سۆن و کەسانی دیش بە سەرسوڕمانەوە لەسەریان نووسیوە.

هەر بەم شێوەیە مینۆرسکی دەگێڕێتەوە، کاتێک تورکەکان بە تەواوی دەستیان بەسەر هەکاریدا گرت، ئافرەت حوکمی ئەو ناوەی دەکرد.

هەرچی (هی)یە، ئەویش دەڵێ **(جاری وا هەیە ئافرەتێک دەبێتە کوێخاو دەمڕاستی گوندێک یا پێشەوای هۆزەکەی)**[٥٩]و **(کوردەکان لە زۆربەی گەلانی دیکەی موسڵمان بەڕێزتر هەڵسوکەوت لەگەڵ ژنەکانیان دەکەن.**

**ئافرەتان ئازادانە بۆ هەر هەموو شوێنێک دەچن، ڕێک هەر وەکو پیاوان)**[٦٠].

لەوانەیە هۆیەکە بۆ ئاستی بەرزی هۆشیاریی شارستانی و ئالوودە بوونی کورد بە ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی لە نێو کۆمەڵدا بگەڕێتەوە، هەرچەندە ئاستی فێرکردن لە نێویاندا نزمە و دامودزەگای کەمی فێرکردنیشیان هەیە.

## لایەنی ڕۆشنبیری

### أ- فێرکردن

یەکەمین پرۆسەی ڕێکوپێکی ئامارێکی خەملێندراو بۆ دانیشتوانی عێراق لە ساڵی ١٩٢٧دا بەڕێوەچوو، وای پیشان دەدا کە ئەوکات ژمارەی دانیشتوانی عێراق دوو ملیۆن و (٩٦٨) هەزار و (٥٤) کەسە، لەوان ملیۆنێک و (٦٨٨) هەزار و (٢٣٩) کەسی نێر و، ملیۆنێک و (٦٩٢) هەزار و (٢٩٤) (*****) کەسی مێ[٦١].

هەرچی ژمارەی دانیشتوانی ویلایەتی مووسڵە لەو ماوەیەدا، ڕاپۆرتەکانی بەریتانیا کە لە ساڵی ١٩٢٥ پێشکەش بە لیژنەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە

لێکۆڵینەوە لە چارەنووسی ویلایەتی مووسڵ کراون، دەڵێن ژمارەیان (٧٨٥.٤٦٨) کەس بووە (لەوانە ٤٢٤.٧٢٠یان کوردو، ١٨٥ ،٧٦٣ کەسیان عەرەب و، ٦٥.٨٩٥یان تورک و «لە ڕاستی دا تورکمان- لێکۆڵیار»، ٦٢.٢٢٥یان مەسیحی و، ١٦.٨٦٥یان جوولەکە و، ٣٠.٠٠٠ ئێزدی «ئەوانیش هەر کوردن- لێکۆڵیار» بوون[٦٢].

گەر ڕایەکەی د. قاسملو لە بارەی فێرکردنی ئافرەتان لە کوردستان پەسند بکەین، کە **(لە شاردا ٩٥٪یان نەخوێندەوارن، لە گوندیشدا ئەوە هەر هەموویان نەخوێندەوارن)**[٦٣]. هەروەها گەر ئەوەی ڕۆژنامەی (الرقیب)ی بەغدایی نووسیویەتی ڕاست بێت، کە **(باری ئافرەت لە شاری بەغدا بە جۆرێکە، قەڵەم شەرم دەکات بینوسێتەوە، چونکە لە هەر دە هەزاریان یەکێک نادۆزییەوە خوێندەواری هەبێت)**[٦٤]. بۆیە کاتێک باسی ڕەوشی ڕۆشنبیریی کوردستانی عێراق دەکەین، پێمان خۆش بێت یا ناخۆش، قسەکانمان تەنیا نیوەی کۆمەڵ، کە پیاوانە دەگرێتەوە.

جا گەر بزانین شارنشینانی ویلایەتی مووسڵ ٢٥٪ی ژمارەی دانیشتوانیان پێک دەهێنا، بەپێی ئامارێکی دی کە دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز لە ١٩١٩دا بەڕێوەی بردبوو [٦٥]، ژمارەی ئەوانەی لێیان دەگەڕێین کە خوێندەوارەکانن، زۆر کەمن.

بەپێی ئەوەی مامۆستا عەبدولڕەزاق ئەلهیلالی لە کتێبی (تأریخ التعلیم في العهد العثماني)ساڵی ١٩٦١دا لە بەغدا چاپ کراوە، نووسیویەتی ژمارەی قوتابخانە ڕەسمییەکان لە ساڵی ١٩١٤دا تەنیا (٣٠) قوتابخانە بوون، (د. عەبدوڵڵا ئەلفەییاز) لە بارەیانەوە دەڵێت **(سەرباری کەمیی قوتابخانە و ئاستی نزمی زانستییان، ئەوانەی کە هەشبوون ئەو ئامانجەیان نەدەپێکا کە لە پێناویدا دامەزرابوون، چونکە وانەکانی تێدا بە زمانێکی بێگانە، کە زمانی تورکی بوو، دەگوترانەوە)**[٦٦]. (د. ئەلفەییاز) لە پەراوێزی لاپەڕە (٨٢)ی کتێبەکەیدا (الثورة العراقیة الکبری) لە وتارێکی ڕۆژنامەی (الرقیب)ی بەغدابییەوە بە ناونیشانی

(التربية والتعليم)، كە لە ژمارەی ڕۆژی یازدەی ئاداری ۱۹۰۹دا بڵاوکراوەتەوە، نووسیویەتی نووسەرەکەی دەڵێ: (**بە هۆی کەمیی قوتابخانە سەرەتاییەکان لە ویلایەتەکەمان «مەبەستی ویلایەتی بەغدایە» ئەگەر ژمارەی خەڵک بەسەر بکەینەوە دەبینین ئەوانەی خوێندن و نووسین دەزانن، بە زێدەڕۆییەوە لە سەدا یەکن، جا خۆ گەر ڕوو بکەینە نێو خێڵەکان ئەوە لە هەزارا یەکی خوێندەوارە**). ئەمە سەرباری ئەوەی لە عیراقدا تورکی زمانی فێرکردن بووە، لۆنگریک لەم بارەیەوە دەڵێ: (**لەوانەیە ژمارەی خوێندەواران لە ساڵی ۱۸۵۰ لە نێو شاردا لە سەدا (نیو) کەس بێت، دواتر ڕێژەکە بۆ ٥-۱۰ لە سەدا بەرز بووەوە لە ساڵی ۱۹۰۰ «کە خوێندن لە نێو خێڵەکاندا هەر تایبەت بە چەند کەسانێک بوو»، لە نێو شارەکاندا قوتابخانەی تایبەت بە مەسیحی و جوولەکان هەبوو، قوتابخانەکانی ئیتیحاد «ئەلیانس»ی ئیسرائیلی باشترین جۆر فێرکردنیان پێشکەش دەکرد، زۆربەی ئەو قوتابخانانەش سەبارەت بە دوورەپەرێز بوونیان لە بابەت و وانە تازەکان بە دەگمەن لە خوێندنی فەقێیایەتی «خوێندنی لای مەلا»، کە لە هەموو مزگەوتێکدا هەبوو، تێیان دەپەڕاند، ڕێژەی خوێندەواری لە نێو خەڵکی ناموسڵماندا «ڕەعایا» زۆر بەرز بوو، لە هەر قەزایەکدا قوتابخانەیەکی سەرەتایی هەبوو بێ لەو قوتابخانە سەربازیانەی کە هەبوون، لە ساڵی ۱۸۷۰ز لە بەغدا دواناوەندییەکی کوڕان دامەزرا، لە ساڵی ۱۸۹۸ز-یش قوتابخانەیەکی سەرەتایی کچان دامەزرا**)[٦٧].

بەپێی ئامارێک کە وەزارەتی مەعاریف[٦٨] لە ساڵی ۱۹۲۱دا بڵاوی کردۆتەوە، ژمارەی قوتابخانە سەرەتایی و بەراییەکان لە ویلایەتی مووسڵ (۳۲) قوتابخانە بوون:

(۲۳ لە مووسڵ و دەوروبەری، ۲ لە هەولێر، ٤ لە کەرکووک، ۳ لە سلێمانی).

ژمارەی قوتابییانی (۲٥۳٦) و ژمارەی مامۆستایانی ۱۷۲ بوو (**۱۹۱۸ قوتابی و ۱۲٥ مامۆستا لە مووسڵ و دەوروبەری، ۲۲۰ قوتابی و ۱٦ مامۆستا لە هەولێر و، ۳۰۱ قوتابی ۱۸ مامۆستا لە کەرکووک و، ۲۷۳ قوتابی و ۱۳ مامۆستا لە سلێمانی**). سەرباری دوو قوتابخانەی ڕەسمیی سەرەتایی بۆ کچان و

قوتابخانەیەکی ئەهلیی ئیسلامی لە مووسڵ و یەکی دیش لە دەوروبەری. هەروەها قوتابخانەیەکی ئیسلامییش لە کەرکووک کە ٥٥ قوتابی و ١٠ مامۆستای هەبوو، بەرامبەر بە ١٦ قوتابخانەی ئەهلیی مەسیحی، **(دوو قوتابخانە لە مووسڵ کە ٢٣٤ قوتابی و ١٠ مامۆستای هەبوو، دەوروبەری مووسڵ ١٢ قوتابخانەی هەبوو، بە ١٠٠٠ قوتابی و ٥١ مامۆستاوە، قوتابخانەیەک لە هەولێر ٤٩ قوتابی و ٣ مامۆستای هەبوو، قوتابخانەیەکیش لە کەرکووک، ٥٦ قوتابی و ٧ مامۆستای هەبوو)** و، ١٦ قوتابخانەی ئەهلیی مەسیحی بۆ کچان هەبوو **(مووسڵ ٧ قوتابخانە کە ٩٦٠ قوتابی و ٣١ مامۆستایان هەبوو، دەوروبەری مووسڵ ٨ قوتابخانەو ٨٧٦ قوتابی و ٢٠ مامۆستایان هەبوو، کەرکووک قوتابخانەیەک، ٥٧ قوتابی و ٩ مامۆستای هەبوو)**. سەرباری قوتابخانەیەکی ئیسرائیلیی کوڕان کە ١١ قوتابی و ٤ مامۆستای هەبوو **(لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٠یش قوتابخانەیەکی پیشەسازی لە کەرکووک دا کرایەوە)**[٦٩]. بە پێی ڕاپۆرتێکی مسس بێڵ [٧٠] لە بارەی زمانی فێرکردنەوە لەو حەفتاو پێنج قوتابخانە بەرایی و سەرەتاییەی لە ساڵی ١٩١٩دا لە عێراقدا هەبوون. خوێندن لە شەش قوتابخانەدا بە زمانی کوردی بوو [٧١]، لە مانگی کانوونی یەکەمی ئەو ساڵەدا **(کاپتن «گیرۆم فارڵ»ی یاریدەدەری سەرپەرشتیاری مەعاریف لە بەغدا گەشتێکی پشکنینی بۆ سلێمانی دەست پێکرد، ئەوکات (مەیجەر سۆن) حاکمی سیاسیی شار بوو، کاتێک سەردانی قوتابخانەکانی شار و دەوروبەری کرد، بۆی دەرکەوت خوێندن لەو قوتابخانانەدا زۆر دواکەوتووە، مامۆستاکان بێ توانان، جا لە کاتێکدا خوێندن بە کوردی بەڕێوەدەچوو، ئەم زمانەش (ڕێزمانی نووسراو و ڕێنووسی ڕێکوپێکی) نەبوو، بۆیە خۆی (مەیجەر سۆن) کەوتە دانانی ڕێزمانی کوردی و ڕێنووسەکەی، ئەویش بەپێی شێوازی دەنگ، پاشان کاپتن فارڵ کە گەڕایەوە بەغدا، خۆی سازدا بۆ چاپ کردنی کتێبێکی تایبەت بە «خوێندنەوەی کوردی» )** [٧٢].

لە کۆتایی سەردەمی عوسمانییەکاندا[٧٣]، ژمارەی قوتابخانە ڕەسمییەکانی لیوای سلێمانی گەیشتە دە قوتابخانە، یەکێکیان قوتابخانەیەکی موڵکی و یەکی

دیشیان روشدییەکی عەسکەری بوو، کۆی قوتابییەکانی دەگەیشتە ٤٨٩ و مامۆستاکانیشی ٢٦، (تەنیا ٣٣٠ قوتابی لە چوار قوتابخانەکەی شاردا بوون).
بەڵام قوتابخانە ئەهلییەکان لە نێو قەزاکانی سلێمانی و پشدەر و هەڵەبجە (واتە خوێندنی بەر مەلا) هەر بەپێی هەمان ئامار کە ساڵی ١٣٢١ی رۆمی لە وەزارەتی مەعاریفەوە دەرچووە، کۆیان دەگەیشتە (کە سەرەتاییەکی کلدان و یەکی جووشیان لە نێودا بوو) ٥٥ قوتابخانە و کۆی قوتابییەکانیشی ٤٧٠ قوتابی بوو.

بەپێی زانیارییەکانی خودان کتێبی (سلێمانی شارە گەشاوەکەم)، سلێمانی (بەر لە یەکەمین جەنگی جیهانی، ٤٤ مزگەوت و قوتابخانەیەکی روشدیەی موڵکی و قوتابخانەیەکی روشدیەی عەسکەری و دوو کڵێسە (یەکی مەسیحیان و یەکی جوو)ی تێدابوو، بەڵام گەشەکردنی میرنشینی بابانەکان لە سلێمانی - کە ئیبراهیم پاشای بابانی ساڵی ١٧٨٤، بەر لەوەی تورکەکان لە ساڵی ١٨٤٧دا میرنشینەکە بڕوخێنن، شارەکەی دروست کردووە- و بەوەی یەکێکە لە مەڵبەندەکانی هەر دوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندی، سایەی بەخششیان لە کاروانی پەرەسەندنی شاردا بەردەوام بوو، هەروەها دامەزراندنی قوتابخانەی روشدیی عەسکەری لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم (١٨٩٣ز) ڕۆڵێکی باشی بینی لە گەشەدان بە رۆشنبیریی خەڵکی شارەکە. پێش کۆتایی هاتنی یەکەمین جەنگی جیهان ژمارەی قوتابییەکانی دەگەیشتە ١١٠ قوتابی، بێجگە لە ٧٠ قوتابی لە ئامادەیی موڵکی لە شاردا **(دەیان کەس لە دەرچووی ئەم دوو قوتابخانەیە بۆ تەواوکردنی خوێندن ڕوویان لە ئەستەمبوڵ کرد، بۆ ئەوەی دواتر ببنە کەسایەتیی دیار لە نێو کۆمەڵگای کوردەواری، هەروەها لە نێو کۆمەڵگای عێراقدا، لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا)** [٧٤].

لە کاتی بەسەرکردنەوەی ڕۆژنامەکاندا دەبینین فێرکردن پانتاییەکی زۆری لە لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانی سەردەمی باسەکەمان داگیرکردووە، وێڕای ئەم واقیعە ناشایستەیەی فێرکردن، هەمیشە ئەدەب ئەگەر بە زارەکییش بوو بێت لە نێو کورددا پێشکەوتوو بووە.

## ب- ئەدەب و دانان

زمانی کوردی تا ئێستا ، شێوەیەکی یەکگرتووی ئەدەبیی نییە ، ئەمڕۆ دوو شێوەزار لە برەودان:

١- کرمانجی.

٢- سۆرانی.

**(لەهجەی کرمانجی لە پارچەکانی شیمالی ڕۆژئاوای کوردستان بەکار دەبرێ کە زۆربەی کوردی تێدا دەژی و هەموو کوردەکانی کوردستانی تورکیا- بێجگە لە دەوروبەری دەرسیم، کە بە لەهجەی زازا قسە دەکەن -، کرمانجی هەروەها لە سوریاو لە مەڵبەندی مووسڵ لە عێراق (پارێزگای دهوک - لێکۆڵەر)و لە مەڵبەندی شیمالی ورمێ لە ئێرانیش بەکار دەبرێ. لەهجەی سۆرانییش کوردەکانی بەشی جنوبی ڕۆژهەڵاتی کوردستان یانی زۆربەی کوردەکانی عێراق واتە لە ڕەواندزەوە بەرەو جنوب و، هی ئێران واتە لە ورمێوە بەرەو جنوب قسەی پێ دەکەن (...) دوای سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی تەمموز لە عێراق، ئەدەب و هونەری کوردی لە کوردستانی عیراق بە چەشنێکی بەرچاو هەروا پێش دەکەوێ، بەوەی لە دەستووری عێراقی دان بە بوونی کورد نراوە. بەم جۆرە سۆرانی بۆتە شێوەزاری باو لە ئەدەبی هاوچەرخی کوردیدا (...) پێویستە ئەوەش بگوترێ کە لە نێوان ئەو دوو لەهجەیەدا، فەرقێکی زۆر نییە)** (٧٥).

**(ئەدەبی میللییش لە لای کورد زۆر دەوڵەمەندە، گەلێ حیکایەتی دەربارەی داب و نەریتی نەتەوایەتی تێدایە، بەتایبەتی داستانی بەرەڤانی لە قەڵای دمدم کە شا عەباسی سەفەوی هێرشی کردە سەر، کە کوردەکان بە خۆشەویستی و ئەندێشەوە دەیگێڕنەوەو پڕیەتی لە ڕووداوی واقیعی. هەروەها داستانی نەتەوەیی تایبەت بە خۆیان هەیە (مەم و زین) (داستانێکی عەشقە لە چەشنی ڕۆمیۆ و جولێت- لێکۆڵیار). بە شیعر و پەخشانی قافیەدار هۆنراوەتەوەو لە هەموو لایەکی کوردستان بە گۆرانی دەیڵێنەوە)** (٧٦).

**(لەبەر ئەوەی میللەتەکە نەخوێندەوار بووە، لە ڕێگای ئەو بەیت و گۆرانییانەوە**

**که مێژووی شەڕە کەوناراو دڵداری دەگێڕنەوە، پشت بە پشت بە میرات هاتووەو لەبیر نەچۆتەوە)**[77].

مێژووی چاپ کردنی یەکەمین کتێب بە زمانی کوردی، پاش داهێنانی چاپخانەی نوێ بۆ ساڵی ١٧٨٧ دەگەڕێتەوە، لە ڕۆما، کاتێک مژدەهێنی کاتولیکی ماوریزۆ گارزۆنی یەکەمین ڕێزمانیی کوردیی بە زمانی ئیتالی بە ٧٨ لاپەڕە دانا، هەرچی لاپەڕەکانی دیکەی کتێبە (٢٨٨) لاپەڕەییەکەیە، بریتی بوو لە فەرهەنگێکی ئیتالی - کوردیی پێنج هەزار وشە. هەروەها (فەرهەنگی بەراوردکاریی گشت زمان و شێوەزارەکان)ی ئەکادیمیی رووسی (پالاس)ـە کە لە هەمان ساڵ دا- واتە ١٧٨٧ز- چاپ کراوەو ٢٧٦ وشەی کوردیی گرتبووە خۆ.

بەپێی ئەوەی دانەری کتێبی (بیبلۆگرافیای دووسەد ساڵی کتێبی کوردی ١٧٨٧- ١٩٨٦)[78]دەڵێ، لەو ساڵەوە تا ساڵی ١٩٢٠ پازدە کتێب بە زمانی کوردی دەرچووە، لەوانە تەنیا یەکیان لە عێراق چاپ کراوە، بەڵام لە ساڵانی نێوان ١٩٢٠ تا ١٩٢٩، ٣٦ کتێبی کوردی لە عێراق لە چاپ دراوە و حەوت کتێبیش لە دەرەوەی لە چاپ دراون، لە ساڵانی نێوان ١٩٣٠ تا ١٩٣٩، (٧٨) کتێب لە نێو عێراق و، (٧٧)یش لە دەرەوەی عێراق لە چاپ دراون، کتێبەکانیش بەم شێوەیە دابەش دەبن:

٢٢ کتێبی زمان و ڕێنووس و فەرهەنگ، ٣٣ کتێبی زانستەکانی ئایین و قورئان لە نێویاندا نۆ کتێبی مژدەهێنانی مەسیحی هەیە، ٥١ کتێبی شیعر و ئەدەب و چیرۆکی منداڵان، ٤٢ کتێبی مێژوو و ژینامە و کلتوور و کاروباری کۆمەڵایەتی و هونەری، ٢١ کتێبی زانستەکانی تەندروستی و کشتوکاڵ و پەروەردە، ١٤ کتێبی سیاسی، هەرچی کتێبەکانی دیکەیە، لە بیستەکان و سییەکاندا بە تایبەتی وەک بابەتی فێرکردن بۆ قوتابخانەکان دانراون.

دەتوانین ژیانی ڕۆشنبیریی ئەدیب و شاعیرانی ئەوسای کورد، لە میانی خوێندنەوەی ئەم بڕگانەوە بێنینە پێش چاو، کە لە (مێژووی ئەدەبی کوردی)[79]یەوە وەرگیراوە و دەربارەی ژیانی یەکێ لە دیارترین شاعیرانی کورد (شێخ

ڕەزای تاڵەبانی ١٨٣٤- ١٩٠٩) نووسیویە: **(ساڵی ١٨٣٥ی میلادی لە ئاوایی (قرخ) لە لیوای کەرکووک هاتۆتە دنیاوە. سەرەتا لە لای باوکی دەستی کردووە بە خوێندن و زمانی فارسیشی خوێندووە، لە پاشا بە فەقێیەتی چۆتە کەرکووک ماوەیەک لەوێ ماوەتەوە لە لای سەید محەمەد بلاغ و، حاجی سەعید ئەفەندی حیلمی زادە دەرزی عەرەبی ئەخوێنێ، ئینجا چووە بۆ کۆیە بۆ لای حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە، هەر لە دەوری فەقێتی دا سلێمانیشی چاو پێ کەوتووەو لە مزگەوتی گەورە مزگەوتی (کاکە ئەحمەد) خوێندویەتی. لەو دەورەدا کوردەواری چونکە حکومەتی تورکی تێدا بووە، فێربوونی زمان و ئەدەبیاتی تورکی وەکو پێویست وا بووە، وە لەبەر هاتوچۆکردن و بەسەر یەکەوە بوونی کورد لەگەڵ ئێرانداو خۆشی ئەدەبیاتی ئەم زمانە هەموو منداڵێک لە سەرەتاوە ئەبوایە پێی بخوێنرایە، جا لەبەر ئەمانە شێخ رەزا ناچار کراوە بەوە کە سەر بەرێتە ناو ئەدەبیاتی فارسی و فێربوونی زمانی تورکییەوە «بێگومان هەر بەو شێوەیە زمانی عەرەبییش- لێکۆڵیار»).**

بەم جۆرە گشت ئەو شاعیرانەی دانەری کتێبەکە باسی کردوون، دەتوانین بڵێین دیمەنی ئەدەبیاتی کوردییان پێک دەهێنا لە ماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم (هەڵبەت تاکو ئێستاش هەر وایە- لێکۆڵیار)، یاخود دەکرێ ناوی بنێین عەقڵیەتی شیعری و رۆشنبیریی ئەو ماوەیە، هەر هەموویان زمانی عەرەبی و فارسی و تورکییان سەرباری زمانی دایک (کوردی)، زۆر چاک دەزانی و پێیان دەنووسین.

ئەوانەی لێرەدا ناویان دێنین لوتکەی کۆمەڵێکی یەکجار زۆری شاعیرانە، زۆربەیان لە باوەشی زانستە ئایینییەکان و ئەو مزگەوتانەی تێیدا فێربوون پێگەیشتوون و زۆربەشیان هەر بە بەرگ و پۆشاکی مەلایەتییەوە لە نێو کۆمەڵ دا ژیاون[٨٠]:

**(بابا تاهیر (٩٣٥- ١٠١٠ز)، مەلای جزیری (١٤٠٧- ١٤٨١ز)، بێسارانی (١٦٤١-١٧٠٢ز)، ئەحمەدی خانی (١٦٥٠- ١٧٠٦ز)، نالی (١٧٩٧-**

**١٨٥٥ز)، سالم (١٨٠٠-١٨٦٦ز)، مەولەوی (١٨٠٦- ١٨٨٢ز)، مەلای جەباری (١٨٠٦- ١٨٧٦ز)، سەید یاقۆ (١٨٠٨- ١٨٨١ز)، کوردی (١٨٠٩- ١٨٤٩ز)، حاجی قادری کۆیی (١٨١٥-١٨٩٢ز)، مەحوی (١٨٣٠-١٩٠٤ز)، شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣٥-١٩٠٩ز)، سالمی مەردۆخی (١٨٤٥- ١٩٠٩ز)، مەجدی (١٨٤٩- ١٩٢٥ز)، حەریق (١٨٥١-١٩٠٧ز)، ئەدەب (١٨٥٩- ١٩١٢ز)، پیرەمێرد (١٨٦٧- ١٩٥٠ز)، حەمدی (١٨٧٦- ١٩٣٦ز)، ناری (١٨٧٤-١٩٤٤ز)، تاهیر بەگ (١٨٧٥- ١٩١٧ز)، زێوەر (١٨٧٥-١٩٤٨ز)، ئەحمەد موختار (١٨٩٧- ١٩٣٥ز)، بێکەس (١٩٠٥- ١٩٤٨ز)** [٨١].

بە هەق زۆر لە مێژوونووسانی ئەدەب و تەنانەت چیرۆکنووس و ڕۆژنامەنووسانی کوردیش، ئێستا ئەوە دەسەلمێنن کە یەکەمین چیرۆکی هونەریی کوردی لە ساڵی ١٩٢٥ سەری هەڵداوە، ئەویش چیرۆکی (لە خەوما)ی (جەمیل سایب)ە، کە لە ژمارە بیست و نۆی یەکەمین ڕۆژی تەمموزی ١٩٢٥ی ڕۆژنامەی (ژیانەوە)دا بە زنجیرە بڵاوی کردوەتەوە.

**(هەرچۆنێ بێ، چیرۆکی هونەری کە پەیدابوونی پتر بەندە بە گیانی شارستانێتی و بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و زانستی و بەرزبوونەوەی رادەی ڕۆشنبیریی کۆمەڵەوە، دەبوو لە کۆمەڵگای کوردەواریدا وەزعی لەباری تایبەتی خۆی بۆ هەڵبکەوێ تا بۆی بلوێ سەرهەڵبداو پێ بگات، وەک لەوەوبەر باسمان کردووە، لە عێراقدا لە دوای شەڕی گەورەی یەکەمەوە بەو شێوە سەرەتاییە بۆی هەڵکەوت و خۆشی بە شێوەیەکی سەرەتایی سەری هەڵدا)** [٨٢].

لەو کاتەشدا خەڵکی سلێمانی بە دیتنی نمایشی شانۆیی ئاشنا بووبوون، قوتابیانی قوتابخانەی زانستی دوو نمایشی شانۆییان لە ساڵی ١٩٣٥دا پێشکەش کرد [٨٣].

دەکرێ بڵێین ئەم وتەیەی مێژوونووس و هزرەوەری ناسراوی کورد د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کە دەڵێ (خەڵکی سلێمانی بەوە ناسراون کە ئامادەییەکی گەورەی

دەروونییان تێدایە بۆ وەرگرتنی هەموو شتێکی هاوچەرخ) [٨٤]، بە پلەی جیاش بێت، بەسەر تێکڕای کورد جێبەجێ دەبێت. ئەمەش زۆر لە ڕۆژهەڵاتناسانی بیانی باسیان کردووە.

## پەراویزەکانی باسی یەکەم

١- یەکەمین ڕۆژنامە لە عێراقدا کە (ئەلزەورا)یە لە ساڵی ١٨٦٩ز دەرچووە، واتە چل و پێنج ساڵ بەر لە دەرچوونی یەکەمین چاپکراوی ڕۆژنامەوانیی کوردی عێراق بووە.
٢- هەرچەندە قسەکە دەزگاکانی دیکەی ڕاگەیاندنیش دەگرێتەوە بەڵام ئێمە دەڵێین ڕۆژنامەوانی، چونکە قسەکانی ئێمە تایبەت بە ڕۆژنامەوانییە.
٣- مینۆرسکی، ڤلادیمیر فیودۆرڤیچ (١٨٧٧-١٩٦٦ز) ڕۆژهەڵاتناسێکی ڕووسە، پاش شۆڕشی ئوکتۆبەر وەک مامۆستایەک لە زانکۆی لەندەن کاری کردووە، لە زۆر ئەکادیمیای زانستیی جیهانیدا وەک پسپۆڕێکی دیراساتی ئێرانی و کوردی ئەندام بووە، ساڵی ١٩١٤ سەری لە ناوچەکانی کوردنشین داوە و کتێبە گرنگ و بەناوبانگەکەی (کوردەکان، تێبینی و سەرنج)ی داناوە.
٤- مونزیر ئەلموسڵی لە ل٨٧ی کتێبەکەیدا (عرب واکراد، بیروت، ١٩٨٦) دەربارەی ئەم ڕستەیە دەڵێت: (بە تەبیعەتی حاڵ ئەم قسەیە بەسەر شاری مووسڵ و دەوروبەریدا پیادە نابێت).
٥- مونزیر ئەلموسڵی، ژێدەری پێشوو، ل١٩٣.
٦- ئاشکرایە ئەو کات هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێرانی بە هاوبەش خاکی گەلی کوردیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کرد بوو.
٧- جلال الطالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، دار الطليعة، بيروت، ط٢، ١٩٧١، ل٤١.
٨- باسيل نيكيتين، الاكراد، دار الروائع، بيروت، بلا، ص١١.
٩- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥، ل٥.
١٠- د. عبدالرحمن قاسملو، كوردستان و الاكراد، ط١، المؤسسة اللبنانية للنشر، بيروت، ١٩٧٠، ص٤٤. لە هەر جێگایەکدا نووسەر ئەم سەرچاوەیەی بەکارهێنابێ، ئەوا بۆ دەقەکەی گەڕاوینەتەوە بۆ وەرگێڕانەکەی مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن زادە. (عەبدوڵڵا زەنگەنە).
١١- ف.ف. مينورسكي، الاكراد ملاحظات و انطباعات، (ترجمة د. معروف خزنه دار)، بغداد، ١٩٦٨، ص٢٦. لە وەرگێڕانە کوردییەکەی حەمە سەعید حەمە کەریم، دەقەکە کەوتۆتە ل٥٥. بەڵام لێرەدا پشتمان بە وەرگێڕدراوە کوردییەکە لەسەر ڕاسپاردەی د. مارف خەزنەدار نەبەستوە. (عەبدوڵڵا زەنگەنە).
١٢- گرنگترین دوو ڕاپەڕین ئەوەی ساڵی ١٨٥٥ بە سەرکردایەتیی یەزدانشێر و، هی ساڵی ١٨٨٠ بە سەرکردایەتیی شێخ عوبێدوڵڵای نەهریی شەمزینی بوون.
١٣- ڤلادیمیر لوتسکی، مێژووی نوێی وڵاتە عەرەبییەکان، لە مونزیر ئەلموسڵییەوە، عرب و اکراد، ص١٩٢.
١٤- قاسملو، ژێدەری پێشوو، ل٥١.
١٥- ب. م. دانتسيغ، الرحالة الروس في الشرق الاوسط (ترجمة د. معروف خزندار)، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨١.
١٦- عەبدولڕەزاق بەدرخان، یەکێکە لە کوڕەکانی بەدرخان پاشای میری بۆتان، ساڵی ١٩١٢ گۆڤاری (کوردستان)ی لە شاری ورمێی کوردستانی ئێران، دەرکردووە، کاتێک ڕووسەکان لە دەڤەری خۆی دووری دەخەنەوەو، تورکەکانیش ساڵی ١٩١٩ لە مووسڵ بە ژەهر دەیکوژن.

١٧- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ژێدەری پێشوو، ل٢٢.
١٨- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ژێدەری پێشوو، ل٢٧.
١٩- د. فاضل حسين، مشكلة الموصل، ط١، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٥٥، ص١- ٢- ٣.
٢٠- شێخ مەحمودی حەفید یا بەرزنجی (١٨٨١- ١٩٥٦ز) لەدایک بووی سلێمانی، کوڕی شێخ سەعید (ساڵی ١٩٠٩ لە مووسڵ شەهید کراوە) کوڕی کاکە ئەحمەدی شێخ (١٧٩٣- ١٨٨٨ز) کوڕی شێخ مارفی نۆدێ (١٧٥٣- ١٨٣٨ز) کە یەکێک بووە لە پیاوانی پایەداری سۆفیگەری لە دەڤەری سلێمانی دا و دانەری کتێبە لە بواری عەقیدە و فەرزەکان و لۆژیک و زانستی ئوسووڵ. ئەم بنەماڵەیە سەرکردایەتیی رۆحییان لە سلێمانی لەدەست دا بوو، کە بە کوژرانی باوکی ئەو سەرکردایەتییە بۆ شێخ مەحمود مایەوە، ئەویش زانستەکانی شەریعەت و فیقھ و تەفسیر و بنەماکانی سۆفیگەریی خوێندبوو. سەرکردایەتیی شۆڕشەکانی کوردی کرد دژ بە ئینگلیزەکان، دواتریش دژ بە حکومەتی شانشینی عێراق، لە ماوەکانی شەڕ و گرتن و دوورخستنەوەیدا، خۆی وەک مەلیکی کوردستان ڕاگەیاند، بەر لەوەی لە ساڵی ١٩٣١ بۆ هەتا هەتایە کوردستانی لێ قەدەغە بکرێ، تا لە بەغدا کۆچی دوایی کرد، لە ڕووداوێکی تەمومژاویدا، کە تاکو ئێستا جێی مشتومڕە، ساڵی ١٩٤١ لە کاتی بزووتنەوەکەی مایس گەڕایەوە زێدی خۆی، زۆر ڕقی لە ئینگلیزەکان دەبووەوە، بە ڕادەیەک وای لەبارەوە دەگێڕنەوە، بە فەقێیانەکەی نەبووایە تەوقەی لەگەڵدا نەدەکردن.
٢١- ڕەفیق حیلمی، یادداشت، کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، بەرگی یەکەم، لە چاپکراوەکانی ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٨، ل٦٠-٦١.
٢٢- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد لەو باوەڕەدایە، بە یارمەتیی عادیلە خانی جاف لە هەڵەبجەوە هەڵاتووە، (دیمانەیەکی تایبەت).
٢٣- جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەرگی دووەم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٩٨، ل٩٤.
٢٤- مير بصري، أعلام الكرد، دار رياض الريس للكتب و النشر،لندن، قبرص، ١٩٩١، ص٤٠.
٢٥- د. عزيز الحاج، القضية الكردية في العشرينات، ط٢، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت، ١٩٨٥، ص١٠٨.
٢٦- هەمان ژێدەر، ل١١٢.
٢٧- قاسملو، ژێدەری پێشوو، ل٩٧.
لە (وەرگێڕانە کوردییەکەدا ئەو بڕگەیە کەوتۆتە ل٨٥ ئەو دوو دێڕەشی لەگەڵدایە «ئەو ڕاپەڕینە لە لایەن هێزی هەوایی پاشایەتیی بەریتانیاوە سەرکوت کرا بە تایبەتی پاش ئەوەی هەموو گوندەکانی بارزان بۆمباران کران و ١٣٦٥ خانوو روخان) (ع. ز).
٢٨- منير بكر التكريتي، الصحافة العراقية و اتجاهاتها السياسية و الاجتماعية و الثقافية، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٦٩، ص٣٣.
٢٩- مینۆرسکی، ژێدەری پێشوو، ل٣٣.
٣٠- دبليو. آر. هي، سنتان في كردستان، (ترجمة فؤاد جميل)، الجزء الاول، بغداد، ١٩٧٣، ص٦٧.
٣١- د. عزيز الحاج، ژێدەری پێشوو، ل٦٧.
٣٢- قاسملو، ژێدەری پێشوو، ل١٥١.

٣٣- هەمان ژێدەر، ل١٥٦.
٣٤- لە هەمان ژێدەرەوە وەرگیراوە، ل١٥٧.
٣٥- هەمان ژێدەر، ل١٥٨.
٣٦- سێر ئیرنیست داوسون، پسپۆرێکی بەریتانی بوو، حکومەتی عێراق بۆ لێکۆڵینەوە لە بارەی زەوی و زار و دابەش کردنی، بانگێشتی کرد.
٣٧- د. شاکر خصباك، الاكراد- دراسة جغرافية اثنوغرافية، بغداد، ١٩٧٢، ص١٧٥.
٣٨- لە هەمان ژێدەرەوە وەرگیراوە، ل١٩٦- ١٩٧- ٢١١- ٢١٢.
٣٩- لە هەمان ژیدەرەوە وەرگیراوە، ل١٩٦- ١٩٧- ٢١١- ٢١٢.
٤٠- لە هەمان ژیدەرەوە وەرگیراوە، ل١٩٦- ١٩٧- ٢١١- ٢١٢.
٤١- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردی سلێمانی و بەغدا لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا (لێکۆڵینەوەیەکی بڵاونەکراوەیە، لە کۆنگرەی کورد و شاردا لە ئەیلوولی ١٩٩٦ لە شاری پاریس خوێندراوەتەوەو بەم دواییە ئەم لێکۆڵینەوەیە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی و لە ژمارە (٩)ی گۆڤاری پەیڤین ساڵی ٢٠٠٠ لە سلێمانی بڵاوکراوەتەوە - ع. ز).
٤٢- د. غسان العطية، العراق نشأة الدولة (ترجمة عطا عبدالوهاب)، لندن، ١٩٨٨، ص٥٤.
٤٣- هەمان ژێدەر، ل٥٣.
٤٤- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردی سلێمانی و بەغدا.
٤٥- هەمان ژێدەر.
٤٦- هەمان ژێدەر.
٤٧- هەمان ژێدەر..
٤٨- هەمان ژێدەر.
٤٩- دەبلیو. ئار. هی، ژێدەری پێشوو، ل١٣٧.
٥٠- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردی سلێمانی و بەغدا.
٥١- ستيفين هيمسلي لونگريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث (ترجمة جعفر الخياط)، ط٦، بغداد، ١٩٨٥، ص٣٨٢.
٥٢- ساڵی ١٨٦١ز فەرمانگەی بروسکە لە عێراق دامەزراو هێڵی تەلگراف ڕاکێشرا.
٥٣- هەمان ژێدەر، ل٣٨٢.
٥٤- هەمان ژێدەر، ل٣٨٣.
٥٥- د. شاكر خصباك، العراق الشمالي، ط١، بغداد، ١٩٧٣، ص٥١٢.
٥٦- هەمان ژێدەر، ل٥١٣.
٥٧- مینۆرسکی، ژێدەری پێشوو، ل٧٥.
٥٨- هەمان ژێدەر، ل٧٤.
٥٩- دەبلیو. ئار. هی، ژێدەری پێشوو، ل٦٣.
٦٠- هەمان ژێدەر، ل٦٢-٦٣.
٦١- بڕوانە: ناجي الحديثي، العراق ١٩٨٨، دار المأمون، بغداد، ١٩٨٩.
٦٢- د. عزيز الحاج، المصدر السابق، ص٨١.
٦٣- قاسملو، المصدر السابق، ص٣٧.
٦٤- لە /د. عناد الكبيسي، الادب في صحافة العراق، النجف، ١٩٧٢، ص٢٠٤، وەرگیراوە.

٦٥- ئامارەکە لەسەر بنەمای ئایین و ئایینزا بەڕێوەچووە، واش دەرچووە، کە ژمارەی دانیشتووانی عێراق (٢.٨٤٩.٢٨٢) کەسە و، ژمارەی دانیشتووانی ویلایەتی مووسڵ (٧٠٣.٣٧٨) کەس بووە، (لەوانە ٧١٣، ٥٧٩ سوننی و، ١٨٠، ٢٢ شیعەو ، ١٤.٨٣٥ جوو و ،٥٥.٤٧٠ مەسیحی و، ٣١.١٨٠ لە ئایینی دیکە) بڕوانە: عبدالرزاق الهلالي، تأريخ التعليم في عهد الاحتلال البريطاني، بغداد، ١٩٧٥، ص٤١٢.

٦٦- د. عبدالله الفياض، الثورة العراقية الكبرى، ط٢، مطبعة دار السلام، بغداد، ١٩٧٥، ص٨٢.

٦٧- لۆنگریک، ژێدەری پێشوو، ل٣٨٠-٣٨١.

٦٨- عبدالرزاق الهلالي، تأريخ التعليم في عهد الاحتلال البريطاني، ص٢٥٤- ٢٥٥- ٢٥٦- ٢٥٧.

٦٩- هەمان ژێدەر، ل١٨٨.

٧٠- مسس بێڵ: کرترۆد مارگریت لوسیان (١٨٦٨- ١٩٢٦ز)، پسپۆڕێکی مێژوو بوو لە زانکۆی شاژن لە لەندەن و زانکۆی ئیکسفۆرد، زۆربەی وڵاتانی دنیا گەڕاوە و لە ئەدەبیاتی گەشتیاری نووسینی هەیە، زۆر لە سەردان و بایەخدانەکانی ڕوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو، زمانی عەرەبی و فارسی زۆر باش فێربووە، لەوانەیە تورکییش، لە ماوەی یەکەمین جەنگی جیهانیدا کەوتە نێو کاری سیاسی، دواتر بە سکرتێری ڕۆژهەڵاتی (خانەی ئەلئیعتیماد) لە بەغدا دامەزرا، کە ڕۆڵێکی دیاری هەبوو لە دانانی مەلیک فەیسەڵ و پێکەوەنانی دەوڵەتی تازەی عێراقدا.

٧١- هەمان ژێدەر، ل١٩٩.

٧٢- هەمان ژێدەر، ل١١٧.

٧٣- محمد أمين زكي، تأريخ السليمانية وأنحائها (ترجمة محمد جميل بندي الروژبياني)، بغداد، ١٩٥١، ص٢١٠.

٧٤- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردی سلێمانی و بەغدا.

٧٥- قاسملو، ژێدەری پێشوو، ل٣٠-٣١.

٧٦- مینورسکی، ژێدەری پێشوو، ل٣٩.

٧٧- قاسملو، ژێدەری پێشوو، ل٣٣.

٧٨- مستەفا نەریمان، بیبلۆگرافیای دوو سەد ساڵی کتێبی کوردی ١٧٨٧- ١٩٨٦، بەغدا، ١٩٨٨.

٧٩- عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەغدا ، ١٩٥٢، ل٣٤١-٣٤٢.

٨٠- ژمارەیان دەگاتە بیست و چوار شاعیر، هەشتیان لە کوردستانی ئێستای ئێران و دوانیان لە کوردستانی ئێستای تورکیا و دوانیشیان لە کەرکووک و گشت ئەوانی تریش لە سلێمانی و دەوروبەرین، ئەدیب و شاعیرانی کورد لە ماوەی ١٩١٤- ١٩٣٩ لە ڕۆژنامەگەریی ئەو سەردەمەدا کاریان کردووە (بڕوانە: فوئاد حوسێن ئەحمەد، هۆنراوەی نیشتمانی لە ئەدەبی کوردیدا، ئەتروحەیەکی بڵاونەکراوەی دکتۆرایە، کۆلێژی پەروەردە- زانکۆی بەغدا، ١٩٩٦).

٨١- بۆ پیشاندانی کاریگەریی زاڵی ئەو شاعیرانە، ناونیشانی هەندێ لەو کتێبانەی تازە دەربارەی نالی دەرچوون و ناوی دانەرەکانیان دەهێنین:

- محەمەدی مەلا کەریم: لە ڕێگای ئەدەب... لە پێناوی نالی دا، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری، بەغدا، ١٩٧٩، ٣٢١ لاپەڕە.
- نالی لە کلاوڕۆژنەی شیعرەکانییەوە، بەغدا، ١٩٧٩، ٩٦ لاپەڕە، (بە یارمەتیی ئەمینداریتی ڕۆشنبیری و لاوان).
- مەسعود محەمەد: چەپکێ لە گوڵزاری نالی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری، بەغدا، ١٩٧٦، ٣٥٠

لاپەڕە.
- مەلا عەبدولکەریمی مدرس و (فاتیح عەبدولکەریم): دیوانی نالی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری، بەغدا، ١٩٧٦، ٧٥٢ لاپەڕە.
- د. مارف خەزنەدار: دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، لە چاپکراوی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٧٧، ٤٤٢ لاپەڕە.
- کەریم شارەزا: نالی و زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، بەغدا، ١٩٨٤، ٧٦ لاپەڕە، (بە یارمەتیی ئەمینداریتی رۆشنبیری و لاوان).
- عەبدولخالیق مەعروف: دیوانی نالی و کێ ڕاستە؟ بەغدا، ١٩٨٤، ١٧٠ لاپەڕە، (پرۆژەی ١٠٠ کتێبی کوردی).

بەهەر حاڵ کاریگەریی ئەم شاعیرانە بەسەر رۆژنامەگەریی کوردی بە شێوەیەکی زۆر دیار ڕەنگی داوەتەوە، هەر وەکو لە کاتی لێکۆڵینەوە لە رۆژنامەگەریی ئەو سەردەمەدا بۆمان دەردەکەوێت.

٨٢- حوسێن عارف، چیرۆکی هونەریی کوردی، چ١، بەغدا، ١٩٧٧، ل١٢.
٨٣- یاسین قادر بەرزنجی، دوو شانۆگەریی ساڵی ١٩٣٥، کاروان (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە ٤٩، تشرینی یەکەم ١٩٨٦، ل٦٣.
٨٤- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردی سلێمانی و بەغدا.

## پەراویزەکانی وەرگێڕ

* لەو سەردەمەدا (بارزان) لە سنووری لیوای کەرکووکدا بووە نەک سلێمانی بۆیە مەزەندەی ئەوە دەکرێت، کە بە جۆرێک لە جۆرەکان ناوەکە لە بری بازیان نووسرا بێت.
(**) مژدەبەرو، مژدەهێن وەک دوو زاراوەی کوردی لە بری زاراوەی (المبشر - المبشرین)ی عەرەبی بەکارم هێناون.
(***) بە بڕوای من لەوانەیە ساڵی ١٩٢٦ لێرەدا هەڵەی چاپ بێت، ئەو ساڵە هەر دەبێ پێش ساڵی ١٩٢٤ بێت، دوور نییە کە ١٩٢٢ بێت.
(****) ئاشکرایە ژمارەکان تێک ناکەنەوە، چونکە لە کاتێک دا دەڵێ ژمارەی دانیشتوانی عێراق لە ١٩٢٧دا (٢) ملیۆن و (٩٦٨) هەزارو (٥٤) کەسە، کەچی لە کۆی ژمارەی نێر کە (١) ملیۆن و (٦٨٨) هەزارو (٢٣٩) کەسەو، ژمارەی مێ (١) ملیۆن و (٦٩٢) هەزارو (٢٩٤) کەسە، ژمارەیەکی گەورەتری دانیشتوانمان دەست دەکەوێت، کە (٣) ملیۆن و (٣٨٠) هەزارو (٥٣٣) کەسە، جیاوازیی نێوان هەردوو ژمارەکەش یەکجار زۆرە کە (٤١٢) هەزارو (٤٧٩) کەسە.

# پەیدابوونی ڕۆژنامەگەریی کوردی

## أ- سەرەتاکانی گەڵاڵەبوونی هەستی نەتەوەیی

عەلائەدین سەجادی [٨٥] دەڵێ: **(نەتەوەی کورد؛ کورد لە سەردەمەکانی پێشوویا وا دیارە بارێکی وای بۆ هەڵنەسووڕاوە، بۆ ئەوەی زمانەکەی خۆی بە نووسراوەیی ئاگاداری بکا. تاقە هێزێک بە دەستیەوە بووە، گۆشەگیری بووە بۆ مانەوەکەی)**.

کاتێکیش پاساو بۆ ئەو هۆیە تایبەتانە دێنێتەوە، کە وایان لە گەلی کورد کرد، درەنگ هەستی نەتەوەیی ببزوێت، دەڵێ: **(کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات، کورد تا دوو سەد ساڵی پاش دامەزراندنەکەی هەموو بە دڵێکی فراوان و بە هەموو ئارەزوویەکیەوە باوەشی کرد بەو ئالایەداو بە دڵ و بە گیان خۆی لە ژێر سێبەری ئالاکەدا حەسانەوە. لەو ڕۆژەوە چ بە شیر چ بە قەڵەم خزمەتی ئەو دینە ئەکا تا ئەم ڕۆژە ئێمەی تێدایین لە هیچ سەردەمێکاو لە هیچ ڕۆژێکا بە جۆرێکی تێکڕایی لەو دوو ڕێگایەدا درێغی نەکردووەو ناشیکا. بەڵام لە دوای سەردەمی عەباسی، بەربەرەکانێی حکوماتی ئێرانی و حکوماتی عوسمانی، کوردی لەو ناوەدا کرد بە ئاردی ناو دڕکان و کردی بە هەڵمات پێکیان ئەدان! ئەمانە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە پابەندبوونیان بە ئایینی ئیسلامەوەو خزمەت کردنیان بە علوم و زانیاری ئیسلامی و زمانی عەرەبییەوە، ماوەی نەداون کە بە زمانەکەی خۆیان شتێک بنووسن و شتێک بهێڵنەوە. لەگەڵ ئەوەش ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەنەبێ دژی ئەو جۆرە شتانە بێت)**[٨٦].

ئینجا دەڵێ: **(لە لایەک ئێرانییەکان فیکری گوشیون، بەوە کە گوایا لەگەڵ کورددا بران و فەرقی چیە با نووسین فارسی بێ!**

**له لایەکەوە حکوماتی عوسمانی بە ناوی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیەوە، ئەم ئیشەی کە ئەکرد، نەوەک هەر لەگەڵ کورددا بوو، بەڵکو لەگەڵ ئەو هەموو نەتەوانەشا بوو کە لە ژێر ئاڵای ئیمپراتۆریەتا بوون بە عەرەبیشەوە. لە هەموو لایەکەوە ڕێگا لە کورد گیرا بوو بۆ ئەوەی بە زمانی خۆی بخوێنێ و شت بنووسێ و بیهێڵێتەوە. تێکڕای نووسین تەنانەت - نامەش - یا ئەبوایە بە زمانی فارسی بوایە یا تورکی بۆ خزمەت کردنی علومی ئیسلامیش بە عەرەبی بوو)**، پاشان دەڵێ: **(لەبەر ئەم هۆیانە ئێمە ناتوانین پەخشانێکی ڕێک و ڕەوانی کوردی کە نووسرابێ تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم و بەڵکو نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیە بێنینە دەست)** [٨٧].

خوێندنەوەیەکی وردی مێژووی نوێی کورد بە ئاکامێکمان دەگەیەنێت، کە هەستی نەتەوەیی لە لای کورد دوای نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمی زایینی سەری هەڵداوەو کەوتۆتە گەشەکردن.

بۆ ئەم کارەش دوو هۆکار پاڵپشت بوون: یەکێکیان پەرەسەندنی هەستی نەتەوەیی لەو سەردەمەدا، بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە لای عەرەبەکان- کە دراوسێی کورد و هاوئایین و هاوئازاریانن - بەرەو ڕووی سیاسەتی ستەمکارانەی عوسمانییەکان. دووەمیشیان ڕووخانی میرنشینە نیمچە سەربەخۆکانی کورد لە بن پێی سەربازە تورکەکاندا.

دانەری کتێبی (کردستان والحرکة القومیة الکردیة) دەربارەی کورد لە سەدەی شازدەهەمی زایینی دا وا دەدوێ کە کاتێ دەوڵەتی عوسمانی توانیی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کوردستان و میرنشینەکانیدا بسەپێنێ، کوردیش بە دوو لادا کەوتن، بەشێکیان بوونە پاشکۆی دەوڵەتی سەفەویی شیعە و بەشی دووەمیشیان بوونە پاشکۆی دەوڵەتی عوسمانیی سوننە.

لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی ئەو کات نەتەوەی کورد بەپێی چەمکی نوێی نەتەوە نەهاتبووە خەملین، کە لە ئاکامدا بزاڤێکی نەتەوەیی کوردیش لە ئارادا نەبووە و خەبات بۆ وەدی هێنانی ئامانجە نەتەوەییە تایبەتییەکان بکات[٨٨].

بەم جۆرە سوڵتان سەلیمی عوسمانی توانیی بە هۆی زانایەکی ئایینیی کورد مەلا ئیدریس بدلیسی، کورد بخەڵەتێنێ بەوەی سوڵتان ناردی **(بە نێو کورداندا بگەڕێت و قسە لەگەڵ میر و ناودارانیان بکات و هەستی ئایینی و مەزهەبییان بجولێنێ، بانگهێشتی ئەوەی دەکردن بێنە ژێر ئاڵای خەلیفەی عوسمانلی، کە بەپێی فەرمانێکی سوڵتانی لە ناوەڕاستی مانگی شەووالی ساڵی ٩٤١ی کۆچی بەرامبەر بە سەرەتای مانگی تشرینی دووەمی ١٥١٥ز، دانی بە سەربەخۆیی ناوخۆی میرنشینە کوردییەکان نا. بەم جۆرە بە شێوەیەکی ڕەسمی میرنشینە سوننە مەزهەبەکانی کوردستان خرانە ژێر دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانلی، ئەو بە ڕەسمی کەوتنە ژێر دەسەڵاتەی کە سەرەتایەک بوو بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی عوسمانی بەسەر کوردستاندا)**(٨٩)، لە ماوەی نێوان سەدەی پازدەهەم و سەدەی نۆزدەهەمی زایینیدا دەیان میرنشین و ویلایەتی سەربەخۆی کوردی دامەزران، گرنگترینیان **«ئەردەلان، سۆران، بابان، بادینان، هەکاری، بۆتان»**(٩٠) بوون، دەکرێ لە باسکردنێکی سادە و بە پەلەی هەندێکیانەوە، مرۆڤ بتوانێ ڕادەی هێز و گرنگیی ئەو هەرێمانە بهێنێتە زەین و خەیاڵەوە، بۆ نموونە میرنشینی بابان شێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ یا نیمچە سەربەخۆی وەرگرتبوو، لە نێو میرەکانیدا پیاوانی هەڵکەوتووی ئازا و بە سەروبەر لە کارگێڕیدا پەیدابوون، وێڕای ئەوە هیچ کامێکیان لەبەر زۆر هۆ نەیانتوانی میرنشینەکەیان بکەنە دەوڵەتێکی تەواوی سەرو سیمادار، هەتا یەکێکیان کە سلێمان پاشا بوو، توانیی بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ دەست بەسەر شاری بەغدادا بگرێت «ساڵی ١٨١٠- لێکۆڵیار»(٩١).

هەرچی محەمەد پاشا بوو، **(لە ڕەواندز کارگەیەکی چەکسازیی دامەزراند، خەنجەر و تفەنگ و تەنانەت تۆپیشی دروست دەکرد، دوو سەدو چەند تۆپی دروست کرد، کە ئێستاش نمونەیان لە ڕواندزو مۆزەی بەغدا ماون)**(٩٢)، بەڵام میری بۆتان **(دراوی کوردیی بە ناوی خۆی لە ساڵی ١٢٥٨ی کۆچیدا لێداوە)**(٩٣).

بە هەرحاڵ دەکرێ بڵێین مێژووی ئەم میرنشینانە مێژووی خوێنی ڕژاوی کوردە و بە زۆربیش هەر بە دەستی کورد و بە دەست لە پشتدانی تورک و فارس(٩٤) بووە.

دكتۆر بلەج شێركۆ[٩٥] لە كتێبەكەیدا (القضية الكردية) دەڵێ: **(جێبەجێ كردنی ئەم سیاسەتە فێلاوییەش لە كوردستان كە لە سوڵتان سولەیمانی قانونییەوە داكەوت كە دوای سوڵتان سەلیمی یەكەم(*) هات و بەوەی ناكۆكی و ناتەبایی و تۆوی كینەو ئیرەیی لە نێوان دوو میری ئەو میرانەدا ئەچاند بۆ بەرپا كردنی ئاژاوە نانەوە، ئیتر خۆی ئەچوو بە هانای لاوازەكەیانەوەو بە هێزەكەیانی لەناو ئەبرد، پاشان لاوازەكەیشی وا لێ ئەكرد چۆكی بۆ دابداو بیخاتە ژێر ركێفی خۆیەوە بەمجۆرە لەیەك كاتدا دوو میرنشینی نیشتمانپەروەرو بەهێز ناویان لە ناو ناواندا نەئەما)**[٩٦].

لە دواییدا سوڵتان مەحمودی دووەم، بە مەبەستی جێبەجێ كردنی ئەو چاكسازی و مەركەزیەتەی لە ١٨٢٦ز دا بڕیاری لەسەر دابوو، لە ساڵی ١٨٣٤زدا بۆ سەر لەنوێ داگیركردنەوەی كوردستان و لەناوبردنی ئەو میرنشینانەی مابوون، هەڵمەتێكی سەربازیی دەست پێ كرد بەوەی **(ئەو سەر لەنوێ داگیركردنەوەیە هۆكارێك بوو بۆ ئەوەی كوردەكان لە ساڵانی ١٨٣٤- ١٨٤٦دا بۆ یەكەمین جار بزووتنەوەیەكی نەتەوایەتییان بە سەركردایەتیی بەدرخان پاشا بەرپا كرد)**[٩٧].

پاشان **(لە ساڵی ١٨٥٥یشدا یەزدان شێر لە هەكاری و بۆتان دەستی بە بزووتنەوە كرد، بەتلیس و مووسڵی گرت و بەرەو باشووریش شۆڕ بووەوە و، دەستی بەسەر هەموو ئەو دەڤەرانەی دەكەونە نێوان وان و بەغدادا، گرت)**[٩٨].

پاشان شۆڕشی گەورەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری[٩٩] لە شەمزیناندا دەستی پێكرد. **«بە گرنگترین جوڵانەوەی رزگاریی نەتەوایەتی دەژمێردرێ كە لە سەدەی نۆزدەهەم بەرپا بووە ئەویش لەبەر فراوانی جوڵانەوەكەو لەبەر ئەوەی ناوچەیەكی گرنگی كوردستانی گرتبۆوەو لەبەر ئامانجە نەتەوایەتییە ئاشكراكانی»**[١٠٠]

بەم جۆرە دەكرێ بگوترێ، كە هەستی نەتەوایەتیی كورد لە منداڵدانی هەوڵی ئەو میرنشینانەدا لەدایك بوو، كە لە سایەی داكۆكی كردنیان لە خۆیان، ئەو هەستە لە سەرەتاكانی سەدەی نۆزدەهەم و تا ناوەڕاستی ئەو سەدەیە گەشەی كرد. هەروەها ئەو توندییە لە ڕادەبەدەرەی دەسەڵاتی عوسمانی شۆڕشەكانی كوردو ئەو

میرنشینانەی پێ دامرکاندوەتەوە، هەڵبەت هۆکاری هەرە بەهێزیش سەرهەڵدان و زاڵبوونی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی تورک (تۆرانیزم)بوو، کە بە گیانێکی ڕەگەزپەرستانەی زۆر توندەوە هاتە ئاراوە، دواتر زۆر بە گەرمی لە سیاسەتی حزبی ئیتیحاد و تەرەقیدا بەرجەستە بوو، لە ۱۹۰۸دا کودەتا بەناوبانگەکەی لە ئەستەمبوڵ بەرپا کرد، پاشان هەڵمەتێکی دزێو و دڵڕەقانەو توندو تیژیان دەست پێکرد بۆ تورکاندنی گشت ئەو نەتەوانەی لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوون، بەڵام شۆڕشی شەمزینان بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی سازکردو ڕێی بۆ دروست بوونی کۆڕو کۆمەڵەی کوردی خۆش کرد، هەروەها هەستی نەتەوایەتیی کوردیشی سازکرد[١٠١]، لەوانەیە ئەوەیان یەکەمین جار بێت کە پیاوێکی گەورەی ئایینی[١٠٢] لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیدا تێکۆشابێت، دوانەی تازەی ئایین- نەتەوایەتی دەکرێ لە یەکێ لە خوتبەکانیدا هەستی پێ بکرێت، تێیدا دەڵێت: **(نەک تەنیا ئێمەی کوردی ژێر دەسەڵاتی تورکی عوسمانلی، بەڵکو کوردی ئێرانیش دەبێ لە دەستی ئەم دوو حکومەتە رزگار بین، کە ڕێگر و دژ بە پێشکەوتنی ئێمەن، بۆیە باپیرانمان فەرمانیان پێکردوین کە بە خوێنمان قوربانی لە پێناو ئایین و ئازادیی نیشتمانەکەمان بدەین)**[١٠٣]. وێڕای ئەوەی ئەم دوانەی ئایین- نەتەوایەتی تا شۆڕشەکانی شێخ مەحمودو شێخ ئەحمەدی بارزان بە پێکهاتەیەکەوە، کە بریتی بوو لە سەرکردایەتییەکی ئایینی و ئامانجەلێکی نەتەوەیی بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ناو بە ناو حزب و کۆمەڵەش پەیدا دەبوون، بە تایبەتی پاش ساڵی ۱۹۰۸، کە دەستووری عوسمانی ڕاگەیەندراو، هەرچەندە خەڵکانێکی دەرەبەگی خێڵەکی و لە هەندێ شوێنی سەرکردایەتیی ئەو کۆمەڵانە مانەوە، بەڵام هەر هێزێکی تازەو کاریگەریان خستە گۆڕەپانەکەوە، کە ئەویش دەستەی ڕۆشنبیران بوون و، وەرچەرخانێکیان لە هزری نەتەوایەتی و پێداگرتن لەسەر خواستە نەتەوەییەکان هێنایە ئاراوە، بە تایبەتی لە پەشێوییەکانی شەشی ئەیلوولی ۱۹۳۰ لە نێو شاری سلێمانیدا، چامەی هەندێ لە شاعیران لە بەردەم جەماوەری ڕاپەڕیودا، بۆ نموونە بێکەس، گولدەستەی دەنگی هەردەم ئامادەو زۆر

کاریگەری شاعیرانی کورد بوو لە بواری هاندان بۆ شانازی کردن بە کوردو کوردایەتی و، بانگەواز بۆ ئەوەی داکۆکی لەو بوون و ژیانەوەیە بکرێت.

لە تەماشاکردنی دیوانی شاعیرانی کوردەوە مرۆڤ ئەم شتەی بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە ئەو دیوانانەش هەمیشە بەشێکی تایبەتییان بە شیعری نەتەوەیی و سیاسی تێدایە[١٠٤]و، زۆر بە روونی جێ دەستی ئەو شاعیرانە و شیعرە نیشتمانییەکانیان، جا چ هاندان بوو بێت یا دەرخەری ئازار، مۆرکی لەسەر ڕۆژنامەگەریی کوردیدا دیار بووە، تەنانەت زۆر لەو شاعیرانە کارکردنی نێو ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیان بە مەیدانێکی خۆش زانیوە بۆ دەربڕینی بیرو راکانیان و گەیاندنی گوتاری نەتەوەییان بە جەماوەری کورد.

بەپێی قسەی د. بلەج شێرکۆ ساڵی ١٩٠٨ یەکەمین کۆمەڵەی گەورەی سیاسیی کورد - لە ئەستەمبوڵ دا - هاتە دامەزراندن، ئەویش کۆمەڵەی تەعالی و تەرەقیی کورد بوو، هەروەها کۆمەڵەیەکی دیکەی ئەدەبیی ڕێنماییکەر- ئەمە گوزارشتی د. بلەج شێرکۆیە- هاتە دامەزراندن بە ناوی **(کۆمەڵەی نەشری مەعارفی کوردی)** یەوە.

لە ساڵی ١٩١٠ش کۆمەڵەی (هیڤی) لە ئەستەمبوڵ دامەزرا، ساڵی ١٩١٣ گۆڤاری (ڕۆژی کورد)ی دەرکرد، پاشان ڕێکخراو زۆر بوون تا لە ساڵی ١٩٢٧دا هەر هەموویان چوونە ژێر ئاڵای حزبی(خۆیبوون)ەوە، کە دوای نەمانی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لە دیاربەکر هاتە دامەزراندن.

مرۆڤ دەکارێ قەبارەی بە گەرمەوە ڕووکردنی ڕۆشنبیرانی کورد بۆ بەشداری کردن لە پێکەوەنانی کۆمەڵەو حزبەکاندا بە بەڵگەی ئەوە بزانین کە دوو کەس لە چوار دامەزرێنەرەکەی کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) - پاشان بووە حزب و لە ئەستەمبوڵدا دەسەڵاتی گرتە دەست و زۆر بە دڵڕەقی و بە توندو تیژی سیاسەتی تورکاندنی پیادە کرد - دوو کوردی ناسراو بە خەباتی کوردایەتی بوون، هەردووکیشیان لە بواری ڕۆژنامەگەریدا ناوبانگیان دەرکرد[١٠٥].

بەڵام لە کوردستانی عێراقدا، یەکەمین کۆمەڵە بە ناوی **(جەمعیەتی کوردستان)**

له ساڵی ۱۹۲۲دا دامەزراوە، ڕۆژنامەیەکیشی دەرکردووەو، مستەفا عەزیز پاشای یامولکی، کە بەر لەوەی بگەڕێتەوە سلێمانی، لە ئەستەمبوڵدا گەلێ پلە و پایەی بینی بوو، لەوانە سەرۆکی دادگای عورفی، سەرکردایەتیی کۆمەڵەکەی دەکرد. پاشان کۆمەڵەی دیکە لە سلێمانی و ڕواندز و کەرکووک و هەولێر و بەغدا دامەزران، ساڵی ۱۹۳۰ کۆمەڵەی لاوان لە لایەن ئەو قوتابییە کوردانەی لە پەیمانگاکانی بەغدا دەیانخوێندو ژمارەیەک لە ڕۆشنبیرانەوە دامەزرا، دواتر **(کۆمەڵەی ئیسلاحی کوردی)** پاش ئینقیلابی بەکر سدقی و پێکەوەنانی کابینەکەی حیکمەت سلێمان هاتە دامەزراندن، لە سلێمانییش زۆر کۆمەڵە دامەزران، لەوانە **(کۆمەڵەی برایەتی)** لە ساڵی ۱۹۳۸ بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحمودی حەفید و، **(کۆمەڵەی فیدائیی وەتەن)** لە ساڵی ۱۹۳۵و، کۆمەڵەی **(ئازادیی کورد)** لە ۱۹۳۸ و، **کۆمەڵەی دارکەر** لە ساڵی ۱۹۳۷، هەر هەموشیان لەنێو حزبی هیوادا یەکیان گرتەوە[۱۰۶].

دەکرێ بگوترێ یەکێ لە گەواهییەکانی ئەم ڕاپەڕینە هزری و گەشەکردنەی هەستی نەتەوایەتی بەر لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا، دەرچوونی گۆڤاری (بانگ کرد- بانگی کورد) بوو، کە د. کەمال مەزهەر لە بارەیەوە دەڵێت: **(ئەوەی لێرەدا پێویستە، بە شێوەیەکی تایبەتی، سەرنجی بۆ رابکێشین ئەوەیە کە هەستی نەتەوەیی لە زۆر شوێنی ناوەڕۆکی ئەم گۆڤارەدا خۆی نواندووە)**[۱۰۷].

پێویستە ئەوەش بگوترێت، کە دەکرێ ئاماژە بۆ خاڵێکی دیکەی گرنگ بکەین، کە کاری کردە سەر ئاراستەکردنی هەڵبژاردەی ڕۆشنبیرانی کورد و گشت ئەوانەی هەوڵی گەشەدان بە نەتەوەی کوردیان دەدا، ئەویش ئەو بەڵێنە زۆرانە بوو، کە ئینگلیز بە گەلانی کۆلۆنیال کراویان دابوو، گوایە دەوڵەتی تایبەتی نەتەوەییان بۆ دادەمەزرێنن.

سەبارەت بە کوردیش ئەوە لە مادە ٦٢ی پەیماننامەی سیڤەری ساڵی ۱۹۲۰دا بەرجەستە ببوو، جێبەجێ نەکردنیشی هەر وەک خەونێکی بەدی نەهاتووی کورد مایەوە، هەروەها گۆڕانکارییەکانی جیهانیش، لەوانە شۆڕشی ئوکتۆبەری رووسیا لە

١٩١٧داو، ئەو چوارده بنەما ئەمریکییەی، لە نێویاندا مادە ١٢ی تایبەت بە مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلان، کە ولسنی سەرۆکی ئەمریکا ساڵی ١٩١٨ ڕایگەیاند بوو، ڕۆڵێکی چاکیان بینی لە گەرم کردنی ئەو ڕەوتە.

بە هەرحاڵ ڕۆڵی گەورە و دیار لە مێژووی نوێی کورددا و، پاڵنەر بە ئاراستەی پەرەدان بە هزری نەتەوەیی کوردو، گۆڕانی بە بزووتنەوەیەکی هاوچەرخی ڕێک و پێکی زانستی، چاکەو پیاوەتییەکەی بۆ ڕۆڵەکانی بنەماڵەی بەدرخانیان و ڕۆژنامەکانیان و بە تایبەتی (کوردستان) دەگەڕێتەوە.

## ب- بەدرخانیان و ڕۆژنامەی (کوردستان)

لە پێشەکیی (ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی)دا هاتووە **(دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی - لە کاتی خۆیدا بە زمانی کوردی بە ناوی «کوردستان» - لە ٢٢ی نیسانی ١٨٩٨ ز لە قاهیرە، وەرچەرخانێکی گەورەی لە مێژووی نەتەوەی کورد و بزاڤە رزگاریخوازەکەیدا هەبووە، دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیە لە لایەن نیشتمانپەروەری نەمر میقداد مەدحەت بەدرخانەوە، بایەخێکی مەزنی هەبووە، بەوەی ئەو خانەوادە شکۆمەندە دەستێکی باڵایان هەبوو لە بووژاندنەوەی هەستی نەتەوەیی کوردو، بەرەنگاربوونەوەی ژێردەستی و بانگهێشت کردن بۆ برایەتیی نەتەوەیی لە نێوان گەلی کورد و گەلانی دراوسێی[١٠٨])**.

ئەم (خانەوادە شکۆمەندە) نەوەی میر بەدرخان پاشای گەورەیە، دوایین میری میرنشینی (بۆتان)، **(کە شاری جزیرە پایتەختەکەیەتی، پلەیەکی بەرزو گەورەی لە مێژووی نەتەوەیی و رۆشنبیریی کورددا هەیە. ئەم میرنشینە، کەوتبووە ڕۆژئاوای میرنشینی هەکاری و بادینانەوە)[١٠٩]**.

ڕەچەڵەکی ئەم خانەوادەیە جۆرە تەمومژێک دەوری داوە[١١٠]، کە لە سەدەی شازدەهەمەوە تا ڕۆژی ڕووخانی لە ساڵی ١٨٤٧دا پاش سەرنەکەوتنی شۆڕش دژ بە دەسەڵاتی عوسمانی و بە دیل گیرانی بەدرخان پاشا و گواستنەوەی بۆ ئەستەمبوڵ و پاشان دوورخستنەوەی بۆ دورگەی کریت، حوکمی میرنشینەکەیان کردووە.

زانیاری دەربارەی دەسەڵاتی خانەوادەی عەزیزان[111] لە سەدەی ١٦ و ١٧ی زایینی زۆر کەمە، مێژوونووسان سەدەی نۆزدەهەم بۆ دیرۆکی ئەم خانەوادەیە دیاری دەکەن و، لەوێوە دەست بە نووسین دەکەن، واتە لە ڕۆژانی حوکمی بەدرخان بەگەوە. میر بەدرخان ساڵی ١٨٠٦ ز لەدایک بووە و ساڵی ١٨٢١ز-یش کاروباری میرنشینەکەی گرتۆتە ئەستۆ، سوودی لە شوێنی گرنگی میرنشینەکەی وەرگرتبوو کە لە نێوان دیاربەکر و مووسڵدا بوو، باجی لەو بازرگانییە وەردەگرت کە بەوێدا تێدەپەڕی و دانی بە دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانیدا نەدەنا، بەڵکو بەردەوام ڕواڵەتەکانی سەربەخۆیی میرنشینییەکەی قایمتر دەکرد، کە بازرگانەکانی لەوێوە بازرگانی و سەودایان لەگەڵ بەغداو مووسڵ و بەسرادا دەکرد، **(لە ڕووی سەربازی و جەنگیشەوە، خۆی سازو تەیار کرد، ئەوە بوو لە شاری جزیرە، دوو کارگەی بۆ چەک و باروت دروست کردن دامەزراندو پۆلێ قوتابیشی ناردە ئەوروپا بۆ شارەزا بوون لە چەک و تەقەمەنی و پێویستییەکانی جەنگ و کار تیاکردنی و دەستیشی کرد بە دروست کردنی پاپۆڕ، بۆ پاپۆڕەوانی لە زەریاچەی وان دا تەنانەت بەپێی هەندێ سەرچاوە، ئاڵای کوردستانیشی بەرز کردبۆوە تا لە نێو میرنشینەکەیدا بشەکێتەوە)**[112].

هەروەها سیستەمێکی چوست و ڕێکوپێکی کارگێڕیشی لە میرنشینییەکەدا دامەزراند، بە درێژایی ماوەی حوکمی ئەو هیچ کارێکی دزی و جەردەیی ڕووی نەدا، بەوەش ناسرا بوو **(کە حەزی لە دادپەروەری دەکردو هەوڵی دەدا یەکسانی لە نێوان دانیشتوانی میرنشینەکەیدا بەبێ جیاوازی لە ئایین و ڕەگەزدا بپارێزێ و هەر لە یەکەم ڕۆژی جڵەوگرتنە دەستی میراتییەوە فەرمانی دەرکرد بوو کە ڕێگا نەدرێ کەس بە زۆر جل و بەرگێکی تایبەتی پێ لەبەر بکرێ و ئەوەش قەدەغە بکرێ، ئەگەر سوارەیەکی دیان، سەرکردەیەکی پیادەی کورد ببینێ ئەبێ ئەو دابەزێ و سەرکردە سوار ببێ و گەلێ ڕەوشت و خوی تری کۆن و... هانی ژن و ژنخوازیشی ئەدا لە ئافرەتی ئەرمەنی و نەستوریان)**[113].

لە هەمووشیان گرنگتر یەکێتییەکی پیرۆزی بەرەو ڕووی بابی عالی پێکەوەنا،

لە هاوپەیمانێتی میرنشین و خێڵ و هێزە کوردییەکان و، یەکێتییە پیرۆزەکەی گەیشتە کوردستانی ئێران، کە میرنشینی ئەردەڵانیشی گرتبۆوە.

بەم جۆرە تێکشکاندنی ئەو، کارێکی وا ئاسان نەبوو بەو هێزانەی عوسمانی بکرێ کە بۆ نەهێشتنی پەیمانی پیرۆزی ئەو و لەناوبردنی میرنشینە سەربەخۆکەی هێرشیان هێنابوو، هێزەکانی عوسمانی بە هۆی میر یەزدان شێری ئامۆزایەوە - واتە ئامۆزای بەدرخان و سەرکردەی سوپای دەستە ڕاستی- پایتەختەکەیان لە ساڵی ١٨٤٧دا داگیر کرد **(بەم جۆرە هەر بە شەڕ کردن بە خۆی و (٥) هەزار جەنگاوەرەوە بەرەو قەڵاکەی (ئەروخ) بە شەڕەوە ڕۆیشت، لە نێو ئەو قەڵایەی کە بە تۆپ و تفەنگ و ... بەرد ئابڵوقە درابوو، مایەوە تا لە ئاکامدا خۆی بە دەستەوە داو بەر لەوەی - پاشتر - ڕێی پێ بدرێت بگەڕێتەوە سووریا، بۆ دورگەی کریت دوور خرایەوە کە (تا کاتی مردنی لە ساڵی ١٨٧٠) هەر لە دیمەشقدا مایەوە** [١١٤]**، کە لە گۆڕستانی مەولانا خالید لە گەڕەکی کوردانی شاری دیمەشق نێژرا، دواتر هەر لە تەک ئەودا، کەسانی دیکەی خانەوادەکە، لەوانە جەلادەتی کوڕی و، ڕەوشەن خانیش، هەر لەوێدا نێژران)** [١١٥].

بەدرخان پاشا [١١٦] - بە گوتەی مەیجەر نۆئێل - نەوەد کوڕ و کوڕەزای لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە، کە چالاکیی سیاسی و ڕۆشنبیریی نەتەوەییان گەیشتە سەراپای کوردستان و ئەرمەنستان و گورجستان و رووسیا و تورکیا و سووریا و میسر و زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا، لە هەموویان بەرچاوتر، هەردوو کوڕەکانی میقداد مەدحەت و عەبدولڕەحمان کە پێکەوە ڕۆژنامەی (کوردستان)یان لە ساڵانی نێوان ١٨٩٨ و ١٩٠٢دا دەرکردووە و، هەر سێ کوڕەزاکەیشی جەلادەت، کامەران، سورەیا ڕۆڵەی ئەمین عالی بەدرخان.

بەر لەوەی بێینە سەر باسی ڕۆژنامەی (کوردستان)، کارێکی بەسوودە بە هەندێ لە دەسکەوتەکانی ئەندامانی ئەم خانەوادەیەدا بچینەوە:

١- هەر یەک لە کەنعان پاشاو، عوسمان پاشای کوڕانی بەدرخان پاشا لە سەرکردایەتیی ئەو هێزانە یاخی بوون، کە لە شەڕی تورک- رووسی ساڵی

١٨٧٧ز دا لەژێر فەرمانی خۆیاندا بوون، ئنجا گەڕانەوە کوردستان و لە دەڤەری جزیرەدا کاروباریان گرتە دەست و (سەربەخۆیی کوردستان)، کە ئاواتی باوکیان بوو، رایان گەیاند.
٢- ساڵی ١٩١٠ حوسێن پاشاو، حەسەن بەگ (کوڕانی بەدرخان) بە نوێنەری کوردستان هەڵبژێردران.
٣- کامیل بەگ و ، عەبدولڕەزاق بەگ (کوڕانی بەدرخان)، بە یارمەتیی رووسەکان لە ساڵی ١٩١٨دا بوونە حاکمی بەتلیس و ئەرزەڕۆم.
٤- جەلادەت و کامەران و سورەیا (کوڕانی ئەمین عالی بەدرخان) لە ساڵی ١٩٢٥دا گەڕانەوە کوردستان و لە شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیراندا بەشدارییان لە ڕێکخستنی شۆڕشگێڕاندا کرد.
٥- جەلادەت کوڕی ئەمین عالی بەدرخان لە ساڵانی نێوان ١٩٣٢- ١٩٤٣-دا لە دیمەشق گۆڤاری (هاوار)ی دەرکرد، هەروەها لە ١٩٤١یشدا گۆڤاری (روناهی)ی لە دیمەشق دەرکرد. گشت کارەکانی هەردوو گۆڤارەکە، هەر لە جێبەجێ کردنەوە تا دابەش کردن بە تەنیا خۆی دەیکرد، گەلێ کتێبیشی لە بوارەکانی ئەدەب و ڕامیاری و زمان و فەرهەنگ داناوە، زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی و یۆنانی و ئەڵمانی و فەرەنسی و ئینگلیزیی چالاک دەزانی و هەوڵیشی دەدا رووسی فێر ببێ، سەرباری کوردی کە زمانی دایکزایەتی، ڕۆڵێکی گەورەشی لە پەرەپێدانی نووسینی زمانی کوردی بە پیتی لاتینی هەبووە.
٦- ئەحمەد سورەیای کوڕی ئەمین عالی بەدرخان لە هەردوو ساڵی ١٩٠٨ و ١٩٠٩ ڕۆژنامەی (کوردستان)ی بە زمانی کوردی و تورکی دەرکردووە. ساڵی ١٩١٦یش -بەپێی ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی- گۆڤاری (ژین)ی لە قاهیرە دەرکردووە.
ساڵی ١٩١٧یش- بەپێی کتێبی (بەدرخانیو جزیرە بۆتان)- ڕۆژنامەی (کوردستان)ی[١١٧] لە قاهیرە بە ناوێکی خوازراوەوە دەرکردووە، پاشان

سکرتاریەتی گشتیی کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستانی لە قاهیرە دامەزراندووەو، لە ساڵی ١٩٢٧یش دا بەشدار بووە لە دامەزراندنی کۆمەڵەی (خۆیبوون)ی نەتەوەیی کورددا، گەلێ کتێبی بڵاوکردوەتەوەو بەپێی ڕای د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، سورەیا بەدرخان دانەری کتێبی (القضیه الکوردیه)یە، کە بە ناوی خوازراوی د. بلەج شێرکۆوە بڵاوکراوەتەوە.

٧- لە شاری ورمێ (ڕەزاییە)ی کوردستانی ئێراندا، عەبدولڕەزاق بەگ بەدرخان لە ساڵی ١٩١٢دا گۆڤاری (کوردستان)ی دەرکردووە.

٨- دکتۆر کامەران کوڕی ئەمین عالی بەدرخان ساڵی ١٩٤٣ لە شاری بەیروتدا گۆڤاری (ڕوژا نوو)ی دەرکردووە، هەروەها لە هەمان ساڵدا گۆڤارێکی دیکەی بە ناوی (ستێر)ەوە دەرکردووە و، لە ساڵانی نێوان ١٩٤٧- ١٩٧٠دا زمان و ئەدەبی کوردیی لە قوتابخانەی نێونەتەوەیی زمانە زیندووەکانی ڕۆژهەڵات لە پاریسدا گوتوەتەوە.

**(ڕۆڵی گرنگی زۆر لە بەرەبابی ئەو بنەماڵەیە لە مێژووی کورددا، پتر لەو خزمەتە دیارەی کە پێشکەش بە کولتوری نووسراوی کورد و زمانی کوردییان کردووە دەردەکەوێت، گەر، لەوەی هەر یەک لە جەلادەت عالی بەدرخان، کامەران عالی بەدرخان و سورەیا بەدرخانی برایان و، میقداد مەدحەت بەدرخانی مامیان و، عەبدولڕەحمان بەدرخان. هەروەها م. ساڵح بەدرخان لە هەمان خانەوادەدا لە بواری بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤاردا پێشکەشیان کردووەو ورد بینەوە، وەک (کوردستان) و (ئومێد) و (هاوار) و (روناهی) و (روژانوو) و (ستێر) و بەوەی ڕۆژنامەی (کوردستان) یەکەمین ڕۆژنامەی کوردییە، بە شێوەیەکی چاکتر لە ڕەهەندی ئەو خزمەتە کولتورییە دەگەین)** (١١٨).

گەر ڕای هەندێ لە هزرەوەر و ڕۆشنبیران لەبارەی ئەو ڕۆژنامەیە بەسەر بکەینەوە، ئەو کات دەکرێ سووکە بیرۆکەیەک دەربارەی بایەخی دەرچوونی بەدەستەوە بدەین:

* د. کەمال فوئاد، کە توانیی بۆ یەکەمین جار ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامەیە

کۆبکاتەوە و سەر لەنوێ چاپیان بکاتەوە، تەنها پێنج ژمارەی بزر نەبێت، کە بەم دواییە دوانی دیکەشی لێ دۆزیونەتەوە[١١٩] دەڵێ:

**- (تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم کوردی تەنیا زمانی گفتوگۆ و شیعر بووە نەک نووسین، لەبەر ئەمە دەرچوونی ڕۆژنامەی (کوردستان) لە ساڵی ١٨٩٨ز بایەخێکی تایبەتی هەیە لە مێژووی زمان و ئەدەبی نەتەوەکەماندا)**[١٢٠].

* هەرچی د. بلەج شێرکۆیە دەڵێ:

**(نیشتمانپەروەرانی کورد، ئەوانەی لە تێکڕای شۆڕشەکانی کورددا سەرنەکەوتن - کە بۆ ڕزگارکردنی کورد بوون لە چنگی حوکمی تورک و بەدیهێنانی سەربەخۆیی کوردستان و یەککرتنێکی پیرۆز - هۆیەکانی بە چەند سۆنگەیەکی جیاوازو چەند هۆیەکی دەرەکی دائەنێن، لەبەر ئەمەو، بۆ گەیشتن بە هەمان مەبەستی پیرۆز بڕیاریان دا قۆڵی لێ هەڵماڵن و لە مەیدانی سیاسەت و زانستیشدا کار بکەن. بۆ نمونە لە ساڵی ١٣١٥ی کۆچی ١٨٩٨ز بڕیاردرا ڕۆژنامەیەکی کوردی دەربچێ بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامی کێشەکەو ناساندنی گەلان و دەوڵەتان بە خواست و ئاواتەکانی، ئەوە بوو میر - مەدحەت بەدرخان - یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بە ناوی - کوردستان - دەرکرد)**[١٢١].

* جەمال خەزنەدار- دانەری ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی و سەرپەرشتیار بەسەر دووبارە لە چاپدانەوەی ژمارەیەک لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کۆنە کوردییەکان - دەڵێ:

**- (ئەو ڕێڕەوەی کە میقداد مەدحەت گرتییە بەر و ئەو مەشخەڵانەی کە بڵند بەرزی کردنەوە بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری و نەزانی و جەور و، چەسپاندنی ئازادی پەرستی و شانازی کردن بە شکۆی نەتەوەیی و ، بە گەرمەوە ڕۆیشتن بۆ وەدەست هێنانی زانست و زانیاری لە سەرچاوەکانیەوە، بووە ڕێڕەوێکی چەسپاو بۆ زۆربەی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییانەی کە دوای (کوردستان) لە هەر کوێیەکدا دەرچووبن، بە درێژایی ڕۆژگاریش ئەو مەرەکەبەی لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی پێ پڕ دەکرایەوە، هەرگیز کەم ڕووناکتر و کەم بەخششتر نەبووە لەو**

**خوێنە ئاڵەی کە لە مەیدانی قوربانیدان بۆ ئازادی و شکۆی نیشتمانی گەلی کورددا رژاوە)**[١٢٢].

* مونزیر ئەلموسلیش دەڵێ:

**-(بەدرخان پێشکەوتنی کورد و پیشەسازی پێکەوە دەبەستێتەوە، واتە ئەوان و دنیای هاوچەرخی نوێ و بنەما سەرەکییەکانی، چونکە وەک دەردەکەوێت، کەوتبووە بەر کاریگەریی رۆشنبیری و سەرەتای پێگەیشتنی لە ئەورووپا، لەوێدا رەونەقی پێشکەوتنی پیشەسازیی بەدی کرد و بایەخی ئەو پێشکەوتنەشی بۆ دەرکەوت لە بەرەوپێش بردنی گەلان و دامەزراندنی هێزی بەرهەمهێنی پیشەسازیی کاریگەر لە بزووتنەوەی خەباتی نیشتمانی و رۆیشتن بەو ئاراستەیە، بۆیە دەبینین گەلەکەی لەو پێناوەدا هان دەدات و گرنگی ئەم لایەنە بەو شێوە زووە دەخاتە روو)**[١٢٣].

* هەرچی عەلائەدین سەجادییە دەڵێ:

**- (سەدەی نۆزدەهەم خەریکی تەواو بوون بوو، لەم مێژووەدا کورد زمانەکەی بە هۆی رۆژنامەوە کەوتە سەر لاپەڕەی کاغەز ئیتر لەو وەختە بەدواوە پەخشانەکەی رۆژ بە رۆژ روخسارو ناوەرۆکێکی تری پەیدا کرد)**[١٢٤].

* لە کاتێکدا د. کەمال مەزهەر دەڵێ:

**- («کوردستان» بۆ خۆی سەرچاوەیەکی گرنگ و رەسەنە بۆ تێگەیشتنی زۆر زووی لایەنی ژیانی سیاسی و روناکبیریی کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم. زانیارییەکانی ناو (کوردستان) یاریدەی مێژوونووس دەدەن لە پەیوەندی نێوان کورد و ئەرمەن و چالاکیی نیشتمانپەروەرانی کورد لە ریزی ئیتیحادییەکان و، شوێنی سوارەی حەمیدی لە مێژووی نوێی کورددا، ئەو جۆرە باسانەی تێ بگات)**[١٢٥].

* د. ئەورەحمانی حاجی مارف لە بارەی رێنووسی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی و نووسینی ئەو دەنگە کوردییانەی لە زمانی عەرەبیدا نین، دەڵێ: **(کۆنترین دەستنووس و چاپکراوی کوردی ئەوە دەگەیەنن، کە نووسەرانی کورد وەک**

**فارسەکان، بۆ هەندێک لەو دەنگە کۆنسۆنانتانەی لە زمانی عەرەبیدا نەبوون لە ئەلفوبێیاندا نیگاریان دەست نەکەوتووە بە دانانی سێ خاڵ وەک (پ،چ، ژ، ڤ) (****) ، یاخود دانانی خەتێک وەک (گ) ، بە نموونە ، ئەو دەستنووسەی مەلا مەحمودی بایەزیدی، بە ناوی (عادات و رسومات نامەی اکرادیە) لە ساڵی ١٢٧٤ی کۆچی ١٨٥٨- ١٨٥٩ز نووسیویەتی، تێکڕای ئەو پیتە کۆنسونانتانە (بزوێنە) کوردیانەی تێدایە کە لە ئەلف و بێی عەرەبیدا نین، یاخود ڕۆژنامەی (کوردستان) کە یەکەم ڕۆژنامەی کوردییە و بە هەمان ڕێنووس چاپکراوەو پیتەکانی (پ، چ، ژ،ڤ،گ...)ی تێدا بەکار هاتووە [١٢٦]).**

* جەبار جەباری ناوەرۆک و کاروانی ڕۆژنامەکە بەم جۆرە چڕ دەکاتەوە:

- («کوردستان» ڕووی ڕاستەقینەی مرۆڤی کوردی دەنواند، کە لە ڕووی نەتەوەیی و هزرییەوە چەوساوە بوو، لە کاتی خۆیدا ئۆرگانی کوردە رزگاریخوازەکان بوو، بۆیە بەرەو ڕووی تەنگ پێ هەڵچنینێکی زۆر و هەڕەشەی دەسەڵاتە یەک لە دوای یەکەکان دەبووەوە، ڕەوشی ناجۆری ناوچەکە بە گشتی ڕاستەوخۆ کاری لە ڕەوتی ڕۆژنامەکە دەکرد، بەڵام ئەو ڕەوتە دروست و ئازادەی (کوردستان) گرتبوویە بەرو، برەوپێدانی بیروباوەڕی ئازادیخوازیی نەتەوەیی، کاری خۆی کردە سەر بزواندنی هزر و هۆشی خەڵک و جۆشدانی گیانی نیشتمانپەروەری لە دەروونی تێکڕای کورداندا، هەروەها زیندوو کردنەوەی کولتوری کوردی لە ڕێی بڵاوکردنەوەی زۆر وتاری وێژەیی و ڕۆشنبیری)[١٢٧].

پاش هەفتەیەک لە دەرچوونی ڕۆژنامەکە، گۆڤاری (ئەلهیلال)ی میسری لە ژمارەی بەشی ١٧ی ساڵی شەشەمی ئایاری ١٨٩٨ز- ١٠ی زیلحیجە ١٣١٥ی کۆچی لە لاپەڕە (٦٧١)دا، هەواڵێکی بڵاوکردبووەوە کە تێیدا هاتبوو:

(«کوردستان» یەکەمین ڕۆژنامەی کوردییە کە لە جیهاندا بە زمانی کوردی دەرچووە، میسریش شانازی بەوەوە دەکات، کە ئەو ڕۆژنامەیەی تێدا دەرچووە و، شانازی بە پێگەی خۆیەوە دەکات لە دنیای ڕۆژنامەگەریدا بەوەی گۆڕەپانێکە سەرەڕای جیاوازیی زمان و ئامانجەکان، قەڵەمەکان تێیدا دەکەونە پێشبڕکێوە،

نووسەری (کوردستان)یش حەزرەتی ڕێزدار میقداد مەدحەت بەگە، کوڕی خوالێخۆشبوو بەدرخان پاشا، لە مانگێکدا دووجار دەردەچێت، ئابوونەی ساڵانەشی هەشتا (قرش)ەو، بابەتەکانیشی هاندانی کوردە بۆ گەیشتن بە شارستانیەت و چاکە و پاڵنایان بەرەو بەدەست هێنانی زانستەکان).

(ڕۆژی پێنج شەممە ٣٠ی زیلقیعدەی ساڵی ١٣١٥ی کۆچی، ٩ی نیسانی ساڵی ١٣١٤ی ڕۆمی، کە دەکاتە ٢٢ی نیسانی [١٢٨] ساڵی ١٨٩٨ی عیسایی، لە شاری قاهیرەی میسردا، یەکەم ژمارەی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی بە چاپ گەیشت، کە لە لایەن میقداد مەدحەت بەگی کوڕی بەدرخان پاشاوە لە چاپخانەی ئەلهیلال چاپ کرا) [١٢٩].

میر میقداد مەدحەت کارتێکی پێناسەی ڕۆژنامەکەی بە زمانی فەرەنسی، هاوپێچی هەندێ دانەی یەکەمین ژمارەی ڕۆژنامەکە دەرکردو بەسەر هەندێ لە کەسایەتییەکان دابەشی کرد، لێرەدا وا دەقی وەرگێڕانەکەی بە پێنووسی د. مارف خەزنەدار دەخەینە ڕوو:

**گەورەم زۆر بەختیارم کە ژمارەی یەکەمی ڕۆژنامەی (کوردستان)تان بۆ دەنێرم، ئەوەی هەر ئێستا لە قاهیرەدا دامەزراندووە.**

**نەتەوەی من کە نەتەوەی کوردە، ژمارەی شەش ملیۆن کەسە لە ئاسیای بچووکدا. زمانیان زمانێکی گەلێک کۆنە. ئەمە بۆ یەکەمین جارە کە ئەم ڕۆژنامەیەم بەم زمانە بڵاوکردۆتەوە بۆ مەبەستی تێگەیاندنی زانیاری و گیانی خۆشەویستی لە ناو ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم، وە هاندانی کوردەکانە بۆ ئەوەی ڕێگەی پێشکەوتن و شارستانیەتی تازە بگرن، وە هەر لەو کاتەشدا، ئەدەبی نەتەوایەتیی خۆیانیان پێ پیشان دەدەین.**

**باوکم میر بەدرخان کە بەشداریی لە جەنگی سەربەخۆیی کوردستان کرد لە دژی حکومەتی عەبدولمەجید، ئەوەی کە ژیانی لە بنەماڵەی ئێمە قەدەغە کرد لە نیشتمانی خۆماندا، لەبەر ئەمە رووم کردە میسر. وە لەبەر ئەوەی دەمەوێ کە نیزام و ئاسایش باڵی بەسەر کوردستانا بکێشێ، بڕیارم دا لە ڕێگەی ئەو ڕۆژنامەیەوە**

**هەموو توانای خۆم لە دوورەوە (لە دەرەوەی وڵات) تەرخان بکەم بۆ هەموو کارێکی قازانج و بەختیاری و پەروەردە کردنی بیری تێدابێ بۆ هاووڵاتیانی کورد.**

**میر میقداد مەدحەت**

لە لێکۆڵیارێکەوە کە بە دوای ساغ کردنەوەی ڕۆژنامەکەدا گەڕاوە، ئەم چەند قسەیە وەردەگرین (ڕۆژنامەی کوردستان) کە بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٦٨ ئاشکرا کراوە، (٣١) ژمارەی لە ماوەی چوار ساڵدا لێ دەرچووە، یەکەمین ژمارەی بە چوار لاپەڕە و لە چاپخانەی ئەلهیلال لە میسر دەرچووە، بە قەبارەی (٣٢.٥×٢٥.٥٠)سم لە ڕۆژی ٣٠ی زیلقیعدەی ١٣١٥ھ (٩ی نیسانی ١٣١٤ھ.ش) بەرامبەر بە ٢٢ی نیسانی ١٨٩٨ز کە تا ژمارە پێنجی هەر لە قاهیرەدا دەرچووە.

ژمارەکانی ٦ تا ١٩ پاش تەنگ پێ هەڵچنینی بەردەوامی دەسەڵاتی عوسمانی لە ژنێف دەرچوون، چونکە ڕۆژنامەکە کەوتە دواندنی سوڵتان عەبدولحەمید بە هۆی نامەی کراوەوە (بە زمانی تورکی- لێکۆڵیار).

ژمارەکانی (٢٠-٢١-٢٢-٢٣) دووبارە لە قاهیرە دەرچوونەوە، هەرچی ژمارە (٢٤)یەتی لە لەندەن دەرچووە، ژمارەکانی (٢٥-٢٩)ش لە فۆلکستۆن دا دەرچوون (لە باشووری بەریتانیا- لێکۆڵیار)، کەچی دوایین دوو ژمارەی (٣٠-٣١) دووبارە بە سەرپەرشتیی عەبدولڕەحمان پاشای برای میقداد مەدحەت لە ژنێف دەرچوون[١٣٠].

سەبارەت بە دەرچوونیشی لە میسر، وا دیارە بارودۆخ تێیدا لەبار بووە، کە (نەک هەر تەنیا دانانی چاپخانە لە وڵاتی عوسمانیدا پێویستی بە مۆڵەت وەرگرتن هەبووە، بەڵکو مافی لە چاپدانی کاغەز و کتێبیش هەر پێویستی بە مۆڵەت هەبووە، شیاوی باسە بڵێین (چاپخانەی ئەلعامیرە) کە چاپخانەی ڕەسمیی دەوڵەتی عوسمانی بوو، لەوەدا بوو بە تەنیا ئەو مافانە بۆ خۆی قۆرخ بکات، بۆ ئەوەی ئەو چاپخانەیە لە تەنگ پێ هەڵچنین بپارێزرێت، کۆت و مەرجێکی زۆر

خرایه سەر چاپ، بەڵام بە دەرچوونی ڕێساکەی ٧ی ڕەجەبی ١٢٧٣ (ساڵی ١٨٥٦ز)و مافدان بە گشت کەسێک بۆ چاپ کردنی کتێب ئەو قۆرخکارییە ڕەت کرایەوە. سەرباری ئەوە، ئەو (ئیرادە سونەتییە)ی لە ٢١ی ئۆگیستۆسی ١٣٢٤ (ساڵی ١٨٩٨ز)دا دەرچوو، چاپخانە و کتێبکارانی خستە بەر چاودێریی پۆلیسەوە، بێ لەو کۆتە قورسانەی ڕێسای ٢١ی جەمادی ئاخیرەی ١٣١٣- کانوونی یەکەم (دیسەمبەر)ی ١٣١٠ (١٨٩٣ ز) خستییە سەر چاپخانەکان و فرۆشتنی کتێب) [١٣١].

سروشتی عوسمانییەکان وابوو (هەموو شتێکیان بە ئارەزووی خۆیان دەگۆڕی، تەنگیان بە ژیانی ئەو نەتەوەیە هەڵدەچنی کە دەچوونە نێوی، بە ڕادەیەک خەڵکەکە نەیان دەتوانی سەر هەڵبڕن، کەمترین گومان دەبووە هۆی خوێن ڕشتن، بچووکترین تۆمەتیش ئەشکەنجەی بەدوادا دەهات، والییەکان هەر بە سیخوڕان حوکمی وڵاتیان دەکرد، هەر لەسەر خراپەکاری و پشت گوێ خستنی عەرەب (بە هەق گشت ئەو گەلانەی لەژێر دەسەڵاتیاندا بوون- لێکۆڵیار) دەڕۆیشتن و گەلێ قسەی ساردو سووکیان بۆ بە کەم زانینیان هەڵبەستا، هەموو خەمیان ئەوە بوو هەستی نەتەوایەتییان بپلیشێننەوە و زمانیان ڕەش بکەنەوەو کولتووریان بشێوێنن. هەر کەسێک ڕووی بکردایەتە ئەو وڵاتە ئەژنۆی دەهاتە لەرزین، مرۆڤ هەموو تەمەنی لە سایەی ترس و لەرزدا بەسەر دەبرد، نەبادا ببوایەتە خۆراکی ماسی، یاخود تورهەڵدرێتە گۆشەیەکی نادیاری وڵاتە دوورەکان و لەوێشدا هێواش هێواش بەرەو مەرگ بچێت. بەم جۆرە خەڵکی خودان قەڵەم لەم سەردەمە تاریکەدا لەژێر حوکمێکی ڕەهای چەوت ژیاون، وەک خەڵکانی دی جۆرەها جەور و ستەمیان کێشاوە، وەک ئەندامانی کۆمەڵگای عوسمانی لە بن باری نەبوونی ئاسایش و مەحفەوە بوونی داددا ناڵاندوویانە، لەو ساڵانەی سەرەتادا بە جۆرێک دەژیان، کە لە نەفەوتانی هەقێک دڵنیا نەبوون، بە لاشیانەوە سەیر نەدەبوو کە ناهەق سەردەکەوت، جا شتێکی سروشتی بوو کە ڕۆژنامەکان شتێکیان نەدەگوت بێ لەوەی کە پێیان دەگوترا، لە پێدا هەڵگوتنی حوکمڕانان و بە پیرۆز زانینی ملهوڕیی

زاڵمـان، مـەرایی خـودان ڕۆژنامـەکـانی بەرەو پایەی بڵند بەرز دەکـردەوە، چونکە مەزنایەتی لەو سەردەمە تاریکەدا پەیوەست بوو بە سیـخوڕی و بەرتیل و درۆ و بە ناهەق خواردنی سامانی خەڵک)[132].

هەرچی میسر بوو، پاش ئەوەی سوپای ئینگلیز لە ١٨٨٢دا داگیری کرد، بەپێی گوتەیەکی کوردیی د. کەمال مەزهەر[133] **(دەسەڵاتی عوسمانی دەنگی ماو ڕەنگی نەما)**، بەڵکو میسر لەو کاتەدا کە ڕۆژنامەی (کوردستان)ی تێدا دەرچووە، لە ڕەونەقدارترین سەردەمی ئازادیی ڕۆژنامەوانیی دا دەژیا، کە بە (ڕەهاکردنی تەواوی ئەو ئازادییە)[134] بەرجەستە بوو، یاسای چاپەمەنی لە میسر ساڵی ١٨٨١ز بە مەبەستی ڕاگرتنی لێشاوی ڕۆژنامە نیشتمانییەکان و تەکانی شۆڕشگێڕییان و لەباربردنی ئازادیی ڕۆژنامـەوانی دەرچوو[135]. لەبەر چەندین هۆ بەریتـانییـەکان پەکیان خستبوو، لەوانەیە بەرژەوەندیی وڵاتە ئەوروپاییەکان لە میسردا لە پێشەوەی ئەو هۆیانەوە بێت، کە بووە (بەربەستێکی دابڕ لە بەردەم جێبەجێ کردنی یاسای ناوبراودا (یاسای چاپەمەنیی ساڵی ١٨٨١ ز/ لێکۆڵیار) لەسەر ئەو ڕۆژنامانەی کە ئەوروپاییەکان دەریان دەکردن یان لە وڵاتەکەدا هی ئەوان بوون)[136]، سەرباری ئەو ململانێ ژێراوژێرەی نێوان کرۆمەر - کونسولی گشتیی بەریتانیا لە میسر و خدێوی عەباسی دووەم[137] و، پەرەسەندنی بزاڤی نیشتمانی لە میسر لەتەک (لیبراڵیەتی) خودی کرۆمەردا- کە شتێکی گرنگە- و هەر لە سەرەتاوە ئەوەی نەسەلماند ئازادیی ڕۆژنامەوانی کۆت و بەند بکرێت، لە ڕاپۆرتی ساڵانەی دەربارەی ساڵی ١٩٠٣دا نووسیویەتی (وام دەهاتە پێش چاو، ئەو پاساوانەی داوای کۆت و بەند کردنی ڕۆژنامەگەری دەکەن لەگەڵ ئەو پاساوانەی داوای ئازادیی دەکەن هاوتا نین، هەروەها گەورە پیاوانی حکومەتیش توانای ئەوەیان هەبوو بەرگەی ڕەخنەی ڕۆژنامەکان بگرن)[138].

(بێ گومان ئەو لایەنە ئیجابیانەی لەو ئازادییە کەوتبووەوە گەورە بوون، تا ڕادەیەک لە ساڵی ١٩٠٥دا دەسەڵاتداران کەوتنە بیرکردنەوە کە ڕۆژنامەگەری کۆت و بەند بکەن)[139].

هەڵبەت یەکێ لەو لایەنە ئیجابیانە ئەوە بوو ڕۆژنامەگەریی ئۆپۆزسیۆنی دژ بە سوڵتانی عوسمانی توانای بە ئازادی کارکردنی هەبوو بە تایبەتی کە ئینگلتەرا پاراستنی ئەندامانی حزبی تورکیای لاوی چەسپاندو گرتییە ئەستۆی خۆی کە پەنایان بۆ میسر هێنابوو، جا (لە ئاکامی ئەو چاودێرییەی کرۆمەر لەو ئازادیخوازانەی تورکی دەکرد، لایەنەکای جولانەوەی دژ بە عەبدولحەمید لە میسردا گردبوونەوە، ئەو کەسانە لە هەموو شوێنێک: لە ژنێف و پاریس و لەندەن، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەیان لەگەڵ ئازادیخوازانی عوسمانی کەوتنە دانوستاندن)[١٤٠].

جا ڕۆژنامەگەری ئەو (تاکە ئامرازە بوو، کە ئازادیخوازانی عوسمانی دژی سوڵتان بە دەستیانەوە بوو، هەر بەم چەکە بەردەوام بەرەنگاری دەوڵەتی دەربار (العلیە - مەبەستی عوسمانییە - لێکۆڵەر) دەبوونەوەو بۆ ماوەیەک کە تێیدا عەقڵی تورکەکانیان بۆ پێشوازی لە سەردەمێکی نوێ ئامادە دەکرد کە تەواو جیا بوو لەگەڵ ئەوەی پێشتر لە سەردەمی سوڵتانەکان لە سەری ڕاهاتبوون)[١٤١].

بە ڕاستی میسر شیاوترین شوێن بوو کە ڕۆژنامەی (کوردستان)ی لێ دەربچێ، چونکە نیشتمانی هەمووان بوو، لە ڕووی ڕەسمییەوە سەر بە سوڵتانی تورکیا بوو، بەڵام بە کردار چەند لایەنێک حوکمیان دەکرد، لە لایەک ئینگلیزی داگیرکەر بەهێز بوو، لە لایەکیش دەسەڵاتی ڕۆحیی عوسمانی بوو، لە لایەکی دی ئیمتیازاتی بیانی بە تایبەتی فەرەنسی بوو، لە لایەکی دیکەشەوە خدیۆی کە بە تەواوی ملکەچی سوڵتان نەبوو، هەرچەندە شەرعیەتی بوونی ئەو لە ترۆپکی دەسەڵاتدا پشتی بە فەرمانێکی سوڵتانی عوسمانی دەبەست... دواتر و - لە هەمووان گرنگتر- هەبوونی زۆر لە جالیەی بیانی و بە تایبەتی- کە بە لای ئێمەوە گرنگن- جالیەی تورک و ئەرمەن و کوردی [١٤٢] نەیاری سوڵتان و سوودمەند لە سیاسەتی ئینگلیز و لە ململانێکانی ئەو مەیدانە گرنگەی سەبارەت بە ئەوان کە میسر بوو، بۆ ململانێ گشت ئەو لایەنانە، ڕۆژنامەگەرییان کرد بووە مەیدانی سەرەکیی خۆیان، جا چ ڕۆژنامەگەریی میسر بووایە یان ئەو ڕۆژنامەگەرییەی غەیرە میسری لە میسردا دەریان دەکرد، هەروەها خۆیشی میسر وەک وڵاتێک بە هەنگاوی مکۆم

بەرەوپێش دەچوو **«میسر بییە باژێرەک حەوقاس مەزن و خۆش هەتا مرۆڤ نەبینە، مرۆڤ نەکارە ب وەسفا وێ بزانییە» «نهۆ نیڤا میسرێدە ژ خەلکێ میسرێ حەوقاس خوەنداو عالم هەنە حەوقاس مرۆڤێن خوی سنعەت و هونەر هەنە گەلەک معوەزی باژێر ئەو خوە چێ دکن، نیڤ میسریادە مرۆڤ هەنە تۆپ و تفەنگا چێ دکن»**[١٤٣].

ئەو پێشکەوتنەی میقداد مەدحەت لە لای میسرییەکاندا بینی بووی، کە کوردی نەتەوەی خۆیشی پێی وابووە لە میسری کەمتر نییە، هەروەها **«کورد ژ میسریا جامێرترن هش و عەقلێ وان زێدەترە هەمی تەخلیدا کورد ژ میسریا قەنجترن. دەڤێجا چرە خەلکێ میسرا ژ کوردا دەولەمەتر بن»**[١٤٤].

ئەم شتە پاڵنەرێکی دیکە بوو بۆ خودانی (کوردستان) بۆ ئەوەی **(لە پێناو پێشکەوتنی کورد و فێربوونی پیشە = کردلری ایقاظ و تحصیل صنایعە تشویق ایچون شمیدلک**[١٤٥]**)** کار بکات. جا بۆ بەدی هێنانی ئەم ئامانجە (دوو هەزار دانەی لە هەر ژمارەیەک دەنارد کوردستان بۆ ئەوەی بە خۆڕایی بەسەر خەڵکدا دابەش بکرێت) هەر وەک لە سەرووی لاپەڕە یەکدا لەگەڵ زانیارییەکانی دیکەی پەیوەست بە ناونیشان و ئابوونە و هەندێ شتی دیکەدا نووسراوە.

میقداد مەدحەت، ئا لەو کاتە زووەدا، بە تەواوی درکی بە کارەکەی خۆی دەکرد، ئەوەتا هەر خۆی لە سەروتاری ژمارە یەکدا دەڵێ: **(کورد ژ گەلەک قەوما زێدەتر خوەی هش زەکانە، جامێرن، دبنێن خوە، دا راست و قەوینە خورتن و دیسا وەکە قەومێن دی نەخوەندانە. نە دەولەمەند. دنیایێدە چ دبە جیران وان مسقوف (خەڵکی مۆسکۆ - لێکۆڵەر) چا وەیە وی چ بکە نزانن، لەوما ریا خودێدە من ئەڤ جەریدەیا ها نڤیسی بئیزنا خودێ تەعالا پاش نهۆ هەر پازدە رۆژە دە جارەکی ئەزێ جەریدەکی بنڤیسم. ناڤ ڤی من کریە (کوردستان). ڤی جەریدە پێدە ئەزێ بەحسا قنجیا علم و مەعرەفەتا بکەم. لکو دەرێ مرۆڤ د عەملە، لکو دەرێ مەدرەسەو مەکتەبن قەنج هەنە ئەزێ نیشا کوردا بکەم، لکو دەرێ چە شەڕ دبە دەولەتێن مەزن چ دکەن چاوا شەڕ دکەن. تجارەت چەوا دبە؟ ئەزێ حەمیا حکات دکەم. حەتا نهۆ کەسی هولی نەنڤیسیە ئەڤ جەریدەیا من ها عەوەلییە لوما وی**

**گەلەک کیمایی هەبتن. ئەز هێڤی دکەم کیمایا جەریدەیی ژمنرە بنڤیسن)**[١٤٦].

ڕۆژنامەکە تا دوا ژمارە پابەندی ئەم پەیڕەوی خۆی بوو، لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجە بەرزەکەی پەنای دەبردە بەر ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر و دەست گرتن بە بنەماکانی ئایینی ئیسلام، بۆ ڕەچاوکردنی ئەو دینداریيە گەرمەی خەڵک و بە تایبەتی کە کورد پابەندو پێوەی پەیوەست بوون. **(بەپێی توانا (کوردستان) بە هەر ڕێگەیەکەوە بۆی لوابێ هەوڵی داوە هەستی کورد بە شێوەیەکی دیموکراسیانە بیزوێنێ، لەبەر خاتری ئەم مەبەستە زۆر لاپەڕەی کوردستان بۆ باسی ئەدەب و مێژووی کورد تەرخان کراون و بە بەیتی پڕ مانای (مەم و زین)ی خانی ڕازاندویەتیەوە)**[١٤٧]. بەهەر حاڵێک بێت (کوردستان) توانیی ئامانجەکانی خۆی بهێنێتە دی، لە هەندێ لەو نامانەی تێیدا بڵاوکراونەتەوە و هەندێ لە تێبینییەکانی خودی ڕۆژنامەکەوە ڕوون دەبێتەوە، ژمارەیەکی بەرچاو خوێنەری سەرگەرم و تەنانەت ئابوونەداریشی لە دەڤەرەکانی کوردستاندا هەبووە، بە تایبەتی لە سلێمانی و دیاربەکر و ئەدەنە. هەرچی دانە بە خۆڕاییەکان بوو، دەگەیشتنە دەست سەرەک هۆز و زانا و ڕۆشنبیرانی کورد، ئەویش بە شێوازی جۆراوجۆر کە لەوانەیە هەندێ لە نیشتمانپەروەرانی تورک و ئەرمەن ڕۆڵیان تێدا هەبووبێت[١٤٨]. ئەم شتەش لەوەدا بەدیار دەکەوێت، بەردەوام بوونی ڕۆژنامەکە لە دواندنی (میر و ئاغا و سەرکردە و زانا کوردەکان) بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بۆ ئەوەی ببنە هۆکاری گەیاندنی ناوەڕۆکی بابەتەکانی ڕۆژنامەکە بە گشت خەڵکە سادە و ساکارەکە.

میقداد مەدحەت و، عەبدولڕەحمان بەگ، کوڕانی بەدرخان پاشا دەروازەی سەدەی بیستیان بەرەو ڕووی هەموو کورددا کردەوە، جا ئەوان، واتە کورد چووبن یا نەچووبن، کاروانی ڕۆژنامەگەریی کوردی بە دەرچوونی (کوردستان)[١٤٩] دەستی پێ کرد.

## پەراوێزەکانی باسی دووەم

٨٥- عەلائەدین سەجادی (١٩١٥-١٩٨٣) لەدایک بووی سلێمانی، دوازدە کتێبی لە بواری ئەدەب و مێژوو چاپ کردووە، بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری (گەلاوێژ) و سەرنووسەری گۆڤاری (نزار) بوو، لە (بەشی کوردی)ی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا وانەبێژ بووە، ئەندامی کۆڕی زانیاری کورد بووە.
٨٦- عەلائەدین سەجادی، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨، ل٤.
٨٧- هەمان ژێدەر، ل١٤٦- ١٤٧.
٨٨- جلال الطالبانی، سەرچاوەی پێشوو ل٦٨.
٨٩- هەمان سەرچاوە ل٦٩.
٩٠- بڕوانە: محمد أمين زكي، تاريخ اسدول و الاصارات اسكوردية في اسعهد الاسلاصي (ترجمة صحمد علي عوني)، اسقاهرة، ١٩٤٥.
٩١- الموصلي، ژێدەری پێشوو، ل٢١٣.
٩٢- قاسملو، ژێدەری پێشوو، ل٤٧. (کە لە لاپەڕە ٦٥ی کتێبی شۆڕشەکانی کوردی عەلائەدین سەجادی، بەغدا، ١٩٥٩ وەریگرتووە. ع.ز)
٩٣- د. بلەج شێرکۆ: اسقضية اسكوردية، صاضي اسكورد و حاضرهم، اسطبعة الاوسي، صطبعة اسسعادة بجوار صحافظة صصر، ١٩٣٠، ص٤٤.
٩٤- دەکرێ بڵێین ئەم دیاردە خراپە لەوساوە لە نێو ژیانی کورددا چەسپاوە تا ئێستاش ئەم جۆرە ململانێ خوێناوییە لە نێوان هێزە کوردییەکاندا بەرپا دەبێت، لێکۆڵیاریش لەو باوەڕەدایە دیاردەی ناتەبایی لە نێو رۆشنبیرانی کورددا، ئەوەی کە د. کەمال مەزهەر لە وتاری (دەردە کورد- لە مسس بێڵەوە تا مەحمود زامدار) لە بارەیەوە دواوە، کە لە رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە ١١٨٩ لە ١٤/٦/١٩٩٠بڵاو کراوەتەوە، یەکێکە لە پاشماوە یا ڕەنگدانەوەکانی ئەم حاڵەتە.
٩٥- لە پتر لە بۆنەیەکدا د. کەمال مەزهەر بە لێکۆڵیاری ڕاگەیاندووە، بەم دواییەو بە دەلیلی بەردەست گەییوەتە ئەوەی کە د. بلەج شێرکۆ، سورەیا بەدرخان خۆیەتی.
٩٦- د. بلەج شێرکۆ، ژێدەری پێشوو، ل٣٤-٣٥.
٩٧- مینۆرسکی، ژێدەری پێشوو، ل٢٦.
٩٨- هەمان ژێدەر، ل٢٦.
٩٩- شێخ عوبێدوڵڵای نەهریی شەمزینی، کوڕی شێخ تاهیری ئۆراماری کوردستانی تورکیایە، دەسەڵات و ڕێزێکی زۆری هەبوو لە سەراپای کوردستاندا، کاتێک داوای بەستنی کۆنگرەیەکی عەشیرەتە کوردەکانی لە گوندی نەهری لە تەمموزی ١٨٨٠ کردووە، عەشیرەتەکان بە دەنگییەوە چوون، بڕیاردرا (کۆمەڵەی هۆزە کوردەکان) دابمەزرێت، ئینجا شۆڕشی دژ بە سوڵتانی عوسمانی بەرپا کرد و ناوچەیەکی فراوانی لە کوردستانی ئێرانیشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەڵام لەبەر هاودەستیی نێوان ئێران - تورکیا- رووسیا - بەریتانیا شۆڕشەکەی لەبار براو، دوای دەسگیرکردنی بۆ شاری (مەککە)دوور خرایەوە تا لە ساڵی ١٨٨٢ز لەوێدا کۆچی دوایی کرد.
١٠٠- جلال الطالبانی، هەمان سەرچاوە، ل١٩٣.
١٠١- هەمان سەرچاوە ل١٩٧.
١٠٢- شێخ عوبێدوڵڵای نەهری یان شەمزینی.
١٠٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٩٤-١٩٥.

١٠٤- بڕوانە: فوئاد حوسێن ئەحمەد، هۆنراوەی نیشتمانی لە ئەدەبی کوردیدا- لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا ١٩٤٥.
١٠٥- ئەو دوو کەسە (عەبدوڵڵا جەودەت) و (ئیسحاق سکووتی) بوون.
١٠٦- بڕوانە: د. عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات و المنظمات الكورديه خلال نصف قرن، بغداد، ١٩٨٩.
١٠٧- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، ل٤٠.
١٠٨- جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، بەغدا، ١٩٧٣، ل١٢.
١٠٩- د. جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، د. کاوس قەفتان کردویە بە کوردی و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، بەغدا، ١٩٨٧، ل١٢٦.
١١٠- مەیجەر نوئێل لە یاداشتەکانیدا مێژووەکەی بە ١٥١٢ز دیاری دەکات، واتە لە سەردەمی باپیرە گەورەی خانەوادەکە شا عەلی بەگ (بڕوانە: حوسێن ئەحمەد جاف و، حوسێن عوسمان نێرگسەجاڕی)، یاداشتەکانی مەیجەر نوئێل لە کوردستان (وەرگێڕان)، بەغدا، ١٩٨٤، ل١٤٦).
١١١- ناوبانگی خانەوادەی بەدرخانیانە، عەزیزیان ناوی گوندێکی بچووکی نزیک بە شاری جزیرەیە، کە لە جزیرەی ئیبن عومەر لە سەرووی ڕووباری دیجلە دایە و ئێستا کەوتوەتە سەر سنووری سوریا (نزیک بە سنووری تورکیا- سووریا).
١١٢- مالمیسانژ، بدرخانیو جزیره بۆتان (ترجمه شکور مستەفا)، اربیل، ١٩٩٨، ص٣٩.
١١٣- د. بلەج شێرکۆ، ژێدەری پێشوو، ل٥٣.
١١٤- لە کتێبی (بدرخانیو جزیره بوتان)دا هاتووە، مێژووی کۆچی دوایی بە ساڵی ١٨٦٩ز داناوە، هەڵبەت لەم بارەیەوە ڕای تریش هەیە.
١١٥- دیمانەیەکی تایبەتە لەگەڵ سینەم خانی کچی جەلادەت بەدرخان لە بەرواری ١٠/٥/١٩٩٩. (دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین هەڵەیەک لێرەدا هەیە، چونکە جەلادەت نەوەی بەدرخانە نەک کوڕەتی. هەر لێرەدا دوای ئەم هەڵەیە ناوبراو بە کوڕەزای دانراوە کە ئەوە ڕاستییەکەیەتی - ع.ز).
١١٦- گەلێ ڕا هەیە دەربارەی ژمارەی ژن و منداڵەکانی.
١١٧- بەم دواییانە د. کەمال فوئاد ژمارەکانی لە سلێمانیدا کۆکردەوە و لە چاپیشی دانەوە، بە سێیەم قۆناغی ڕۆژنامەی (کوردستان)ی دایکی داناوە.
١١٨- مالمیسانژ، ژێدەری پێشوو، ل٧.
١١٩- د. کەمال فوئاد، کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی، ١٨٩٨- ١٩٠٢، بەغدا، ١٩٧٢، ل٣.
١٢٠- بێگومان زمانی کوردی مێژوویەکی لەوە چاکتر و زۆر کۆنتری هەیە، بەڵام ئەم ڕایە ڕۆشنایی دەخاتە سەر ڕۆڵی ڕۆژنامەکە لە پەرەپێدانی نووسین و ڕێنووسی کوردیدا.
١٢١- د. بلەج شێرکۆ، ژێدەری پێشوو، ل٥٠.
١٢٢- جەمال خەزنەدار، ژێدەری پێشوو، ل١٢.
١٢٣- الموصلي، المصدر السابق، ص٣٦٠.
١٢٤- عەلائەدین سەجادی، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، ل١٨٢.
١٢٥- د. کەمال مەزهەر، مێژوو، بەغدا، ١٩٨٣، ل١٣٥.
١٢٦- د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، نووسینی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی، بەغدا، ١٩٨٥، ل٢٥-٢٦.
١٢٧- جبار الجباري، تأريخ اسصحافة اسكردية في اسعراق، بەغداد، ١٩٧٥، ل٨.
١٢٨- ڕۆژنامەگەریی کوردی و ڕۆژنامەنووسانی کورد لە عێراقدا، هەموو ساڵێک لەم بەروارەدا یادی جەژنی ڕۆژنامەگەریی کوردی دەکەنەوە.

١٢٩- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٨، ل٥٨.
١٣٠- عبدالرحمن پاشا، قراءات في (كوردستان) بعد قرن من الزمان، جريده العراق في ٢٤ نيسان ١٩٩٠، دووبارە لە (خەبات) لە هەولێر ١٩٩٩ لە دوو ژمارەدا بڵاوی کردۆتەوە. (ئەوەی ڕاستی بێ ئەم وتارە دووبارە لە ساڵی ١٩٩٨دا بڵاوکراوەتەوە - ع. زەنگەنە).
١٣١- د. عبداسلة اسماعيل اسبستاني، حرية اسصحافة- دراسة صقارنة، اسقاهرة، ١٩٥٠، هاصش ص١٠٢.
١٣٢- د. احسان عسكر، نشأة اسصحافة اسسورية، دار اسنهضة اسعربية، اسقاهرة، ١٩٧٢، ص١٠.
١٣٣- د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، ل٥٦.
١٣٤- د. خليل صابات (و د. ساصي عزيز و د. يونان سبيب رزق)، حرية اسصحافة في صصر ١٧٩٨- ١٩٢٤، اسقاهرة، ١٩٧٣، ص١٢٦.
١٣٥- هەمان ژێدەر، ل٦٧.
١٣٦- هەمان ژێدەر، ل١٢٩.
١٣٧- ڕۆژنامەگەری لە میسردا زۆر گەشەی کرد بوو، چ لە ڕووی ژمارەی ڕۆژنامەکانەوە یا ژمارەی چاپخانە و ئازادیی فەراهەم بوو، هەر لایەنێک لە دوو لایەنی ململانێکان ڕۆژنامەی تایبەت بە خۆیان هەبوو، کە دژ بە لایەنی بەرامبەر ئاراستەی دەکرد.
١٣٨- هەمان ژێدەر، ل١٢٨.
١٣٩- هەمان ژێدەر، ل١٣٢.
١٤٠- د. ساصي عزيز، اسصحافة المصرية و صوقفها صن الاحتلال الانجليزي، اسقاهرة، ١٩٦٨،ص١٨٠.
١٤١- هەمان ژێدەر، ل١٨٠.
١٤٢- عەبدوڵڵا جەودەت، کە کوردە و یەکێکە لە دامەزرێنەرانی (تورکیای لاو)، ڕۆژنامەی (اجتهاد)ی بە زمانی عەرەبی لە هەمان ماوەدا لە قاهیرە دەرکردووە.
١٤٣- ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە یەک، ل٣.
١٤٤- هەمان ژێدەر.
١٤٥- دروشمی ڕۆژنامەکەیە لە خوارووی ناونیشانەکەی (کوردستان) لە هەموو ژمارەکانی ڕۆژنامەکەدا دەنووسرا، وێڕای گۆڕانی ڕستەکان، بەڵام هەر لە پاڵپشتی کردنی زانست و هونەر و پیشەسازیدا بەردەوام بوو.
١٤٦- بەڕێز سەلاح سەعدوڵڵا دەقی تەواوی یەکەمین ژمارەی پێداین کە هەر خۆی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.
١٤٧- د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی، ل٦٦.
١٤٨- هەمان ژێدەر، ل٦٨.
١٤٩- ساڵی ١٩٠٢ لەبەر چەند هۆیەکی نادیار ڕۆژنامەکە لە دەرچوون وەستاوە، لەوانەیە هۆیەکان مادی بن یاخود لەبن باری گوشاری عوسمانیدا بوو بێت، هەموو ژمارەکانی دوو جار چاپ کراونەتەوە: یەکەمین جار د. کەمال فوئاد بە پێنج ژمارەی کەمەوە بە ناونیشانی (کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ١٨٩٨- ١٩٠٢) ساڵی ١٩٧٢ لە بەغدا بڵاوی کردەوە، سەر لەنوێ مەحمود زامدار، دوای ئەوەی دوو ژمارەی دیکەی لە ژمارە ونبووەکانی خستە سەر، کە ژمارە (١٧ و ١٨) بوون و بە ناوی (کوردستان-ی دایک) ساڵی ١٩٩٨ لە هەولێر چاپی کردەوە، هەرچی ژمارەکانی

(١٠،١٢،١٩)یە تاکو ئێستا هەر بزرن.
خانەوادەی بەدرخانیان ساڵی ١٩٠٨ ڕۆژنامەیەکی دیکەیان بە ناوی (کوردستان) دەرکردووە، کە ژمارەکانی تا ئێستاش بزرن، هەرچەندە د. کەمال مەزهەر گومان لەم زانیارییە دەکات، بەڵام د. کەمال فوئاد ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامەیەی بە (کوردستان) ناوزەد کرا و لە ١٩١٧ لە ئەستەمبوڵدا دەرچووە، کە دووبارە بە هەمان ناوەوە لە سلێمانیدا ساڵی ١٩٩٨ بە چاپی گەیاندەوە، بە سێیەم قۆناغی ئەو ڕۆژنامەیەی دادەنێت.

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ

* دیارە پەیوەندیی نێوان کورد و عوسمانییەکان لەسەر بنەمایەکی ناهاوسەنگ بوو، کوردەکان هەمیشە پشتیوان بوون بۆ گەشەکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەر بنەمای هاوبەشی بیروباوەڕی ئایینی، کەچی ئەوان بەرامبەر بە کورد- وەک هەموو دەسەڵاتێکی زەبەلاح و خاوەن هێز- زەبر و زەنگ و سەرکوت کردنیان گرتەبەر.

** لە دەقە عەرەبییەکەدا لە بری (اسسیاسیة) نووسراوە (الاساسیة)، بێگومان دەبێ هەڵەی چاپ بێت، بۆیە من لە وەرگێڕاندا زاراوەی یەکەمم ڕەچاوکرد نەک هەڵەی چاپەکە.

*** لە دەقە عەرەبییەکەدا- هەر وەک پێشتر لێکۆڵیار پاساوی هێناوەتەوە- لە بری ئەو پیتە کوردیانە سێ نیشانەی پرسیار (؟) دانراون و لە چوارەمدا لە بری (ڤ) پیتی (ف) نووسراوە.

**** لێرەدا نەمتوانی مەزەندەی ئەوە بکەم ئاخۆ لێکۆڵیار لە بری (؟) نیشانەکانی پرسیار چ پیتێکی داناوە، تەنیا لە بری پیتی (ف) پیتی (ڤ)م دانا.

# ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا
# ١٩١٤ـ١٩٢٤

**بەرایی**

عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی دەربارەی مێژووی ڕۆژنامەگەریی عێراق لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەڵێ: **(بەر لە ڕاگەیاندنی دەستووری عوسمانی لە ٢٣ی تەمووزی ١٩٠٨ تەنیا سێ ڕۆژنامە بە هەردوو زمانی تورکی و عەرەبی هەبوون و هەفتانە لە ناوەندی هەر سێ ویلایەتی بەغداو بەسراو مووسڵ لە لایەن حکومەتەوە دەردەچوون، بەڵام کاتێ بانگی یەکسانی لە نێو خەڵکدا ڕادێراو، ڕووداوی بەناوبانگی تەمووز هاتە ئاراوەو، بنەماکانی حکومەتی ڕەهاش لە وڵاتی عوسمانی تێک شکان و سێبەری جەور لە کورتیی دا، هزرو بیر بووژایەوەو، بە شێوەیەکی فراوان ڕۆژنامەگەری لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بڵاو بووەوە، عێراقیش یەکێ بوو لەو وڵاتانەی لەم بوارەدا تینویەتیی شکاو زۆر بە فراوانی ڕووی کردە بوارەکە، لە ماوەی سێ ساڵدا نزیکەی حەفتا ڕۆژنامەی جۆراو جۆری سیاسی و ئەدەبی و گاڵتەجاڕیی تێدا بڵاو کرایەوە، ئەمەش ژمارەیەکی گەورەیە بۆ وڵاتێک کە هێشتا بە دنیای ڕۆژنامەگەری ئاشنا نەبووەو، هێشتا تامی ئەو بەرخۆدانە مەزنەی نەکردووە)** [١].

وێڕای ئەم قوڵپی ڕۆژنامەگەرییە ـ بە پێی گوزارەی د. عەلی ئەلوەردی[٢] - لەم حەفتا ڕۆژنامەیە، کوردی عێراق[٣] بەشیان تێدا نەبووە، ئەم شتەش لەوانەیە هۆی جۆراوجۆری هەبێ، گرنگترینیان نەبوونی چاپخانە بوو لە نێو شارە سەرەکییەکانی کورد لە ویلایەتی مووسڵدا[٤]، لەوەش گرنگتر ئەو بڕیارەی حکومەتی

ئیـتـیـحـادییـەکـان بوو، کـە (یاسـایەکی نوێی بۆ ڕێکخـسـتنی پرۆسـەی دەرکـردنی ڕۆژنامـە، لە پێنجی ئاداری ١٩١١ دەرکـرد)، تێیـدا مۆڵەتی دەرکـردنی ڕۆژنامـەیان بە تەنیـا دایە دەست ئەسـتـانە (ئەسـتـەمبـوڵ) یا بە ڕەزامـەندییـەکی تایبـەت لە لایەن والـیـیـەوە، بەم جـۆرە تەنگ بە ڕۆژنامـەگـەران هەڵچنرا. جـا هۆی هەرە سـەرەکی کـە ئیـتـیـحادییـەکانی هان دا بۆ دەرکـردنی ئەو بڕیارەی ئاماژەی پێ کـرا، ئەوەبوو عـەرەب و کـوردو ئەرمـەن، دوای شـەڕی بەڵکان و بەر لە یەکـەمین جـەنگی جـیـهـانی، ڕۆژنامەگەلێکیـان دەردەکرد، بە شێوەیەک لە شێوەکان بانگهێشـتی سەربەخۆیی و لە دەوڵەت جـودابوونەوەیان دەکـرد، بۆیە حکومـەتی ئیـتـیـحـادییـەکـان ئەمـەیان بە مـەترسـیـیـەک لە قـەڵەم دا، کـە هەڕەشـەی جـیـابوونەوەی ویلایەتەکـانی دەکـرد لە دەسەڵاتی عوسمانی، بۆیە دەرکردنی ڕۆژنامەیان قەدەغە کرد)[٥].

کۆمـەڵەی تەعـاون و تەرەقـیی کـورد ـ یەکـەمین ڕێکخـراوی سـیـاسـیی کـوردە کـە دوای کـودەتای ١٩٠٨ پەیدا بوو - لە ئەسـتـەمبـوڵدا ڕۆژنامـەیەکی تایبـەت بە خـۆی دەکرد بە ناوی (کـورد)و بە سەرپەرشـتـیی (پیرەمێرد)ی شـاعـیر، یەکـەمین ژمارەی لە نۆی تشـرینی دووەمی سـاڵی ١٩٠٨دەرچـووە، ڕۆژنامـەیەکی سـیـاسی ئاییـنی کـۆمـەڵایەتی بـوو، هەفـتـانە بە هەشت لاپەڕە دەردەچوو، دەربارەی خـەباتی کـورد لە پێناو بەدەست هێنانی مافە مرۆیی و سیاسییەکانی دەنووسی، بانگهێشتی ئەوەشی دەکـرد کـە بایەخ بە زمـانی نەتەوەیی و، فـێـرکـردنی منداڵان بە زمـانی کـوردی و، کۆکردنەوەی کەلەپوورو، نووسینەوەی مێژووی کوردو، زمانی کوردی، بدرێت.

دیارترین ئەو کەسە کوردانەی تێیاندا دەنووسی، سەعیدی نەورسی و ئیسماعیل حەقی بابان زادە بوو، بەڵام ئیـتـیـحـادییـەکـان ڕێی کـارکردنیان لە کۆمـەڵەکە گـرت ـ هەروەها ڕۆژنامـەکـەش ـ ئەویش لە ناوەڕاسـتی ساڵی١٩٠٩دا، پاش ئەوەی گـۆڕان بەسـەر سـیـاسـەتی دەرەوەو ناوەوەیاندا هات، لە ئاکـامی کپ کـردنەوەی هەوڵە کـودەتاییـەکـانی سـوڵتـان عـەبدولحـەمـیـدی دووەم لە سی و یەکی ئاداری سـاڵی ١٩٠٩[٦].

ئەمـەش ئەوە ناگـەیەنێت بـوونی کـورد لە بەغـدا، کـە چاپخـانەو ڕۆژنامـە لەبەر

دەستدان، سست بووە، بەوەی کورد لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دووەمین نەتەوەی شاری بەغدا بوون دوای عەرەب و ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی دە هەزار کەس[٧]، لەوانە کەسانی بەکاری سەر بە خانەوادەی دێرین و بەکاری کورد، وەک بابان و حەیدەری و زەهاوی، لە نێویاندا سیاسی و ئەفسەرو بازرگانی گەورە و موڵکدار هەڵکەوت [٨]، هەروەها کوردێکی زۆریش بوونە بەشێک لە **(چینە چەوساوەکانی کۆمەڵگای بەغدا)**و زۆربەشیان کاسبکار بوون، چونکە بەغدا هەمیشە **(خاڵێکی ڕاکێشانی کورد بووە لە ڕووی ڕۆشنبیری و ئابوورییەوە)**[٩].

بەم جۆرە نیشانەی پرشنگدارمان سەبارەت بە کورد لە بەغدا بەرچاو دەکەوێت، لەوانە مەعروف جیاوۆک ڕۆژنامەی(الحقوق)ی [١٠] بە عەرەبی و تورکی دەرکردوە، کە ڕۆژنامەیەکی سیاسی بوو، ژمارە یەکی لە هەژدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٢ دەرچووە،(تا ژمارە سی زۆر بە ڕێکی دەرچووە، دواتر لەبەر چاوان ونبووە)[١١].

هەر لە بەغدادا چەند کۆمەڵەیەکی نەتەوەیی کورد هاتنە دامەزراندن، وەک(یانەی سەرکەوتنی کوردان) لە ساڵی ١٩٣٠ بە ڕەسمی مۆڵەت دراو، کۆمەڵەی(یادگاری لاوان) ساڵی ١٩٣٣، ئەمیان مۆڵەتی کارکردنی نەدرا، سەرباری چەند کۆمەڵەیەکی نهێنی کە لەو ماوەیەدا چالاکییان نواند[١٢].

دەکرێ ڕادەی هێزو کارایی بوونی کوردان بێنینە بەرچاو، بەوەی یەکەمین گۆڤاری کوردی لە عێراقدا لە هەشتی شوباتی ١٩١٤ بە ناوی (بانگی کورد ـ بانگ کرد) لە بەغدا دەرچووە، هەروەها یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لە عێراقدا هەر لە بەغدا لە یەکی کانوونی دووەمی ١٩١٨ بە ناوی (تێگەیشتنی ڕاستی) دەرچووە، پاشان مستەفا پاشای یامولکی سێ ژمارەی لە ڕۆژنامەکەی(بانگی کوردستان ـ بانگ کردستان) لە ساڵی ١٩٢٦ لە بەغدا دەرکردوە، گۆڤاری (دیاریی کوردستان)یش لە یازدەی ئاداری ساڵی ١٩٢٥ دەرچووە، گۆڤاری(پەیژە)ش لە ساڵی١٩٢٧ دەرچووە، لە هەمووشیان گرنگتر گۆڤاری (گەلاوێژ)بوو، کە (شوێنێکی دیاری لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا هەیە)[١٣].

## أـ گۆڤارەکان

### بانگ کرد (بانگی کورد)

بەپێی ڕێنووسی ئێستای کوردی لە عێراقدا، ناونیشانەکەی بە دروستی (بانگی کورد)ە، گۆڤارێکی ئەدەبی[١٤] بوو، هەر پازدە ڕۆژ جارێک دەردەچوو، یەکەمین ژمارەی لە هەشتی شوباتی ساڵی ١٩١٤ز دەرچووە، لە باشترین بۆچووندا، پێنج ژمارەی[١٥] لێ دەرچووە، بایەخی بە (بابەتی جۆراوجۆری ئایینی و ڕۆشنبیری و کشتوکاڵی و مێژوویی دەدا)[١٦]، خودانەکەشی جەمالەدین بابان[١٧]بوو، کە (دایمەزراندو سەرپەرشتیی نووسین و دابەش کردنەکەشی دەکرد لە سەرانسەری کوردستانی عێراق[١٨]و) دەرەوەش دا[١٩]، هەر یەک لە عومەر نەزمی و، عەلی کەمال باپیر یاریدەدەری بوون[*]، وتارەکانیشی ژمارەیەک نووسەر دەیاننووسی، دیارترینیان شوکری فەزڵی و، بەهادین شێخ نووری شێروانی بوون[٢١].

لە خوێندنەوەی ئەو بابەتانەی لە گۆڤاری (بانگی کورد)دا بڵاوکراونەتەوە، دەردەکەوێ کە گۆڤارەکە مەبەستی گۆڕینی کۆمەڵگا بووە، گوتارەکەشی ئاراستەی کۆمەڵگای کوردی عێراق دەکرا، لە پێناو گۆڕینی بە کۆمەڵگایەکی ژیاریی زانستی کە فێرکردن و زانینی تێدا بڵاو ببێتەوە. لەو پێناوەدا، پەنای بردە بەر بڵاوکردنەوەی ئەو وتارو چامانەی هانی ئەم لایەنە دەدەن و سەرنجەکانی خەڵکی بەرەو گەلانێکی دوور ڕادەکێشێت، کە بە ڕێی زانست و زانین دا ڕۆیشتن و بە پلەی بەرزو بڵند گەیشتن، ئەوەشی لەبیر نەچوو، لەپێناو هێنانە ئارای کاری پێویست، ئاماژە بە ئایینی ئیسلام بکات کە هاندەری زانست و فێربوونە. گۆڤارەکە هانی کوردی دەدا پەند لە **(قەومێکی بچووکی وەکو ژاپۆنیا)** وەربگرێت، چونکە لە **(سایەی سەعی و تەقدیری قیمەتی وەختیان دەوڵەتێکی عەزیمی وەکو رووسیەیان شکان و تارومار کرد)**[٢٢]، **(«هاوارو دادو بێدادی» بوو بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێک تاوەکو «بە شوێن تەشویق و کۆششی» ئەو جێگەیە مەکتەب گوشاد بکرێ و قەومی کوردان لەم جەهالەتە تەخلیس بکا)**[٢٣].

---

(*) لە ریزبەندی ژمارەی ژێدەرو پەراوێزەکان لە دەقە عەرەبییەکەش دا ژمارە (٢٠) نەبوو...(وەرگێڕ).

بەپێی هەڵسەنگاندنی لێکۆڵەرێکی ئاگادار: **(ئەوەی بە شێوەیەکی تایبەتی دەبێ سەرنجی بدرێتێ ئەوەیە هەستی نەتەوەیی لە زۆر شوێنی ناوەرۆکی ئەم گۆڤارەدا خۆی نواندووە. «بانگی کورد» لە یەکێ لە وتارەکانیدا بە درێژی باسی نرخی خوێندن و کاری لە ژیانی گەلاندا کردووە)**[٢٤]. بە گشتی بابەتە ئەدەبییەکان بە شێوەیەکی گشتی **(زاڵبوون بەسەر لاپەڕەکانی ئەو چەند ژمارەیەی، بە شێوەیەکی گشتی گۆڤارەکە ئەوسا کێشە نەتەوایەتی و مرۆڤایەتییەکانی لەبیر نەکرد بوو)**[٢٥].

گۆڤارەکە بە قەبارەی ٥ر٢٢سم×٥ر١٥سم و بە٢٤ لاپەڕە لە چاپخانەی (ئەلئاداب) چاپ دەکرا [٢٦]، هەر لاپەڕەیەکیشی دوو ستوونی ٨سم×١٨سم بوو بە هەردوو زمانی تورکی و کوردی، زمانە کوردییەکەشی پڕ بوو لە پەیڤ و دەستەواژەی عەرەبی، بەشی یەکەمی گۆڤارەکە تورکی و بەشی دووەمی کوردی بوو، لە یەکەمین ژمارەدا بەشە کوردییەکەی لە لاپەڕە پازدەوە دەست پێ دەکات، بابەتەکانی یەکەمین ژمارەی بەم جۆرە بوون:

**بەشی تورکی:**

أ- وتارێک دەربارەی ڕەوشی فێرکردن لە کوردستاندا، لە نووسینی (جەمال بابان) ل ١-٩.

ب- وتارێک دەربارەی ئابووری (اقتصاد) لە نووسینی (فیکری) ل ٩-١١.

ج- وتارێک دەربارەی خوێندن و شارستانی لە شاری بەغدا، لە نووسینی(خاکیی بەغدایی) ل١١-١٢.

د- وتارێکی کۆمەڵایەتی، لە نووسینی ( سلێمان تۆفیق) ل١٣-١٤.

**بەشی کوردی:**

ا- تەئریخ و فەلسەفەی تەئریخ، لە نووسینی (بەهەشتی) ل ١٥-١٧.

ب- قسەی خۆ بە خۆیی، لە نووسینی (جەمالەدین بابان زادە) ل١٧-١٩.

ج- حسن معارف و تەرەقی لە ناو کوردان، لە نووسینی (سدقی) ل ١٩-٢٠.

د- دوو پارچە شیعری نالی [٢٧].

بۆ ئەوەی دیدێکی تەواومان دەربارەی گۆڤارەکە هەبێ، وتارێکی جەمال بابانی خاوەنەکەی دەخەینە ڕوو، کە لە یەکەمین ژمارەدا بە ناونیشانی (قسەی خۆ بە خۆیی) بلاو کراوەتەوە:

**ئەی کوردان، موحتەرەمان**

**ئەمڕۆ زەمانەکەمان زەمانی سەعی و غیرەتە، هیچ کەسێ ناتوانێ موقابیل ئەم دوو قووەتە راوەستێ، لەبەردەم سەعی و مەراما بەخت ملی چەوت ئەکا، ئەو میللەتە کە تابعن بە قانونی تەکامول.**

**(....)**

**لاکین ئەو میللەتەی کە ئەم دوو قووەتەی نەبێ هەرچیە دەکا بکا، خۆی بکوژێ مومکین نییە، زەمان ئەو دادەڕزێنێ و مەحوی دەکا. بە موجبی قانونی تەکامول ئەو کەسە کە تابعی موقتەزای زەمان بێ و لە عادەتی کۆنی خۆیان ئیسرار دەکا فەلاح نابێ، مەعاریف کە بۆ محافەزەی وەتەن ئەساسەو نیشانەی شەرەفی میللەتە بۆ هەموو کەسێ فەرزە کە سەعی بۆ تەرەقی ئەمە بکا، لاکین بەو شەرتە کە تابع بە تەرەقیاتی زەمانە بێ، دیقەت بفەرموون ئەمڕۆ هیچ میللەتێک نییە کە بە ئیقتیداری خۆی تەرەقی نەکردبێت، ئەمانە تەرەقیان کردووە لە هەموو شتێک تابیعی موقتەزەیاتی زەمانە بوون، ئەمجا تەرەقیان کردووە، مەسەلی مەشهورێک هەیە دەڵێن ئەگەر زەمانە تابع تۆ نابێ تۆ تابع زەمانە بە، دەزانن وێری زبانی ئێمە چییە؟ دەڵێین ئێمە کوردین دەخلمان چییە لەم تەرحە عەجایبە، پارویەک نان دەخۆین و شوکری خوا دەکەین، بەڵێ، برادەر ئەم قسەیە راستە، ئینسان لازمە کە شاکرو قانع بێ فەقەت شەرتیشە کە سەعی بکاو حاسڵ نەمێنی و موحتاج کەسێ نەبێ، خواوەند تەعالا چۆن کە فەرموویەتی: شاکرو قانع بین واش فەرموویەتی سەعی بکەین.... بە سەعی دەبینە ئینسان، ئێمەی کوردەکان ئەساسەن ئیقتیداری سەعیمان هەیە، موتەحەمیل هەموو جەورو جەفاین، لاکین تەشەبوسمان نییە،**

دەفەرموون لە ناو ئەم کوردستانە عەزیەکەسێکم پیشان بدەن تەشەبوسی شتێکی کردووە کە ئەو شتە یا خۆی یا ئەفرادی میللەتی یا جەماعەتی ئیستیفادەی کردبێت، وەلحاسڵ عاجز مەبن با راستی بڵێم ئێمە کە کوردین لە جوتیاری و فەللاحی زیاتر هیچمان لە دەست نایەت -، - في الحقيقة - لە دنیادا لە زراعی و فەللاحی و تجاری چاتر هیچ سنعەتێ نابێتە فکر، فەقەت ئێمەمانان ئەم سنعەتەش ناکەین، جوتیارێکی قوڕ بەسەر هاوین و زستان لەبەر ئەم بەفرو باران و هەتاوە هەر لە سبحەینێوە تاکو ئێوارە هەر هۆ هۆیەتی جووت دەکاو درەو دەکا، نیهایەت سەریساڵ یا نیو وەزنە گەنم و جۆی دەست دەکەوێ یاناکوو فەقیرە، بەمەش خەریک دەمێنێ، عەجەبەن بیخوا یا بۆ تۆوی ساڵێکە هەڵی بگرێ، ئەگەر سەعی بکەین و واز لەم تەمبەڵیە بێنین ئەڵبەت شیرکەتێ تەئسیس دەکەین کە بە واسیتەی ئەم شیرکەتە هەم زەراعەتمان هەم تجارەتمان تەرەقی بکاو ئیحتیاجمان بە هیچ کەس نەمێنێ، ئێستا ئێمە بەم حاڵەش رازی بووین مادام کە هەمومان زراعین، فەللاحین، مەلاکین، هیچ نەبێ دەوڵەمەندەکانمان گردەوە بێن و ماکنەییێکی زراعەت بهێنین کە بە سایەی ئەم ماکنەیە نە ئەوەندە تووشی زەحمەت دێن نەش ئەوەندە وەقتمان بە هەوا دەچێ کە ئیشمانیش تەواو بوو بە یەکێکی کە بە مقابل پارە دەدرێ بە - ضمان - ماکینەکەش هەر ماکینەیە - ماکینە هێنان وەکو بزانن ئەوەندە مەسرەف و زەحمەتی ناوێ، بە قیست دەیفرۆشن پارەکەیشی بەرە بەرە دەدرێ، یەکێکیش بە مانگانە دەهێنین هەتاکو فێری ئیستیعمالی دەبێن.

برادەرینە: ئەمرۆ هەموو کەسێ تەسدیقی کردووە، کە ئەو کەسانەی کە سەعی ناکەن و مائل نفاق و شقاقن نە تەرەقی دەکەن نە عومری خۆشی گوزەران دەکەن، لەبەر ئەمە ئەمڕۆ قەرزی ملمانە کە ئیتیفاقێکی عیلمی بکەین و لە ناوماندا نیفاق و شقاق هەڵگرین تاکو معارفمان تەرەقی بکاو بەم واستەیە جەهالەتمان رەفع ببێ، ئێوە تەسەور مەکەن کە بێ ئیتیفاق شتێ بێتە وجود مەسەلەن فەرز بکەین ئەمڕۆ پیاوێ هەزار قرانێکی[٢٨] هەیە، مەعلوم کە بەم هەزار قرانە هیچی پێ ناکرێ، فەقەت چەند کەسێ لەگەڵیدا ئیتیفاق بکاو سەرمایە دانێ بە مووەدەتێکی قەلیل

**لاكين به شەرتى سەعى، دەبێتە تجارێكى گەورە، ئەگەر ئیتیفاقى لەگەڵدا نەكەن ئەو قورِ بەسەرەش نیهایەت مەجبوورە ئەو پارەیە بخواو سەفیل بمێنێ بینا لەسەر ئەمە لازمە كە دەوڵەمەندەكانمان تجارەكانمان، عالمەكانمان، دەست بدەنە دەست یەكترى، سەعى بۆ تەرەقى معارف و زراعەت و تجارەت بكەن كە بەم واستەیە هەم ئەفرادى میللەتمان تەخلیس نەفسى خۆى لە جەهالەت دەكا هەم پارویەكى نانى راحەتى دەخوا، وە ئیلا موستەحەقى لەعنەتى ئەحفادو لایق عیتاب باوك و باپیرەمان دەبن**[٢٩].

وتارەكانى بەشە توركییەكەشى درێژە بە هەمان رەوت دەدەن، وتارى یەكەمیان كە هى جەمال بابانە، دەربارەى پەرەسەندن و پێشكەوتنى زانستەكان و فێركردن دەدوێت، بە تایبەتى لە نێو كۆمەڵگاى كورددا، پێشنیارى ئەوە دەكات، رۆشنبیرانى كورد (جمعیت علمیة) (كۆمەڵەیەكى زانستى) لە بەغدا و شارەكانى كوردستاندا دابمەزرێنن، بە مەبەستى بلاوكردنەوەى رۆشنبیرى و زانستەكان و هونەرو ئەدەب، تا **(خەڵك بە تەواوى درك بە گرنگى زانست و ئەدەب و هونەر دەكەن و تێیان دەگەن و، لەوەش حالى دەبن كە چەند كاریگەرن بۆ بەرەپێش چوونى كۆمەڵگاكان)**.

هەرچى وتارى دووەمە، ئەوە بە درێژى باسى بارى ئابووریى كردووە، هەروەها چۆنیەتى پەرەپێدانى ئابوورى لە كوردستاندا، ئابوورى زانستێكە بە عەقڵ هەڵسوكەوتى لەگەڵ دەكرێت، ئەم زانستەش بنەماى گۆڕان و بەرەوپێش چوونى كۆمەڵگایە، لە هەموو چاخێكدا بە هۆى گۆڕین و بەرەوپێش بردنى بارى ئابوورى، هەژارى و نەزانى و نەخۆشى قەلاچۆ دەكرێن.

لە وتارى سێیەمیشدا نووسەرەكەى باسى لایەنى ژیانى دەكات، هەروەها باسى بەرەوپێش چوونى ژیانى كۆمەڵگاكان دەكات لە هەموو بوارەكاندا بە تایبەتى لە شارى بەغدا كە رۆژێك لە رۆژان دەسەلاتى عەباسییەكانى تێدا بەرقەرار بووە، یەكێ لە هۆیەكانیش بە دامەزراندنى قوتابخانەى (ئەلموستەنسرییە) دادەنێت، كە **(شەیدایانى زانست و ئەدەب و هونەر لە هەموو شوێن و لایەكەوە روویان كردووەتێ)**.

ئەم شتەش وای لە (بەغدا کرد ببێتە کانیی رۆشنبیری و کۆڕی رۆشنبیران) پاشان نووسەر هاوبەندییەک دەخاتە ڕوو لە نێوان پەرەسەندنی زانستەکان و رۆشنبیری و، زەرورەتی دەستەبەر بوونی لایەنی ئاکار و هیوای مرۆڤانە تێیاندا.

وتاری چوارەمیش داوا لە لاوانی کورد دەکات، پەرە بە رۆشنبیرییەکەیان بدەن و بەهێزیشی بکەن و، هەوڵ بدەن ڕەوشی کۆمەڵایەتیش پێش بخەن، چونکە وای دەبینێ کە ڕەوشی رۆشنبیری لە توانای دایە بە شێوەیەکی کارا ڕۆڵی هەبێت لە گۆڕانی کۆمەڵ، پاشان باسی دواکەوتوویی کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەلات و پێشکەوتوویی کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوایی ئەوروپی دەکات، بەپێی باوەڕی نووسەر، لاوانی کوردستان نوستوون و پێویستە لە خەو ڕابن و، کۆمەڵەی رۆشنبیری دابمەزرێنن وەک کوردەکانی تورکیا کە کۆمەڵەی (هیڤی)یان دامەزراند، کە بە هۆی گردبوونەوە و یەکگرتوویان توانییان گۆڤاری ڕۆژی کورد (روژ کرد)[30] لە ئەستەمبوڵدا دەربکەن، هەروەها باسی بایەخی زمان و ئەدەب دەکات لە مێژووی کورددا و، باسی شاعیرانی وەک نالی و کوردییش [31] دەکات.

گۆڤارەکە لە ژمارەی سێی دا قەسیدەیەکی بە زمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە:

بۆ تەرەقی مولک و میللەت ئیتیحادمان لازمە
سەرفی غیرەت چاکە با غەیبی نەکەین ئەم فرسەتە
مەحفەزەی دین و شەریعەتمانە خۆ خاکی وەتەن
ئاوەدانی ئەو بە زۆری عیلم و فەن و سنعەتە
ئیش ئەگەر وابێ وەتەن نورانی و مەعموور ئەبێ
رستگاریمان ئەبێ ئێمەش لە دەست ئەم زوڵمەتە
دوژمنی عیلم و مەعاریف خانەمان وێران ئەکا
زۆر خراپ و موهلیکە دەرمانی کەین ئەم عیلەتە
پایەدار بێ تا قیامەت بو شفای ئەم ئومەتە
حاڵ و ئەوزاعی زەمانە تانەو دەرسی عیبرەتە

دەربارەی زمان و دەستەواژەکانی گۆڤارەکە، ئەدیب و شاعیری کورد عەبدولڕەزاق

بیمار دەڵێ: «**وتارکەی جەمال بەگ وەکو وتارەکانی تری گۆڤارەکە لەسەر شێوازی پەخشانی عوسمانلی نووسراوە، وشەو زاراوەی قەبەی بیانی و دارشتەی عەرەبیی زۆر تێدا بەکار هاتووە. لە تەک ئەمەشدا زۆر رستەو دارشتەو تەعبیری میللیانەو رەسەنی کوردی و ئەو وشانەی لە کاتی ئاخاوتندا لەسەر زمانن و وتارەکەی پێ رازاوەتەوە»و «لە نووسەرانی گۆڤارەکە ئەدیب و شاعیری وەکو شوکری فەزڵی و عەلی باپیر ئاغاو بەهائەدین نووری دەبینین، بۆیە وتارەکان لە ئاستێکی شیاودا خۆ دەنوێنن، بە پێش دەستییەکی پوخت دەست پێکراون، بە چەند برگەیەک مەبەست شی کراوەتەوە بە کۆتاییەکی پەسند دوایی پێ هێنراون، زمانیان رەوان و ئەدەبیانەیە بەبێ رازاندنەوەی رەوانبێژانە مەبەست بە ئاسانی دەستگیر دەبێت، ئەگەرچی لە هەندێ بابەتیشدا لە لایەن فیکرەوە قووڵ چوون وەکو وتارەکەی «بەهەشتی» «تەئریخ و فەلسەفەی تەئریخ»**)[٣٢].

## ب- رۆژنامەکان

### تێگەیشتنی راستی

(تێگەیشتنی راستی)، (**رۆژنامەیەکی سیاسی و ئیجتیماعی و خادیمی یەکبوون و سەربەستیی کوردانە**)، هەر وەک لە خوارووی ناونیشانی رۆژنامەکەدا نووسراوە، هێزەکانی داگیرکەری ئینگلیز هەفتەی دوو جار لە بەغدا دەریان دەکرد، هەموو شەممە و سێ شەممەیەک، بە دوو لاپەرە،پاشان بووە هەفتانە و لە ژمارە بیست و یەکەوە هەموو دوو شەممەیەک دەردەچوو، لە ژمارە بیست بەدواوە لاپەرەکانی بوونە چوار، قەبارەی لاپەرەی گشت ژمارەکانی ٣٦×٢٤ سم بوون.

یەکەمین ژمارەی (تێگەیشتنی راستی) لە یەکەم رۆژی کانوونی دووەمی ١٩١٨دا دەرچووە، دوایین ژمارەشی لە رۆژی بیست و حەوتی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٩دا دەرچووە، بەمە ساڵێکی تەواو و بیست و شەش رۆژ بەردەوام بووە، هەموو بەسەر یەکەوە شەست و حەوت ژمارەی[٣٣] لێ دەرچووە.

وێرای ئەوەی ناوی هیچ نووسەر و رۆژنامەنووسێک لەسەر لاپەرەکانیدا نییە،

کەچی لێکۆڵینەوە و ئاکامە بەدەست هاتووەکانی د. کەمال مەزهەر ئەوە دەخەنە ڕوو، کە دوو کەس لە پشت ئەرکی نووسین و دەرکردنەکەین، مەیجەر سۆن و شوکری فەزڵیی شاعیر[٣٤].

ڕۆژنامەکە ئامانجی ئەوە بوو کورد بە **(چاکە و سەرکەوتنەکانی ئینگلیز و، خراپی و شکستی دوژمنانیان، بە تایبەتیش تورکەکان)** ئاشنا بکات.

لەو پێناوەدا سەروتار و هەواڵ و وتار و ڕیپۆرتاژ و دیمانەی بڵاوکردوەتەوە، تەنانەت پەنای دەبردە بەر بڵاوکردنەوەی وێنە لە دامەنی دوا لاپەڕەدا[٣٥]، لە هەواڵەکانیشدا پشتی بە ئاژانسی ڕۆیتەر دەبەست.

دەکرێ (تێگەیشتنی ڕاستی) بە یەکەمین ڕۆژنامە دابنێین، وێنە و ڕیپۆرتاژ و دیمانەو[٣٦] ڕیکلامی بازرگانیی[٣٧] بڵاوکردوەتەوە.

لە ڕاستیشدا (تێگەیشتنی ڕاستی) لە ناوەڕۆک و ئامانج و هونەری ڕۆژنامەنووسیدا زۆر لە ڕۆژنامەی (العرب)[٣٨]ەوە نزیک بوو، کە لە هەمان ماوەدا هەر لە لایەن هێزەکانی ئینگلیزی داگیرکەرەوە دەردەچوو، پێداگیریی لەسەر گەشەپێدانی هەستی نەتەوەیی عەرەب دەکرد بەو شێوەیەی خزمەت بە سیاسەتی ئینگلیز دەکات و، یارمەتیشیان دەدات بۆ سەرکەوتن بەسەر عوسمانییەکاندا، هەروەها فەرمان و ڕاگەیاندنەکانی سوپای ئینگلیز و ئەو یاسا و بڕیارانەی دەری دەکردن، ئەوانیشی بڵاودەکردەوە.

د. کەمال مەزهەر لەو کتێبە تایبەتەیدا دەربارەی ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) و شوێنی لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا[٣٩] دەڵێ: **(شێوازی - تێگەیشتنی ڕاستی - وابووە هەستی کوردایەتی بورووژێنێ بەو ئاراستەیەی خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بکات، لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا، وتارەکانی ڕۆژنامەکە بەردەوام دووپاتی ئەوەیان دەکردەوە، بە شێوازێکی سەرنج ڕاکێش و مانۆڕێکی زیرەکانەوە، کە بەدی هاتنی ئامانجەکانی کورد بە تەنیا بە پشت بەستن بە بەریتانیا دەبێت)** هەروەها دەڵێ: **«لە - تێگەیشتنی ڕاستی -دا گەلێ نموونە هەیە بە جۆرەها شێواز هانی هۆزەکانی کورد دەدات بۆ چوونە ڕیزی هێزەکانی**

**ئینگلیز»** هەروەها **«لەم بوارەدا - تێگەیشتنی راستی - هەوڵی دا سۆزی ئایینی و هەستی نەتەوەیی جەماوەری کورد بەکار بهێنێ»** دەشلێ **«سەرکەوتنەکانی هاوپەیمانان، بە تایبەتی هێزەکانی ئینگلیز شوێنێکی دیاریان لەسەر لاپەڕەکانی - تێگەیشتنی راستی -دا داگیر دەکرد هەردەم بە شێوەیەک هەواڵەکانی شەڕی دەخستە روو کە وا لە خوێنەر بگەیەنێت کە دوارۆژ بە تەنیا هەر بۆ ئینگلیزەکانە»و «هەروەها لێدوان و گوتەی بەرپرسیاریەتیی ئینگلیز بە روونی و بە زیرەکی لە نێو رۆژنامەکەدا رەنگیان دەدایەوە»**.

بۆ ئەوەی چاکتر لە سیاسەتی رۆژنامەکە بگەین، ناونیشانی هەندێ لە سەروتارەکانی دەخەینە ڕوو:

- (سوڵتان سەلاحەدین و تورکەکان) ژمارەی هەشتەم
- (حکومەتی ئینگلتەرە، فورس و تورک و رووس و ئەڵمان) ژمارەی نۆیەم
- (ئینگلتەرەو ئیسلام) ژمارەی سێزدەهەم
- (فیکری ئینگلیزو فەرەنسەو ئەمریکا و ئیتالیا دەرحەق ئەقوامی شەرق چییە) ژمارەی هەژدەهەم
- (روئەسای کورد ئەبێ چی بکەن؟) ژمارەی نۆزدەهەم
- (حکومەتی تورک بۆچی شەڕ دەکا) ژمارەی سی و هەشتەم
- (فەرقی حکومەتی ئینگلیز و تورک) ژمارەی چل و چوارەم
- (حکومەتی تورک بێ هێز بووە) ژمارەی پەنجایەم
- (سەربەستیی فیکری و قەومی) ژمارەی پەنجا و حەوتەم
- (ئایندەی عالەم) ژمارەی شەست و دووەم.

وێڕای هەموو ئەو شتانە (تێگەیشتنی ڕاستی) ئەوەی لەیاد نەچووە، کە بایەخێکی زۆر بە ئەدەب و زمان و مێژووی کورد بدات، بەڵکو لە ژمارەی شازدەمەوە، گۆشەیەکی تایبەتی بۆ ئەدەبی کوردی تەرخان کرد، زۆر جاریش نموونەی ئەو شیعرە کوردییانەی تێکەڵ بە نووسینەکانی دەکرد، کە خزمەتی مەبەستەکانی ئەویان دەکرد، دەکرێ بڵێین بەرهەمی زۆربەی شاعیرانی ناسراوی ئەو سەردەمەی

کورد لەسەر لاپەڕەکانی ئەو ڕۆژنامەیەدا دەرکەوتووە.

لە بواری زمانی کوردییشدا بەهرەکانی مەیجەر سۆن [٤٠] بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش بوونی خۆیان سەلماند، ڕۆژنامەکە گەلێ زاراوە و دەستەواژەی نوێی هێنایە نێو زمانی کوردی کە زۆریان تا ئەمڕۆ هەر زیندوون، بە تایبەتی ئەوانەی بەرامبەر بە دۆزراوە و فەرمانە تازەکانن، دەکرێ هەمان شت بەرامبەر بە ڕێنووسی کوردییش بگوترێ، کە هێشتا بە شێوەیەکی دان پێدانراو و ناسراو لە لای هەمووان نەچەسپا بوو.

(تێگەیشتنی ڕاستی) بە هەمان شێوە بایەخی بە مێژووی کورد دا، یەکەمین ڕۆژنامە و **(یەکەم سەرچاوەی کوردییە هەوڵی داوە باسی ڕەگەزی کورد بە شێوەیەکی زانستیی دروست بکاو دیسان یەکەم سەرچاوەی کوردییە پەیوەندی میدیاو کوردی خستۆتە بەرچاو)** [٤١].

خودی لێکۆڵەریش (تێگەیشتنی ڕاستی) بەم شێوەیە هەڵدەسەنگێنێ: نکوڵی لەوە ناکرێت سەرپەرشتی کردنی مەیجەر سۆن وای لە (تێگەیشتنی ڕاستی) کرد، لە ئاستێکی بالاتری ڕۆژنامەنووسیدا بێت بە بەراورد لەگەڵ زۆر ڕۆژنامەی کوردی، کە لە ماوەیەکی دواتردا دەرچوون، بۆیە ڕۆژنامەکە لە ڕووی هونەری ڕۆژنامەوانییەوە شوێنێکی شیاوی هەیە لە سەراپای ڕۆژنامەگەریی کوردیدا.

هەروەها دەڵێ: گومانی تێدا نییە، ئینگلیزەکان (تێگەیشتنی ڕاستی)یان بۆیە دەرکرد، کە لە خزمەتی ئامانجە دیاری کراوەکانیان بێت لە ناوچەکەدا، بەڵام ئەم شتە ئەوە ڕەت ناکاتەوە، کە ڕۆژنامەکە شوێنێکی تایبەت بە خۆی گرداوە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا لە هەردوو ئاستی هونەری و ناوەرۆکدا.

لە ڕووی ناوەرۆکەوە ڕۆژنامەکە خزمەتێکی بەسوودی پێشکەش بە ژیانی رۆشنبیریی کورد کردووە، بایەخی ڕۆژنامەکە پتر بەرجەستە دەبێت گەر بزانین تاکە چاپکراوێکی کوردی زمان بوو، کە بە درێژایی سالانی یەکەمین جەنگی جیهانی دەردەچووە.

لە پاڵ گشت ئەمانەدا (تێگەیشتنی ڕاستی) ژێدەرێکی ڕەسەن پێک دەهێنێ،

یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن لە زۆر لایەنی سیاسەتی ئینگلیز لە هەمبەر دۆزی کورد لە قۆناغێکی ناسکی مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا.

هەروەها دەچێتە نێو ئەو ژێدەرانەی یەکەم بۆ لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوانەی لە عێراقدا قەومان و، دووەم بۆ ئەو ڕووداوانەی لە ناوچەکەشدا لە دوایین ساڵی جەنگدا قەومان.

وا دیارە وەستانی ڕۆژنامەکە بە هۆی نەمانی مەبەستەکانی و گۆڕانی سیاسەتی ئینگلیزەوە بوو بێت، کە دوای ئەوە بە ماوەیەکی کورت کەوتنە دەرکردنی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ی هاوچەشنی لە شاری سلێمانیدا واتە لە نێو خودی ناوچەی کوردنشیندا.

## (پێشکەوتن) و سیاسەتی ئینگلیز لە سلێمانی دا

(پێشکەوتن) یەکەمین ڕۆژنامەی کوردییە کە لە کوردستانی عێراق و بە تایبەتی لە سلێمانیدا دەرچووە... جا بۆی هەیە دەرچوونی لە سلێمانیدا هۆکارو مەبەست هەبێت کە ڕێی بۆ ئەوە خۆش کردوە، سلێمانی هەر لەو کاتەوە کە بابانەکان دروستیان کرد و کردیانە پایتەختی میرنشینە بەهێزو فراوانەکەیان، بووە خاڵێکی ڕاکێشانی بنکەیی، لە هەمان کاتیشدا کاریگەر لە ناوچە کوردنشینەکانی دیکە، بە هۆی زۆریی مزگەوت و قوتابخانە و زانایانی، لە بواری کارلێکی ڕۆشنبیری و بەرهەمهێنانی ئەدەب و هزری کوردیدا لە شارەکانی دی چالاکتر بوو، هەروەها هەبوونی سەرکردەی بەهێزی ئایینی و عەشایەری لە شارەکە و دەوروبەریدا، کردییە یەکێ لە بەهێزترین مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی چەکدارانەی کورد.

بۆی هەیە دان پێدانانی ئینگلیزەکان لە کاتی داگیرکردنی عێراقدا، بە کەسێتیی کاریگەری شێخ مەحمود و ڕاگەیاندنی وەک حوکمداری کوردستان لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨، تەکانێکی دیکە بوو بێت درایە پێگەی کاریگەری شارەکە، بەڵام کاتێک مەیجەر نوئێل (ڕاوێژکاری سیاسیی حوکمدار) بە مەیجەر سۆن گۆڕا، کارەکان وەک دەبوو ڕێیان نەگرت، شێخ مەحمودیش شەڕەکەی ١٩١٩/٦/٩ی بەرامبەر بە ئینگلیزەکان دۆڕاند و بۆ هیندستان دوور خرایەوە.

بۆ لە ئامێز گرتنی بێزاریی خەڵک و جێگیر کردنی سیاسەتی بەریتانیا لە ناوچەکەدا، مەیجەر سۆن حاکمی سیاسیی نوێ، کۆمەڵێک چاکسازیی ئەنجام دا، بەم شێوەیە چڕیان دەکەینەوە[٤٢]:

١- نەهێشتنی برسێتییەکەی پاش جەنگی جیهانی (گرانییەکە) و، هێنانی پارە و خۆراک و دابەش کردنی بە خۆڕایی بەسەر هەژاراندا و بە پارە بەسەر دەوڵەمەنداندا، لابردنی باج لەسەر ئەو بازرگانانەی خۆراکیان بۆ شارەکە دەهێناو، دانانی بناغەی ئابووری و بەرزکردنەوەی توانای کڕین لە لای خەڵک و نەهێشتنی بێکاری.

٢- دروست کردنی پردێک لەسەر ئاوی تانجەرۆ و کردنەوەی ڕێی ئوتومبێل بە هەموو لایەکداو کردنەوەی خول بۆ فێربوونی ئوتومبێل لێخوڕین.

٣- نەهێشتنی دز و ڕێگرەکان بە تەواوی.

٤- کارکردن بە یاسای سزاکان و ڕێسای داوەری و یاسای مەدەنی و یاساکانی دیکەی عوسمانی، تا توانیی زوڵم و جەور قەڵاچۆ بکات.

٥- کردنەوەی قوتابخانە بە زمانی کوردی، ڕەت کردنەوەی هەر عەریزە و نووسراوێک ئەگەر بە زمانی کوردی نەبوایە.

٦- قەرزدان بە جوتیار و موڵکدارەکان وێڕای ئاسانکارییەکی زۆر.

٧- بایەخدانێکی زۆر بە پاکیی شەقامەکان و دەزگاکانی شار.

٨- دامەزراندنی ئەنجوومەنی شار و، دەست نیشان کردنی زۆربەی ئەندامەکانی لە ڕێی هەڵبژاردنی ئازادەوە.

٩- بڵاوکردنەوەی هەندێ داب و هەڵسوکەوتی نوێ، وەک کۆکردنەوەی پارە بۆ چاککردنەوەی مزگەوتەکان و، سازدانی کێبڕکێ لە بواری هەڵپەڕکێی کوردی و ڕم هاوێژی و غارغارێن، تەنانەت کێبڕکێیەک بۆ نووسین بە زمانی کوردی و بێ بەکارهێنانی وشەی بیانی، بە تایبەتی وشەی تورکی و فارسی ساز کرا، کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی فەرمانێک دەربکرێت بۆ نووسینی ناو شارەکە بە کوردی (سلێمانی) نەک (سليمانيە).

١٠- هەموو پیشەو هەڵسوکەوتەکان خرانە ژێر چاودێریی دەسەڵاتەوە، مامان دەبوو مۆڵەت وەرگرێت، هەروەها ئەوانەی شەرابیان دروست دەکرد، بنکەیەکی ئاشکراش بۆ (سێکس)[٤٣] کرایەوە، بە مەبەستی ئەوەی ڕێ لەوە بگیرێت دوور لە چاودێریی دەسەڵات بکرێت.

١١- هەوڵدان بۆ ئەوەی خەڵک چاک و خراپی ئاکاری ڕۆژانەیان بە پێی شەریعەتی ئیسلام بزانن، داواش لە دادگای شەرعی کرا وەڵامی گشت پرسیارێکی خەڵکی بداتەوە.

١٢- یارمەتیدانی خەڵک بۆ سازکردنی فیستیڤاڵی گەشتوگوزار بە مەبەستی خۆشی و کات بەسەربردن.

١٣- هێنانی چاپخانەیەک و دەرکردنی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)، کە گشت ئەو چاکسازیانەی ڕابردوو لەسەر لاپەڕەکانیدا ڕەنگیان دایەوە.

یەکێ لەوانەی بە پەیدۆزی ئەم سیاسەتەی سۆنیان باس کردووە دەڵێ: **(وەک هەر داگیرکەرێکی دی، ژەهر و هەنگوینی تێکەڵ بە یەکدی دەکرد، زۆر جار پەنای دەبردە بەر هێز و زەبر و زەنگ، جاری واش هەبوو دەستی یارمەتیی بۆ هەندێک درێژ دەکردو، ئەم و ئەویشی دەکڕی، بەڵام وەکو ئەوروپاییەکی پێشکەوتوو بیری دەکردەوە، لە تەک ئەوەشدا کوردناسێکی[٤٤] گەورە بوو، لەبەر ئەوە وای بە پەسند زانی چاپخانەیەکی گەورە دابمەزرێنێ)** [٤٥]، قەناعەتیشی بە سێ گەنجی خوێندەوار هێنا، وەک پیت ڕێکخەر و هەڵەچن و چاپکەری ڕۆژنامەکە کار بکەن.

## پێگەی (پێشکەوتن) لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا

پێشکەوتن ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بوو بە قەبارەی ٣٣ سم× ٢١سم، یەکەمین ژمارەی لە بیست و نۆی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ دەرچووە، بەردەوام هەموو پێنج شەممەیەک تا ژمارە سەد و هەژدەی لە بیست و حەوتی تەمموزی ساڵی ١٩٢٢ بە شێوەیەکی ڕێک و پێک دەرچووە.

(پێشکەوتن) تا ژمارە نەوەد و شەش لە بیست و سێی شوباتی ساڵی ١٩٢٢

به چوار لاپەڕە دەردەچوو، لە ژمارە نەوەد و حەوتەوە لە دووی ئاداری ساڵی ١٩٢٢ بە شەش لاپەڕە و قەبارەی ٣٢×٢٠سم دەردەچوو.

لە ژمارە سەد و سێزدەش بە دواوە لە بیست و دووی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٢ دیسان بە چوار لاپەڕە دەرچووەوە، بێ لەوانیش ژمارە هەشتا و سێی بە پێنج لاپەڕە دەرچووە، ژمارەی دیکەش هەیە لەوانەی ناومان هێنان بە چوار لاپەڕە و شەش لاپەڕە دەرچوون.

لە سەرووی لای ڕاستی لاپەڕە یەکی هەموو ژمارەکانی ڕۆژنامەکە لە تەنیشت ناوی ڕۆژنامەکە ئەم ڕستەیە نووسراوە **(همو شتیک بو پیشکوتن دەنوسری)** بە ڕاستی هەر وا بوو، ڕۆژنامەکە هەموو جۆرە بابەت و وتار و هەواڵی لە بوارەکانی سیاسەت ودیرۆک و زانستەکان و کۆمەڵایەتی و ئابووریدا بلاوکردوەتەوە، بە تایبەتیش بایەخی بە بووژاندنەوەی ڕۆشنبیریی کوردی دا، لەو پێناوەشدا، شتی کۆمەڵێ شاعیری دیاری سەردەمی ڕۆژنامەکەی بلاوکردوەتەوە.

مەیجەر سۆنی حاکمی سیاسیی شاری سلێمانی سەرنووسەر و سەرپەرشتکاری ڕۆژنامەکە بوو، گەلێ نووسەر و شاعیریش بۆ ڕۆژنامەکەیان دەنووسی، لەوانە: جەمال عیرفان، شێخ نوری شێخ ساڵح، جەمیل سایب، زەکی سایب، تۆفیق وەهبی، ڕەفیق حیلمی، سەعید سدقی، ڕەشید زەکی، تۆفیق فایەق، عەبدوڵڵا سەبری، مستەفا قەرەداغی، ئەحمەد موختار بەگی جاف، ئەحمەد حەمدیی ساحێبقڕان، مارف عەلی ئەسغەر جیاوۆک، زێوەر، بێخود، عەلی کەمال باپیر و زۆری دیش، زۆربەشیان لە دیارترین شاعیران و نووسەران و ئەدیب و پیاوانی بیر و سیاسەتی دیاری ئەو زەمانی کورد بوون.

(پێشکەوتن) ڕۆژنامەیەکی ڕەسمی بوو، بەڵام لە گشت بابەتەکانیدا تێکەڵ بە خەم و کاروباری گشتی دەبوو، لە شەقام و بازاڕ و چایخانەکاندا لە ژیانی خەڵک نزیک دەبووەوە، لە پێناو پێگەیاندنیان لە ڕووی شارستانییەوە هەوڵی دەدا، هەروەها بۆ وەلانانی ڕەفتاری زیانبەخش و پاشکەوتوو، وێڕای ئەوەی بە فراوانی هەواڵی نێودەوڵەتیی بلاودەکردەوە، کە لە ئاژانسی ڕۆیتەرەوە هەڵی دەهێنجان،

هاوکات پانتاییەکی زۆریشی بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی ناوچەی کوردەواری تەرخان کردبوو، بە تایبەتی شەڕی نێوان هۆزەکان و هێزەکانی سوپای ئینگلیز.

ڕۆژنامەکە سیاسەتی ئینگلیزی بەرامبەر بە کورد دەخستە ڕوو، کە سیاسەتێک بوو زۆر بەڵێنی بە کورد دا، بەڵام ئامانجی ئەوە بوو **(کورد لە نێوان سەربەخۆیی و بندەستیی دەسەڵاتی ناوەند ڕاگرێت، تەنانەت لەوەش دوودڵ بوو، کورد بە دەسەڵاتی ناوەند ببەستێتەوە)**(٤٦).

لەبەر ئەوە ڕۆژنامەکە هەستی نەتەوەیی کوردی پشت گوێ نەخست، بەڵکو دەکرێ بڵێین پاڵی پێوەنا بەرەو پێشەوە، بەڵام بێگومان بەو شێوەی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بگونجێ.

ڕۆژنامەکە هەوڵی دا پشتگیریی خەڵک بەدەست بهێنێ، لەو پێناوەشدا، چینی ڕۆشنبیرانی لە خۆی نزیک خستەوە، ئەوانەی بە دەنگییەوە هاتن بۆ کارکردن لە پێناو بڵاوکردنەوەی خوێندن و ئەنجامدانی ئەو کارانەی لە بەرژەوەندیی گشتیدان و هەوڵێکن بۆ بەرەوپێش بردنی گەلی کورد، کە ئاکامی زۆر چاکی لێکەوتەوە لە بەرەوپێش بردن و بووژاندنەوەی زمان و ڕۆشنبیریی کوردی، هەرچەندە ئەو ئاکامانە زوو بە زوو دەرنەکەوتن، بە تایبەتی کە سەرنجی پاشەکشە کردنی ئاستی ڕۆژنامەکانی شێخ مەحمود دەدەین پاش (پێشکەوتن).

(پێشکەوتن) زۆری بە شان و باهووی دەوڵەتی بەریتانیا و ڕۆڵی شارستانیانەی لە جیهاندا هەڵگوت، لە بەڕێوەبردنی کوردستاندا بۆ مەیجەر سۆن هاوکار بوو، هەروەها بەشدار بوو لە پتر هۆشیار کردنەوەی خەڵک لە بواری ئابووری و کشتوکاڵ و بازرگانی و تەندروستی بە شێوەیەک لە ڕووی قازانجی دارایی و شارستانییەوە سوودی زیاتریان پێ بگەیەنێت.

جا گەر ئەو شتانەی پەیوەندییان بە سیاسەتی ئینگلیزەوە هەیە مایەی گفتوگۆ و ناکۆکین، خۆ ئەوەی کە ناکرێ نکوولی لێ بکرێت ئەو ڕۆڵە گەورەیەی ڕۆژنامەکەیە لە پەرەپێدانی زمانی کوردی و نەهێشتنی ئەو گومانانەی دەربارەی بێ توانایی زمانەکە هەبوون لە ئاست هونەرە جۆراوجۆرەکانی پەخشان، ڕۆژنامەکە بۆ نووسینی

وتاری جۆراوجۆر و نووسینی هەواڵەکانی دەرەوە و ناوەوە و نووسینی ڕیپۆرتاژ و بەدواداچوون و شتی دیکەش، زمانی کوردیی بەکار هێنا.

جا لە پێناو بەجێ گەیاندنی ئەو شتە، (پێشکەوتن) داوای کرد بە زمانێکی پاراوی کوردی بنووسرێ دوور لە کار لێکردنی عوسمانی بە تایبەتی زۆر زاراوەی تازەی بە زمانی کوردی دانا، لە ژمارە بیست و حەوتی لە بیست و هەشتی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠ نیمچە پێشبڕکێیەکی بۆ داهێنانی ئەدەبی ڕاگەیاند و، کڕینی نووسینانێک کە بە کوردییەکی پەتی دوور لە کار لێکردنی فارسی و تورکی و عەرەبی بن، نووسەر تێیاندا لە بابەت سەرپشک کرابوو، لە نێو یازدە بابەتدا کە گەیشتنە ڕۆژنامەکە، سێ بابەتی هەڵبژاردو نووسەرەکانیشی خەڵات کرد، یەکەمیان م. نوری (شێخ نوری شێخ ساڵح)ی شاعیر بوو لە شیعرێکدا کە هانی جوتیاری و کشتوکاڵ دەدات، ئەم شتەشی لە ژمارە (سی)دا ڕاگەیاند، کە لە هەژدەی تشرینی دووەمی ١٩٢٠دا دەرچووە.

ڕۆژنامەکە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک گەلێ لاپەڕەی یەکەمین کتێبی مێژوویی دەربارەی کورد بڵاوکردەوە، کە (شەرەفنامە)ی شەرەفخانی بەتلیسییە، هەروەها کتێبەکەی مستەر ڕیچ دەربارەی گەشتەکەی بە کوردستاندا لە سەدەی نۆزدەهەم[٤٧].

سەرباری ئەوانە چیرۆکی وەرگێڕدراوی ئەلکسەندەر دۆماس و نووسەرانی دیکەی بیانیشی بڵاوکردوەتەوە.

(پێشکەوتن) لە زۆر وردەکاریدا لە (تێگەیشتنی ڕاستی) نزیک دەبێتەوە، کە (بۆ کات و شوێنی خۆی ڕۆژنامەیەکی دەوڵەمەند و پێشکەوتوو) بوو[٤٨]، شوێنێکی دیار و کاریگەریشی هەیە لە کاروانی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا [٤٩].

ڕۆژنامەکە بە هۆی کشانەوەی ئینگلیز لە شاری سلێمانی و تەسلیم کردنی کاروبارەکانی بە شێخ مەحمود، وەستا، لەوەدوا ڕۆژنامەگەریی تەواو کوردی بە دەرچوونی (بانگی کوردستان) لە دایک بوو، کە وا دیار بوو بێ دەرچوونی ڕۆژنامەیەکی ڕەسمی، کارگێڕی و کاروبارەکان بەڕێوە نەدەچوون.

## بانگی کوردستان (بانگ کردستان)

(بانگ کردستان) یا (بانگی کوردستان)، **(ڕۆژنامەیەکی عیلمی ئەدەبی، حوڕو سەربەست و میللی)** بوو، لە شاری سلێمانی بە زمانی کوردی و فارسی و تورکی دەردەچوو، لە چاپخانەی حکومەت لە سلێمانی چاپ دەکرا، مستەفا پاشا [٥٠] خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری بەرپرس و سەرنووسەری بوو، نووسەرانی کوردی و فارسییەکەی عەلی کەمال [٥١] و م. نوری [٥٢] بوون، نووسەری تورکیشی ڕەفیق حیلمی [٥٣] بوو،یەکەمین ژمارەی لە ئابی ١٩٢٢ بە شەش لاپەڕەی قەبارە ٣٤×٥ر٢١سم دەرچووە، بەم شێوەیە مایەوە و بە نارێکی (لە ڕووی کاتەوە) دەردەچوو تا ژمارە سێزدەی لە سێی تشرینی دووەمی ١٩٢٢، دواتر وەستا و دیسان ژمارە چواردەی بە هەمان قەبارە و بە چوار لاپەڕە لە هەشتی حوزەیرانی ١٩٢٣ دەرچوو، پاشان سالّی ١٩٢٦ لە بەغدا سێ ژمارەی دیکەی بە چوار لاپەڕە و بە قەبارەی ئێستای ڕۆژنامە لێ دەرچووە.

بەم جۆرە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بوو بەم قەبارەیە دەربچێت، ژمارەکانیشی بریتی بوون لە (١٤-١) لە ١٩٢٦/١/٢٨ و (١٤-٢) لە ١٥ی شوبات و، (١٤-٣) لە ١ی نیسانی هەمان سالّدا.

لە سەرەتادا، ڕۆژنامەکە ئۆرگانی (کۆمەڵەی کوردستان) بوو، کە لە ٢١ی تەمموزی ١٩٢٢ بە سەرۆکایەتیی مستەفا پاشا یامولکی دامەزرا، دوایی بە ناوی حوکمداریەتی شێخ مەحمودی حەفیدەوە دەدوا، دوای ئەوەی شێخ لە تاراوگەوە گەڕایەوە سلێمانی و حکومەتێکی کوردیی پێکەوەنا.

ڕۆژنامەکە ئامانجی ئەوە بوو خەڵک هان بدات بۆ بەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتیی کورد و ، تەکانێکی گەورە بە بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردی بدات و، بلاّوکردنەوەی زانست و زانین و هۆشیار کردنەوەی گەل، لەو پێناوەشدا پەنای بردە بەر بلاّوکردنەوەی سەروتاری وا، کە وەک نامە و لێدوانی ڕاستەوخۆ وابوون لە سەرنووسەرەوە بۆ خوێنەرانی ڕۆژنامەکەی، سەرباری هەواڵی جەنگ و کۆمەلاّیەتی لە کوردستان و هەواڵەکانی جیهان، بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەست بوون بە

زلهـێـزەكـان و وڵاتانـی دراوسێ، هەروەها گـەلێ پارچە شـيـعـری نيـشـتـمـانی و کۆمەڵایەتی و سۆزئامێزی بڵاوكردۆتەوە.

(بانگی كوردستان) پانتاییەكی باشی بۆ بڵاوكردنەوەی هەواڵەكانی دامەزراندن و تەشريفـات و جـموجـۆڵەكـانی شـێخ مـەحـمـود[٥٤] تەرخـان كـرد بوو، هەروەها هەواڵەكـانی سـەرۆک هۆز و شـۆڕشـەكـەی (سـمكۆ) لە كـوردسـتـانی ئێـراندا[٥٥]، هەروەها ئاگاداریی فەرمانگە حكومییەكانیشی بڵاوكردوەتەوە.

عەبدولڕەزاق بيمار دەربارەی مستەفا پاشای خاوەنی ڕۆژنامەكە دەڵێ: **(ڕێبازی سـيـاسـيی پاشـا پێـچـەوانەی سـيـاسـەتی دەوڵەتی تورک بوو، دەيويست كـورد سەربەخۆيی خۆی وەرگرێت، ئەگەرچی لایەنە دينييەكەشی زۆر بە توندی گرتبوو، بەڵام لە ڕێيەوە لەگەڵ ڕێبازی سياسەتی ئينگليز يەكی دەگرتەوە، كوردپەروەرێكی دڵسۆزو ديار بوو بەڵام ساكارو بێ بەرنامەيەكی حيزبايەتی بوو)**[٥٦].

دەربارەی بايەخی ڕۆژنامـەكـەش دەڵێ: **(ڕۆژنامـەكە بۆ بەڵگەی ڕووداوو هەواڵی ئەو سەردەمە بە تايبەتی كاروباری شار پێش هاتنەوەی شێخ مەحمـوودو لە كاتی گەڕانەوەی شێخ و دامەزراندنەوەی حوكمدارييەكەی دووەمين جاری و بەياننامە بە رووماتەكانی حوكمداردا زۆر بە نرخە)**[٥٧].

بۆ نموونە ژمارە حەوتی ڕۆژنامەكە، كە لە ڕۆژی هەينی بيست و دووی ئەيلوولدا دەرچووە، ئەم بابەتانەی تێدا بڵاوكراوەتەوە:

- پاشـمـاوەی سـەروتاری ژمـارەی ڕابردوو: تێـيـدا ڕوون كـردنەوە و شی كردنەوەيەكی ورد هاتووە دەربارەی كشانەوەی ئينگليز لە شارەكەدا و تەسليم كردنی دەسەڵات بە خەڵكی بە سەرۆكايەتيی ئەنجوومەنێكی ميللی كە شێخ عەبدولقادر بەڕێوەی دەبرد، پاشان بەدواداچوونێكی بەردەوامی هاتنی شێخ مەحمود لە كوێتەوە و ئامادەكارييەكانی كورد بۆ پێشوازی كردنی لە شار و ناوچەكانی كوردنشيندا، هەروەها ئەو پەيوەندييانەی پەيوەست بەو كارە بوون پاشان چەند بەيتە شيعرێک كە لەگەڵ ڕەوشەكەدا دەگونجان، وتار و شيعرەكە بە قەڵەمی مستەفا پاشا نووسراون.
- (ئەدەبياتی كورد) لە نووسينی عەلی كەمال، تێيدا ستايشی ئايينی ئيسلام

و زمانی عەرەبی کراوە کە کاریان لە زمانی کوردی کردووە.

- (وێنەی تەلگرافێک) لە لایەن مەیجەر گۆڵد سمیس-ی حاکمی سیاسییەوە بۆ شێخ عەبدولکەریم ڕەوانە کراوەتە کفری، بۆ ئەوەی لە کاتی گەیشتنی شێخ مەحمود و شێخ غەریب بۆ بەغدا و کفری، ئاگاداری بکاتەوە. ئەو بروسکەنامەیە بوو کە شێخ عەبدولکەریم بۆ شێخ عەبدولقادری ڕەوانە کرد بوو.

- (هیمەتی عالی مەحمودی).. تێیدا ستایشی شێخ کراوە، بەوەی هەر کە چەند دانەیەکی ڕۆژنامەکەی بە دەست گەیشتووە، کۆمەکی پێشکەش بە ڕۆژنامەکە کردووە.

- قسەی حەکیمان.

- (ڕۆیشتن) هەواڵی گەڕانەوەی هەندێ ئاغای عەشیرەتی جافە بۆ هەڵەبجە، پاش ئەوەی شێخ عەبدولقادر داوای کرد بوون.

- پارچە شیعرێکی (فایەق زێوەر) دەربارەی بایەخی زانست و هونەر و زانین.

- (ڕۆیشتن) هەواڵی چوونی هەندێ کەسایەتی بەرەو کفری بەپێی فەرمانی شێخ مەحمود بە مەبەستی وتووێژ کردن.

- یۆنانییەکان ئەزمیریان تەخلیە کرد.

**بەشی تورکی**

- وتاری (حقیقت کردستان) (ڕاستیی کوردستان) لە نووسینی مستەفا پاشا.

- بەراوردێکی بێ ناونیشان لە نێوان سەعد زەغلول و شێخ مەحمود، کە چۆن هەر بە یەک هۆ گیران و دوورخرانەوە،کاتێک زەغلول گەڕایەوە میسر وەک پاڵەوانێک پێشوازی کرا، ڕۆژنامەکە دەربارەی جۆری پێشوازی کردنی شێخ مەحمودو ئەو ڕێزەی لێی دەنرێت، دەپرسێت.

- ئاگادارییەک (ئیعلان) لە دادگای پێکهاتنەوەی سلێمانییەوە سەبارەت بە خانوویەک.

- ئاگادارییەک لە فەرمانگەی ڕاپەڕاندن (ئیجرا)ی سلێمانییەوە سەبارەت بە

زیاد کردنێکی ئاشکرا.

- ئاگادارییەک لە کەسێکەوە، کە کتێبی بە سوودی لە بەغداوە هێناوە بۆ هەر کێیەک بیەوێت.

هەرچی ئەو سێ ژمارەیەیە کە لە بەغدا دەرچوون و لە چاپخانەی (دارلسەلام) چاپ کراون، جۆری خەتی عینوانەکەی لە خەتی کۆنەوە گۆڕاوە بە خەتی فارسی، وشەی (کردستان)یش بە وێنەی (کوردستان) نووسراوە لە تەک نووسینی (Bang Kurdistan) بە پیتی لاتینی، هەروەها مەبەستەکانی ڕۆژنامەکە گۆڕان بە (سیاسی ئەدەبی فەنی) لەگەڵ مانەوەی هەمان دروشمی شیعرئامێزی.

ئەوەشی تێدا زیاد بوو، کە بایەخی بە کاروباری عەرەبی دەدا، بە تایبەتی سووریا و حیجاز و، هەواڵی نێودەوڵەتی، لەگەڵ نەمانی ئاگاداری و مانەوەی بەشە تورکییەکەی.

سەبارەت بە هۆی نەمانی ڕۆژنامەکە لە سلێمانیدا، ئەوەی ئاشکرا کراوە ئەوەیە، خاوەنەکەی مستەفا پاشا یامولکی لە حکومەتدا بە رەئیسی مەعاریف دامەزرا، بەڵام ئێمە لەو باوەڕەداین هۆی ڕاستەقینە ئەوەیە شێخ مەحمود و بە تایبەتی دەست و پێوەندی لە ڕێچکە و ڕێبازی خاوەنی (بانگی کوردستان) ڕازی نەبوون، کە بەوە ناسراوە بانگهێشتی ئەوەی کردووە، دەست تێکەڵاو کردن لەگەڵ تورک وەلاوە بنرێ و هاریکاری لەگەڵ ئینگلیزدا بکرێت، بە مەبەستی دابین کردنی داواکارییەکانی کورد. هەرچی ژمارەکانی بەغدایە، ئەوە بە دوور نازانرێت کە نەبوونی توانا و دارایی هۆی وەستانی بوو بێت.

## ڕۆژی کوردستان (روژ کردستان)

(ڕۆژ کردستان) یا (ڕۆژی کوردستان) ڕۆژنامەیەکی سیاسی ئەدەبی ئیجتیماعی ڕەسمیی هەفتانە بوو، خاوەن ئیمتیاز و بەڕێوەبەری بەرپرسی م. نوری بوو، نووسەرەکەشی عەلی کەمال بوو.

یەکەمین ژمارەی لە ڕۆژی چوارشەممەی ڕێکەوتی پازدەی تشرینی دووەمی ساڵی

١٩٢٢ دەرچووە، هەموو چوارشەممەیەک بەردەوام تا ژمارە دەی لە ١٩٢٣/١/٢٤ دەرچووە، لەوەو دوا لە ژمارە یازدەوە کە لە سێی شوباتی ١٩٢٣ دەرچووە تا دوایین ژمارەی (ژمارە ١٥) لە سێی ئاداری ١٩٢٣ هەموو شەممەیەک دەردەچوو.

هەڵەیەک لە ڕیزبەندی ژمارەکانیدا ڕووی داوە، ژمارە (٣) لە هەردوو ژمارەی ڕۆژی ٢٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢و ژمارەی ڕۆژی ٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢، دووبارە بووەتەوە بێ ئەوەی کارگێڕایەتی ڕۆژنامەکە تێبینی بکەن، بەمە ژمارەکانی ڕۆژنامەکە دەگاتە شازدە ژمارە.

قەبارەی ڕۆژنامەکە ٣٤×١٢,٥سم، بە چوار لاپەڕە بوو، ئۆرگانی (حکومەتی کوردستانی جنوبی)[*] بوو کە شێخ مەحمود ڕایگەیاندو داوای ئازادی و سەربەخۆیی دەکرد، لە پێناو بەدی هێنانی ئەم ئامانجە، هەمیشە ڕەوایی خوستەکانی کوردی ڕوون دەکردەوە، بە گەرمیشەوە سۆز و هەستی بەختەوەرانەی خۆی لە سایەی حکومەتی شێخ مەحمووددا دەردەبڕی، کە وای دەبینی هیوا و ئاواتەکانی رزگاربوون لە دەست بێگانەی تێدا بەرجەستە بووە.

ڕۆژنامەکە هەواڵ و بەیاننامە ڕەسمییەکانی حکومەتی بڵاو دەکردەوە، بە تایبەتی فەرمان و بڕیارەکانی (مەلیک مەحمودی یەکەم) سەرباری هەواڵی وڵات و گەلانی دراوسێی کورد و هێزە کارا و کاریگەرەکان و پەیوەندییە سیاسییە نێو دەوڵەتییەکان.

هەروەها گەلێ وتاری کۆمەڵایەتیی دەربارەی ژیانی کورد بڵاوکردەوە، بەڵام بە مۆرکێکی سیاسی، بوارێکی زۆریشی بۆ بایەخدان بە وێژەی کورد تەرخان کردبوو، بەردەوام پارچە شیعری سیاسیی بڵاودەکردەوە، کە جۆرێک بوو لە شیعرە باوەکانی ئەو ماوەیە، هەرچی سەرچاوەی هەواڵەکانی ڕۆژنامەکە بوو، بەند بوو بە ڕۆژنامەکانی بەغداوە، هەروەک لە زنجیرەی وەڵامەکانی بۆ تێزەکانی ڕۆژنامەی (العراق)و بڵاوکردنەوەی بەیاننامەکانی (الحزب الحر العراقی) (حزبی عێراقی ئازاد) دەربارەی دۆزی کورد، دەردەکەوێت، هەروەها ئاماژەگەلێکیش هەیە بە

(*) لە ریزبەندی ژمارەی ژێدەرو پەراوێزەکان لە دەقە عەرەبییەکەش دا ژمارە (٥٨) پەڕیوە.

ڕۆژنامەی (نجمە کرکوک) کە هەر لەو ماوەیەدا دەردەچوو [٥٩]، بە زۆرییش دوا لاپەڕەی بۆ ئاگاداریی فەرمانگەکانی حکومەت تەرخان دەکرد.
بۆ ئەوەی لە بارەی ناوەڕۆکی ڕۆژنامەکە بیرۆکەیەک بە دەستەوە بدەین، ناوەڕۆکی هەندێ لە ژمارەکانی دەخەینە ڕوو:
- ژمارە (٦) کە ڕۆژی چوارشەممە ٢٧ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ دەرچووە (لەگەڵ تێبینی کردنی ئەوەی بابەتەکان تێکهەڵکێشن لە نێو لاپەڕەکاندا).

**لاپەڕە یەک:** (ویلایەتی مووسڵ لە لۆزاندا) تێیدا نووسەری بابەتەکە م. نوری ڕەوشی دانوستاندنەکان دەربارەی ویلایەتی مووسڵ لە لۆزاندا دەخاتەڕوو، جەخت دەکاتە سەر خواستەکانی کورد و [٦٠] لەم بارەیەوە بۆچوونی کورد دەخاتە بەرچاو، کە ستایشی دامەزراندنی حکومەتی شێخ مەحمود دەکات و داوای بەردەوام بوونی دەکات.

**لاپەڕە دوو:** (یەکبوون) لە نووسینی عارف سایب تێیدا باسی سوودەکانی یەکگرتن دەکات نەخاسمە بۆ کورد، کە داوایان لێ دەکات فرسەتی هاتوو لە دەست خۆیان نەدەن، چونکە مێژوو ڕوحمیان پێ ناکات.

**لاپەڕە سێ:** (ویلایەتی مووسڵ لە مابەینی ٣دا) تێیدا م. نوری بۆچوونی عێراقی و تورکی و بەریتانی سەبارەت بە ویلایەتی مووسڵ دەخاتە ڕوو، بەڵام بە درێژی باسی بۆچوونی کورد دەکات، کە داوای تێکڕای ویلایەتی مووسڵ دەکات لەگەڵ ئەوەی شاری مووسڵ بدرێتە عێراق.

لە کۆتایی وتارەکەیدا، کە نووسەر زانیارییەکانی لە ڕۆژنامەی (العراق)ەوە وەرگرتووە، کورد لەوە ئاگادار دەکاتەوە کە لە ڕۆژێکی مێژووییدان بەوەی ئایندەی هاتوو دیاری دەکات و دەبێ کەس لە قوربانیدان درێغی نەکات.

**لاپەڕە چوار:** هەواڵێکی بێ ناونیشانە دەربارەی سەردانێکی شێخ و سەرۆک هۆزەکان بۆ سلێمانی و دیدەنی کردنی شێخ مەحمود لەگەڵیاندا.
پاشان دوو ئاگاداریی حکومی لە فەرمانگەی تاپۆوە.
- ژمارە (٩) کە ڕۆژی چوارشەممە ١٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٣

دەرچووە (لەگەڵ تێبینی کردنی ئەوەی بابەتەکان بە لاپەڕەکانەوە بەند نەکراون، بەڵکو لە نێوانیاندا تێکهەڵکێشن).

**لاپەڕە یەک:** (کوردستانماڵی کوردانە) لە نووسینی زێوەر.

**لاپەڕە دوو:** پارچە شیعرێکی سیاسیی بێ ناونیشان هی م. نوری- عەلی کەمال.

**لاپەڕە سێ:**

- ناوی چەند کۆمەککارێک کە بۆ هێنانی چاپخانەیەک هاتوونەتە پێش.
- هەواڵی نێودەوڵەتی لە ڕۆژنامەی (نجمە)وە وەرگیراون، ناونیشانەکانیشیان (عوسبەتولئومەم و ئەقەلیات) و (مووسڵ و تورکیا) و (تورکیا لە خسوس ئەقەلیاتەوە فکر ئیتیلافی قبوڵ کردوە) و (موەفەقیەت لۆرد کرزن لە لۆزان) و (مرەخسی حیجاز لە لۆزان).
- (ئیعتیراز) - (پۆزش)ێکی ڕۆژنامەکە سەبارەت بە بڵاونەبوونەوەی هەواڵی تەقاندنی حەوت گولله تۆپ لە کاتی بڵاوکردنەوەی هەواڵی گەیشتنی سمکۆ بۆ سلێمانی لە ژمارەیەکی ڕابردووی ڕۆژنامەکەدا.
- چەند ئاگادارییەک لە دادگاوە.

**لاپەڕە چوار:**

- چەند ئاگادارییەک لە فەرمانگەکانی دادگا و شارەوانییەوە.
- چەند هەواڵێک لە ڕۆژنامەی (نجمە کرکوک)ەوە وەرگیراون، ئەمەش سەردێڕەکانیانە:

(میساق وەتەنیەی تورک لە لۆزان) و (ئەسبابی تەئەخوری مەجلیس لە لۆزان) و (ئیجتیماعی عوسبەتولئومەم) و (ئەسبابی تەئەخوری لۆزان)[٦١].

## بانگ حق (بانگی حەق)

بانگی حەق (بانگ حق) ڕۆژنامەیەکی[٦٢] (سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی غەزەتەیەکی ڕەسمی) بوو لە ئەشکەوتی جاسەنە لە ناوچەی سورداش- باکووری

سلێمانی- لە لایەن (قەرارگاهی عمومی ئوردوی کوردستان)ەوە دەردەچوو، تەنیا سێ ژمارەشی لێ دەرچووە (یەکەمیان لە ڕۆژی بیست و هەشتی ئاداری ساڵی ١٩٢٣، دووەمیان چاپ نەکراو ڕەشنووسەکانی لە چاوەڕوانی ڕەزامەندیی شێخ مەحموددا مانەوە، سێیەمین ژمارەش لە ڕۆژی دوازدەی نیسانی ساڵی ١٩٢٣ دا دەرچووە [٦٣]).

بەپێی چەمکێکی ئایینی ناوی (بانگی حەق)ی لێنرا، هەروەک (ئەدمۆندز)ی حاکمی سیاسیی ئەو کاتی کەرکووک دەڵێ: (ناوی ڕۆژنامەکە بە مەبەست وا دانراوە کە مانەیەکی ئایینی ببەخشێت، حەق لە تەسەوفدا خوا دەگرێتەوە) [٦٤].

ڕۆژنامەکە بە قەبارەی ٢١× ٣٣سم و بە دوو لاپەڕە دەرچووە، لە ژێر ناوەکەشیدا ئەم ڕستەیە نووسرابوو (ناشکێ بە تۆپ و بۆمبا سەرفرازە بانگی حەق) ناوەڕۆکی ڕۆژنامەکەش بریتی بوو لە هەواڵ و ڕاگەیەندراو و ڕوونکردنەوە، تەنانەت ژمارە یەکی بریتییە لە تەنیا وتارێک.

ئەم ڕۆژنامەیە بایەخێکی لە ڕادەبەدەری هەیە بەوەی هەر وەک د. کەمال فوئاد دەڵێ: **(یەکەم ڕۆژنامەیە کە لە لایەن هێزێکی سیاسیی چەکداری کوردەوە بڵاوکرابێتەوە، لەبەر ئەوە سەرەڕای کەمی ژمارەو لاپەڕەکانی، بەڵگەنامەیەکی گرنگە بۆ زیاتر شارەزا بوون و تێگەیشتنی راستی لە بارەی بزووتنەوەکەی شێخ مەحمودو ئامانجەکانییەوە)** [٦٥].

لێرەدا دەقی [٦٦] هەردوو ژمارەی یەک و سێی بە رێنووسی باوی ئەمڕۆ دەخەینە ڕوو.

**ژمارە یەک:**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**(انما المؤمنون أخوة)**

**١- لە بەیاننامەی پێشوو کە بە تاریخی ٨ی مارت ١٣٣٩ [٦٧] نووسرابوو، دوورو درێژ بەیانمان کرد کە ئێمە مەقسودو غایەمان سەعادەت و سەلامەتی ئیسلام و**

قەومی نەجیبی کوردە. ئێمە بە دوو رابیتە برای یەکین، ئەووەلەن ئیسلامین، سانیەن هەموو کوردین، ئەم دوو رابیتەیە ئێمەی وەها یەکدڵ و یەک ئەمەل کردووە کە هیچ کەس بە هیچ لەونێ ئێمە لە یەک جودا ناکاتەوە، لە عەزم مجاهەداتی میللەتییەی خۆمان فەراغەت ناکەین.

٢- وەقتێ کە تەییارەی ئینگلیز شاری سلێمانیی بە بۆمبا بۆردومان کردو ماڵ و منداڵ و عیال و بێ گوناه و بێ دەسەڵاتی ئەم میللەتە مەعسومەی ئاگرباران کرد، ماهیەت و مەعنای مەواعیدو موعاوەنەتی ئینگلیز بە تەواوی مەعلوم بوو، ئەم زوڵم و وەحشەتە لەم عەسری مەدەنییەتدا بۆ مەعنای ئینسانییەت و بەشەرییەت شائیبەیەکی فەجیع و خوێنڕێژانەیە. ئەم فەجایعە مەسئولی ئیحتیمال بەعزێ مەئموورینی ئینگلیز کە تابیعی هەواو هەوەس و سوئی ئیجتهاداتی سەقیمەی خۆیان بوو، ئەمە ئەلبەت زەمان حیسابی دەبینێ، ئەم فەجایعە کەوا بە سەر شاری (لاپەڕە٢) سلێمانی هاتووە وە ئەم تەجاوزە هێشتا بەسەر دێهاتی ئەم میللەتە هەزارە دەکرێ. ئێمە بۆ نەشرو ئیعلانی فەراغەت ناکەین. حکوماتی موتەمەددینە ئەمە نەکرێتە سەمعی ئیعتیبار ئەلبەت رۆژی (غیرة الله) دێتە غەلەیان قەهری مونتەقیمی ئیلاهی تەجەللای سەتتاری عیوبی بەسیرەت و عیبرەت دەبێ. (ولا تحسبن الله غافلاً عما يعمل الظالمون).

٣- بەڵێ بەعزێ مەئمووڕانی ئینگلیز لە خسوس کوردستانی جنوبی[٦٨] سیاسەتێکی زۆر سەتیعیان گرت، مەقسەدو ئەمەلی ئەمانە، ئەم کوردە مەزڵومە ئەم عونسوری ئیسلامە قەهرو تەدمیر (بکەن). حاڵ بۆ کورد، عەزم ئیمانیتان قایمە - لە رێی ئیسلامییەت و بێ سەعادەتی خۆی لە هیچ فیداکارییەک لا نادا، الحمد لله بێ قووەت بێ قودرەت نین، عەزم ئیمانی کورد، بە عەون و عینایەتی باری، بەدخواهان موناففقین مەیئوس و سەرنگون «ولا تحزن إن الله معنا».

٤- ئەمڕۆ رۆژی غیرەتە، رۆژی مرووەتە، ئوردوی کوردستان بە قوماندان و هەیئەتی زابتان و ئەفرادییەوە، ئیلتیحامی منیان کرد. تەرەف تەرەف موجاهدینی شارو

**قیوای میللییەی ئەکراد لە ئحزاراتێکی موتەوالید خەریک و مەشغوڵن، ئێمە هەتا رۆحمان لە بەدەنمانا مابێ بۆ ئیستخلاس و ئیعتیلای ئیسلام و میللەتی کورد بە عەزم و ئیمانێکی تەواو سەرفی ئیجتهادو مەقدەرەت ئەکەین. پشتمان** بە خواو روحانییەتی حەزرەتی فەخری کائینات قایە (حسبنا الله ونعم الوكيل، نعم المولا ونعم النصير).

٥- ئەهلی شاری سلێمانی و تەوابعی و هەموو قەومی کورد ئەمین و موتمەئین بن کە ئێمە سەر لەسەر سەعادەت و خێری ئەوانین، بە قسەی بەعزێ مونافقین و بەدخواهانی ئیسلام و کورد ئیخفال نەبن، هیچ وەختێ ئێمە بۆ میللەتی خۆمان زەرەرمان نابێ، ئەگەر بەعزێ بەدخواهان و خودپەسندان بە زمانی ئێمەوە مەعلومات فرۆشی و قسەی پروپووچیان کرد باوەڕیان پێمەکەن، ئەو نەوعانە لە خۆتان دووربخەنەوە ئەمانە کە بەم تەحرەیە ئفسادان تەعقیبی مەنفەعەتی شەخسییەی خۆیان دەکەن موستەوجیبی نەفرەت و جەزان. لە ئوردوی کوردستاندا جێی ئەم نەوعانە نییە.

٦- وەکو حیسم کردووە ئەهالی لە تەشکیلانی چەتەی ئێمە کەوتوونەتە شوبهەوە. موجیبی شوبهەو تەرەدود هیچ نییە، ئەم چەتانە بۆ موخالیفین و موتەرەدینی حقوقی کورد تەشکیل کراون. دەکەونە فەعالییەت، ئەم چەتانە قیسمەت عەیان و قیسمەت مەجهول و پەنهان. غایەو ئەمەلی ئەم چەتانە عەینی غایەو ئەمەلی کوردو کوردستانە، مەعتوفی سەعادەت و ئیستیخلاسی قەومی کوردانە.

٧- ئینشائەڵلا قەریبەن فەوزو نەسرەتی ئیسلام و کورد دەنوێنێ. تەوفیقات لە خواوەندی عالییانەوەیە خوا لەسەر حەق و خێری ئیسلام و کورد لامان ناداو مووەفەقمان بکا ئامین!...»

**«باش قوماندان و مەلیکی کوردستان»**

**مەحموود**

ژمارەی سێ

لاپەڕەی یەکەم

- تەبریکی رەمەزانی موبارەک

بە شەرەفی حلولی «شهر رمضان الذي انزل فيه القرآن» بانگی حەق/ تەبریکی عالەمی ئیسلام دەکا، خوا میللەتی کورد وەکو ئەقوامی سائیرە لە جەهل و ئەسارەت سەر ئەفرازو بە کەماڵی سروور مووەفەقییەت نائیلی ئامالی میللییەی خۆی و حقوقی سیاسییەو مەدەنییە بکا.

«آمين بە حورمەتی سيد المرسلين»

«بۆ قوماندانی مەفرەزەی هەشتەمی پیادە»

١- تەرەف تەرەف مراجەعەت بە ئێمە دەبێ کە هەیئەتێکی مودافەعەی میللییە تەشکیل بکەن، لەسەر ئارەزوو موراجەعاتی موتەوالییەی میللەتی کورد ئەم هەیئەتە زاتەن لە خۆیەوە تەئەسوسی کردووە.

٢- هەتا ئیستە لە تەرەف ساحیبێکی غیرەت و مروەت ٧٠٠٠و لە تەرەف زاتێکی ترەوە ٣٠٠٠ روپیەو لە تەرەف زاتێکی سالس و رابع هەر یەکی بارێ شەکر بە ناوی ئۆردوو موجاهدین قیوای میللییەی کوردستان تەبەڕوع کراوە. ئەم زەواتە نەشرو ئیعلانی ناوی خۆیان مووافیق نەبینی، لە تەرەف ئەربابی خۆیەوە مەعلومە ئەعمالی ساڵیحە بێ موکافات نامێنێ، خوا ئەم میللەتی ئیسلام و کوردە بگەیەنێ بە حەق و ئیستیقلالی خۆی.

٣- بۆ مەجلیسی وەکالەتی مودافەعەی میللییە تەعلیماتێک گیرایە قەڵەم، سورەتی بە پێچراوەیی رەوانە کرا. ئێمە ئەساسەن بۆ ئیسراحەت و سەعادەتی ئیسلام و کورد تەرجیعی هەموو موشکیلاتێکمان کردووە، لەسەر ئێمە واجیبە هەموو ئارەزوویێکی میللەتی ئیسلام و کورد بەجێ بهێنین، لەبەر ئەمە ئێوەیش بە مەوجیبی ئەم تەعلیماتە بکەونە فەعالییەت.

(وما النصر إلا من عند الله)

«باش قوماندان و مەلیکی کوردستان»

مەحمود

لاپەڕە دوو

**«تەعلیمات بۆ هەیئەتی مودافەعەی میللییە»**

**١- «تعاونوا علی البر والتقوی - صدق الله العظیم»**

**٢- هەیئەتی مودافەعەی میللییە مەجهولە، زەواتی ئەم هەیئەتە یەک تریش ناناسن، هەموو میللەتی کورد ئەعزائی ئەم هەیئەتەیە.**

**٣- ئەم هەیئەتە مەجلیسێکی وەکالەتی هەیە، ئەم مەجلیسە رەئیسی قەدەملی یوزباشی سەید عەبدولڕەزاق ئەفەندی(یە) قومانداني مەفرەزەی هەشتەم، ئەعزاکانی مستەفا ئەفەندی حاجی حەمە سەعیدی قۆمیسەرو وەکیلی زابت ئیبراهیم ئەفەندییە، کاتبی ئەم هەیئەتە شوکری ئەفەندی کوڕی کەریمی عەلەکە ئەفەندییە.**

**٤- ئەسحابی تەبەڕوع ناوو شوهرەتیان داخلی دەفتەری تەبەڕوعات ناکرێ - لە دەفتەری تەبەڕوعات ژمارە موتەسەلسیل وەزع ئەکرێ - تەبەڕوعات لەژێر ئەم ژمارەیەدا قەیدو تەسبیت ئەکرێ، ئەوەی حەز بکا لەگەڵ ئەم ژمارەیەدا ناوو شوهرەتی خۆی قەید ئەکا.**

**٥- موتابیعی تەبەڕوعات موتلەق لە تەرەف مەجلیسی وەکالەتی مودافەعەی میللییە مەقبوزێک ئەدرێ لەم مەقبوزە ئیسم و شوهرەتی دەنووسرێ و نومرەی موتەسەلسیلی دەبێ. ئەم مەقبوزە بە دەست ئەسحابی خێرات و تەبەڕوعاتەوە دەمێنێ بن قوچانی ئەم مەقبوزە کە لە مەجلیسی وەکالەت ئەمێنێتەوە ناوو شوهرەتی حاوی نابێ، نومروی موتەسەلسیلی لەسەر دەبێ.**

**٦- بەم سورەتە کە معامەلە کرا، ئەسحابی تەبەڕوعات دەرەجەی حەمییەت و مورووەتیان لەژێر نومروی موتەسەلسیلی خۆیانا عند الایجاب نەشرو ئیعلان دەکرێ کە لەم ئیعلانە ئەسحابی خەیرات ناویان مەعلوم نابێ، لاکین لە خۆی کیفایەت مەعلوم دەبێ.**

**٧- بۆ ئۆردووی کوردستان و موجاهیدین و قیوای میللییە ئیسلام و میللەتی کورد هەموو شتێک تەرک و تەبەڕوع ئەکرێ، وەکو، پارە، ئەسپ، ئێستر، ئەسلەحە،**

جبەخانە، جامانە، کلاو، کراس، دەرپێ، قوماشی جل، چاکەت، پانتۆڵ، دۆلاق، گۆرەوی، کەوش، سوخمە، بەتانیە کلیم، مسقالی چیت، دەستەسڕ، هەتا دەرزی و دەزوو، شەکر، چایی، کاوڕ، بەرخ، رۆن، برنج، ساوەرو نیسک، نۆک، ئارد، جۆ، پاچ، بێڵ، خاکەناز... الخ.

٨- تەبەڕوعات لە تەرەف مەجلیسی وەکالەتەوە وەردەگیرێ و دەخرێتە ئەنبار، بە پێنج رۆژ دەفعەیەک مەجلیسی وەکالەت دەفتەرێکی تەبەڕوعات تەنزیم و تەقدیم مەقامی باش قوماندانی ئۆردووی کوردستانی ئەکا.

٩- لە تەرەف مەجلیسی وەکالەتەوە دەفتەرێکی مونتەزەمی تەبەڕوعات قەیدێکی ئەنبار بێ خەتاو سەهو تەرتیب و تەنزیم ئەکرێ، ئەمە لەژێر مەسئولیەتی رەئیس و کاتبە ئەعزاکان لە ئەعزای فەعالە.

١٠- ئەمڕۆ رۆژی غیرەتە، رۆژی مروەتە، چاکەو خراپەی ئەمڕۆ گوم نابێ، لە دنیاو ئاخیرەت حیسابی دەبینرێ «فمن یعمل مثقال ذرة خیراً یره ومن یعمل مثقال ذرة شراً یره - صدق الله العظیم»

باش قوماندان و مەلیکی کوردستان

مەحموود

## ئومێدی ئیستیقلال (امید استقلال)

(ئومێدی ئیستیقلال) ڕۆژنامەیەکی (سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی، رەسمییە، هەفتەی جارێک دەردەچێ)، یەکەمین ژمارەی لە بیستی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٣ دەرچووە، ئۆرگانی حکومەتی شێخ مەحموود بوو لە سلێمانیدا، بیست و پێنج ژمارەی لێ دەرچووە، دواین ژمارەی لە ڕۆژی پێنج شەممە پازدەی مایسی ساڵی ١٩٢٤ دەرچووە، لە چاپخانەی حکومەت لە سلێمانیدا چاپ دەکرا.

لە ژمارە یەکەوە تا سێ خواجە ئەفەندی زادەو، ئەحمەد سەبری بەڕێوەبەری بەرپرسی بوون، لە ژمارە چوارەوە تا سێزدە ڕەفیق حیلمی بەڕێوەبەری بەرپرس و سەرنووسەری بوو، حوسێن نازمیش لە ژمارە چواردەوە تا ژمارە حەڤدە بەڕێوەبەری بەرپرس و سەرنووسەری بوو، کە لەوەدوا ئەو پلەیە نەما و تا دواین ژمارەی

ڕۆژنامەکە پەیدا نەبووەوە.

ڕۆژنامەکە هەموو پێنج شەممەیەک بە ڕێکی دەردەچوو، تا ژمارە(١٣) لە ١٣ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٣، پاشان ژمارە چواردەی لە ڕۆژی پێنج شەممە دەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٤ دەرچوو، ئنجا ژمارە پازدەی لە ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ٢٤ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٤ دەرچوو، ژمارە (١٦)ی لە ڕۆژی پێنج شەممەی ڕێکەوتی ٣١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٤ دەرچوو، کەچی ژمارە (١٧)ی لە ڕۆژی پێنج شەممەی ڕێکەوتی ٢١ی شوباتی ساڵی ١٩٢٤ بە پێنج لاپەڕە دەرچووە نەک بە چوار لاپەڕە هەر وەکو باو بوو، ئنجا ژمارە (١٨) لە ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ٦ی ئاداری ساڵی ١٩٢٤ دەرچووە، ژمارە (١٩) لە بیستی ئادار و تا ژمارە (٢٢) بە ڕێکی دەرچووە لە مانگی نیساندا، پاشان ژمارە (٢٣) لە ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ٢٤ی نیسان و ژمارە (٢٤) لە یەکی مایس و دوا ژمارەی لە ڕۆژی پازدەی مایسی ساڵی ١٩٢٤ دەرچووە.

ڕۆژنامەکە، هۆی ئەم نارێکییە لە دەرچوونی ژمارەکانی، هەندێ جار دەداتە پاڵ تێکچوونی چاپخانەکە، بۆیە لەم بارەیەوە پۆزشی بۆ خوێنەران بڵاو دەکردەوە [٦٩].

ژمارەی لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکە چوار بوو، تەنیا یەک ژمارە نەبێت، پێوانەکەشی ٣٤سم یا ٣٤.٣ سم یا ٣٣سم و پانیی ٢١سم بوو، هەر لاپەڕەیەکی دوو ستوون بوو بە پانیی ٧.١ سم و هێڵێکیش بە نێوانیاندا دەهات.

ڕۆژنامەکە لە ژمارە یەکەوە تا ژمارە نۆ لەژێر ناوەکەی خۆی دوو بەیتە شیعری بڵاودەکردەوە بەم جۆرە:

**خودایا بەسیە ئیتر لابرێ دەیجووری ئیزمیحلال**
**تلووعی پێ بکە خورشیدی ڕۆژی پاکی ئیستیقبال**
**لەگەڵ خولیای هیجرەت بەسەرچوو عومری شیرینم**
**جا نۆبەی ویساڵە، ئاه.. ئای ئومێدی ئیستیقلال**

زمانی ڕۆژنامەکە کوردییە، بەڵام بابەتی بە هەردوو زمانی تورکی و فارسیش بڵاوکردوەتەوە، بەڵکو لە هەندێ ژمارەیدا، لە ژمارە چواردەوە، دوو بەشی تایبەت

بەم دوو زمانەی تەرخان کرد، بە ڕادەیەک زۆربەی بابەتەکانی دوا ژمارە (نزیکەی سێ لاپەڕە) بە زمانی تورکی بوون.
ڕەوتی ڕۆژنامەکە ڕەوتێکی روونی نەتەوەییە، داوای یەک دەنگیی کوردی دەکرد، هەروەها داوای دەکرد لە پشت سەرکردایەتیی شێخ مەحموودەوە بوەستن کە بە مەلیکی کوردستان پەسنی دەکرد، لەو پێناوەشدا پەنای بردە بەر بڵاوکردنەوەی وتارو شیعری سیاسیی نیشتمانی و حەماسی و هەڤپەیڤین، بە زۆری لە نووسینی ئەحمەد سەبری و، ڕەفیق حیلمی و ، حوسێن نازم و، ئەحمەد فەوزی و، زێوەر، هەندێ جاریش لە نووسینی محەمەد عارف و، ڕەشید زەکی و، ئەحمەد فایزو برێ جاریش بە واژۆی (ئومێدی ئیستیقلال).
لەپێناو بەجێ گەیاندنی ئامانجەکانی، ڕۆژنامەکە بە شێوەیەکی فراوان و سەرنج ڕاکێش پەنای بردە بەر بڵاوکردنەوەی هەواڵ و ڕاپۆرتە هەواڵ و کورتە بەدواداچوون، تەنانەت ژمارە نۆزدەی بێ لە کورتە هەواڵ چی دیکەی تێدا نەبوو، کە سەرلەبەری لاپەڕەکانی گرت بووەوە، هەروەها ئاگاداریی فەرمانگە ڕەسمییەکانیشی بڵاوکردوەتەوە، بە زۆرییش لاپەڕە چواری بۆ ئەم جۆرە شتانە تەرخان دەکرد.
هەروەک چالاکی و ئاگادارییەکانی حکومەتی شێخ مەحموودیشی بڵاودەکردەوە، بە تایبەتی هەواڵەکانی (کابینەی وەزارەت) و بەرزکردنەوە یا دامەزراندن و گواستنەوەی گەورە فەرمانبەرانی.
ڕۆژنامەکە بایەخێکی زۆری بە هەواڵەکانی عێراق و تورکیا و بەریتانیا و ئێران دەدا، لە هەوڵێکدا بۆ **(بەدەست هێنانی مەیلی گشت لایەنەکان و بێ ئەوەی هەڵوێستێکی نەیاری هەبێت دژ بە هیچ لایەنێک، هەواڵەکانیشی لە ڕۆژنامە عێراقییەکان هەڵدەهێنجا، لەوانە (العراق) و (الامل) و (نجمه) و (الاستقلال)، هەروەها ڕۆژنامەی میسری وەک (المقطم) و هەندێ ڕۆژنامەی تورکی و ئێرانی، وەک (شفق سرخ))**.
ڕۆژنامەکە بە بایەخێکی زۆر و تەواو بێ لایەنانەوە پەیدۆزی هەواڵەکانی کێشەی ویلایەتی مووسڵ و ماددەکانی پەیماننامەی لۆزانی کردووە.

لێرەدا هەندێ لە بابەتەکانی ڕۆژنامەکە دەخەینە ڕوو، بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی ڕوونتری لە بارەوە وەرگرین [٧٠].

١- بۆ حزور مەلیک موعەزەم دامە شەوکەتوهو، قەراری مەجلیسی میللی وایە حەزرەتی مەلیک دامە شەوکەتوهو بە سورەتێکی عاجیل بە هەر نەوعێ خۆی تەسویب ئەفەرموێت بۆ سەلامەتی وەتەن و میللەت تەئمینی موخابەرەو مناسەبەتی و رابیتەی حیمایە لەگەڵ حکومەت بەریتانیاو دۆستی لەگەڵ حکومەت عراقدا بکات.

ئیتر ئەمر ئەمری ئولوئەمرە.

رەئیسی مەجلیسی میللی و رەئیسی داخلیە

غەریب

بۆ جەنابی رئیس مەجلیسی میللی و رەئیسی داخلیە

جوابی ٢٢ی ئەیلوول ١٣٣٩و ١ ژمارەیە

لەو رۆژەوە کە هاتوومەتەوە بۆ دەسەلاتی وەتەن و میللەت تا ئێستا بۆ تەئمین رابیتەو مناسەبەت لەگەڵ حکومەت بەریتانیا دۆستایەتی لەگەڵ عراقدا زۆر مخابرە جەریانی کردووە پاش نەکەوتوین ئومێد ئەکەم، بەم زوانە نەتیجە خەبەر یەقینمان دەست کەوێ.

مەلیک کوردستان

مەحمود [٧١]

٢- زیارەت خەلیفەی ئیسلام

ئەستانبۆل ٢٨ی ئەیلوول ٣٩٩ - ئەمرۆ جەنەراڵ هارینغتون و بو ویداع چوونە خزمەت خەلیفەو زیارەتیان کردووە. خەلیفەی حەزرەتمەئاب قتعەیەک فۆتۆغرافی بە دەستی خۆی ئیمزاو بە (لێدی هارینغتون) ئیهدا فەرمووە [٧٢].

٣- بۆ حزوور عالی ریاسەت مەجلیسی میللی و مەعاریف و تیجارەت مەقالەیەک لە تەرەفی جەنابی عادل ئەفەندییەوە بۆ مەنافیعی وەتەن و تەرەقی مەعاریف و سەروەت نووسراوە نێرروا بۆ غەزەتەی «ئومێدی ئیستقلال» چەند بەحسێک

**وجهاتی مهیمەی تێدایەو هەموویشی لە نوسخەیەکدا دەرجی مومکین نییە، بە ناوی مەنافیعی وەتەنەوە رجا ئەکەم کە هەتا نیهایەتی نەزەر موسبەق و ئەهمیەتەوە تەعقیب و ملاحەزە بفەرموون، ئینشائەڵڵا بە زوویی سەمەرەی دەبینین و مەعلووم دەبێ کە میللەت زەوقی خزمەت و تەرەقییان هەیە.**

**ئیتر دوعای موەفەقییەتتان**

**مدیری مەتبەعە: ئەحمەد سەبری**[٧٣]

پاشان یەکسەر و لە ژێر ئەوەدا ڕۆژنامەکە وتارێکی بە ناونیشانی (بوون و ژیان بە سەروەتەوە - سەروەت بەچی و چۆن حاسڵ ئەبێ؟) بڵاوکردوەتەوە، ئەم وتارە هەردوو لاپەڕە دوو و سێی گرتووە، لە کۆتاییەکەشدا نووسراوە (ماویەتی)، دواتر پاشماوەکەی لە ژمارە یازدەی ڕۆژی بیست و نۆی تشرینی دووەمی ١٩٢٣دا بڵاوکراوەتەوە، کە پتر لە نیوەی لاپەڕە چواری گرتوەتەوە، لە کۆتاییەکەیدا دیسان نووسراوە (ماویەتی)، بەڵام ئەم پاشماوەیە دواتر هەر بڵاونەکرایەوە.

٤- ڕۆژنامەکە بابەتی وەرگێڕدراوی لە ڕۆژنامە عیراقییەکانەوە بڵاوکردوەتەوە، لە ژمارە هەشتدا وتارێکی بە ناونیشانی (تەرجەمە لە مەتبوعاتی عراق، قەومیەت لە فەوقی کوللی شتێکەوەیە) بڵاوکردوەتەوەو یەک لاپەڕەی تەواوی گرتووە.

لە ژمارە دەشدا وتارێک لە ڕۆژنامەی (الامل)ەوە وەرگێڕدراوە بە ناونیشانی (مووسڵ کلیلی شەرق ئەوسەتە) وتارەکەش لە دامەن دا ئیمزای (الامل - الموصل)ی پێوەیە.

لە لاپەڕە سێی ژمارە شەشی دا (ئومێدی ئیستیقلال) ئەم هەواڵەی بە ناونیشانی (نەشری غەزەتە) بڵاوکردوەتەوە، (شاعیر و فەیلەسووف شەهیر جەنابی مەعرووفی ڕەسافی ئەفەندی لە بەغدا غەزەتەیەکی بە ناوی (الامل) بڵاوکردوەتەوە،داوای موەفەقیەتی بۆ دەکەین) جا زۆر جار هەواڵەکانی لە (الامل)ەوە وەردەگرت.

٥- ئیفادەیەکی مەخسووس

به فەرمانی حەزرەتی مەلیک، کاروباری نووسین و بەڕێوەبەرایەتی نووسین لە ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال) بە من سپێردرا، تێیدا تەنیا بە ناوی بەرژەوەندی و سەلامەتیی نیشتمان بەڵێنم داوە، چونکە ڕێیەکی ڕاست و دروست و دوور لە خلّت و خاشی مەبەستی شەخسییە، واتای ڕۆژنامە و ڕێبازی ڕۆژنامەنووسی، ڕەچاوکردنی میزاجی نەتەوەیی و دەست گرتن بە بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانە، ئاشکرایە ڕۆژنامە بریکاری چیرۆک، وەرگێڕان، هزر و نەغمەی زمانی گشتییە، جا پێویستە ئەم بریکاری و ئەم وەرگێڕان و ئەم نەغمەیە بە ڕێڕەوێکی بێ لایەن و ڕۆحێکی بێگەرددا گوزەر بکات، ئەمەش کارێکی سروشتییە مادام بریکارێتییەکە بریکاریەتێکی گشتییە، بڵاوکردنەوەی کارێکی پێویستە، بۆیە نووسەری ڕۆژنامە کاتێک شتێک دەنووسێ، ناچارە لە نووسینی هەر پەیڤێکیدا وریا بێت و تێبینی و وەڵامیان لە ئاستدا دابنێت، گەر نا فەلاکەت و بەڵا بەسەر نیشتمان و گەلەکەیدا دێنێت.

وێڕای ئەوە ڕۆژنامە هەر تایبەت نییە بە دەڤەرەکەی خۆی،فڕۆکە بە هەموو شوێنێکدا گوزەر دەکات، بۆیە پێویستە بگونجێ لەگەڵ زمانی دراوسێ و بە کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی بابەت بڵاوبکاتەوەو پێیان بنووسێ، بەم هۆیەوە دۆستایەتی و خۆشەویستیی دراوسێکان و پشتگیرییان بەدەست دێنین.

لە واقیعدا من توانای نووسینم نییە بە زمانی عەرەبی، بەڵام ئەم خزمەتە لە ئەربابی بە توانا دەخوازم.بۆ ئەوەی بە ناوی خزمەتی نیشتمانەوە کەموکوڕی نەنوێنن، بە لای سیاسەتدا ناچم و هەر وتار و باسێکی زیان بە سیاسەت و سەلامەتیی مەملەکەت بگەیەنێت، قبووڵی ناکەم و بڵاویشی ناکەمەوە.

بێ لە ڕووداوی ناوخۆ و ئەوانەی وەریان دەگرم بنەمای ڕێبازم تاقیب کردنی تەرەقیی مەعاریف و پشتیوانی کردن لە بەرژەوەندییە ئەدەبی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی مەملەکەتە، لەم سنوورەدا تکا دەکەم و ئومێدەوارم دەستی یارمەتیم پێ بگات لە گشت بە توانا و نیشتمانپەروەران.

حوسێن نازم (٧٤).

پاشان هەر لە لاپەڕە چواری هەمان ژمارەدا ئەمە بڵاوکراوەتەوە: بۆ ئەو کەسانەی توانای عەرەبی نووسینیان هەیە، هەر وەکو لە ئیفادەیەکی مەخسووس لە بەراییدا ڕوونم کردەوە، کە توانای عەرەبی نووسینم نییە، بۆ ئەو شتە پشت بە ئەربابی توانا دەبەستم و لەم بارەیەوە دریغی نەکەن بەو شێوەیەی ڕێبازی ڕۆژنامەکە سەر دەخات.

حوسێن نازم [٧٥]

٦- بۆ جەنابی بەڕێوەبەری ئومێدی ئیستیقلال

لە دەی کانوونی دووەمدا هەواڵێکم خوێندەوە کە لە ڕۆژنامەی (ستارە)ی ئێرانەوە وەرگیراوە و لە ژمارە چواردەی (ئومێدی ئیستیقلال) دا بڵاوکراوەتەوە، تێیدا فەرمووتانە حکومەتی ئەنقەرە بە ڕەسمی و تایبەت بڕیاری داوە دەربارەی ئێران بنووسێ حکومەتی ئێران و ، حکومەتی ئێرانیش لە بری حکومەتی عوسمانی بنووسێ حکومەتی تورکیا[٧٦]، من وەک تاکە کەسێکی موسڵمان ئەم زاراوەم پێ ناپەسندە، چونکە ئەو حکومەتە ئیسلامییەی لە ماوەی حەوت سەد ساڵدا بە ناوی عوسمانییەوە ناسراو تا ئێستاش هەر بەو ناوە ماوەتەوەو تایەفەی نەجیبی عوسمانییش مەحف نەبووەتەوە و خیانەتیان لەگەڵ ئیسلامدا نەکردووە بەو شێوەی شایان بە مەحف کردنەوە بن.

جا بەپێی ئەمە ئەو زاراوەیە سەبارەت بە سەراپای ئیسلام ڕەنگدانەوەی خراپی دەبێت.

ئەم شتەش لە ڕووی دیانەت و دۆستایەتییەوە دەخەمە ڕوو، مادام حکومەتی عوسمانی ناوەکەی دەگۆڕدرێ و ئەو حکومەتە حکومەتێکی ئیسلامییە و چاودێریی موسڵمانان دەکات، وا چاکە بە شێوەیەکی ڕەسمی و نارەسمی هەر بە حکومەتی ئیسلامی بنووسرێت.

تکا دەکەم ئەو پاڕانەوەیەم لە گشت چاپەمەنییەکاندا بڵاوبکەنەوە.

سەرۆکی ناوخۆ/غەریب [٧٧].

٧- (دیدەنیی سەیر)

هەروەکو لە ڕۆژنامەکانی عیراق و گشت بەغدا خوێندمانەوە، کە عیزەت بەگی

عوسمان پاشاو، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی میرزا فەرەج و، محەمەد بەگی فەتاح بەگی جاف بەبێ هەڵبـژاردن وەک نوێنەرانی لیـوای سلێـمـانی دامـەزران، ئەمـە ڕێکەوتێکی سەیرە و بەپێی یاسا بنەڕەتییەکان دامەزراندنی نوێنەران بە هەڵبژاردن مـافی گـەلە، بەڵام نازانین ئەو زاتانە چۆن بێ ئاگـاداریی گـەل کـرانە نوێنەر، لەو باوەڕەشداین ئەمانە بڕیاری دامـەزراندنیـان دراوە، بە مەئموورییەتی نوێنەرایەتی، ئێمـەی کە لە خوارەوە ناومـان هاتووە و ، ئێمـەی دەستەی ئەشراف و مـاقوولان و زانایان و بازرگـان و خـەڵکی کـاسبکاری سلێـمـانی هیچ شـتـێک دەربارەی ئەم هەڵبژاردنە نازانین، هیچ هەواڵێک دەربارەی ئەو هەڵبژاردنە لە مەملەکەتی ئێمەدا بڵاونەکراوەتەوە، مەحاڵە کورد بەوە ڕازی بێت نوێنەریان لە دەرەوە بۆ دەست نیشان بکرێت دوور لە دەسەڵات و مافی گەل.

نابێ مەندووبی خاوەن شکۆ یا حکومەتی بەرزی عەرەب ئەم مافە ڕەوایەمان لێ داگیر بکەن و لە پێناو خواستی (هەندێ کەس) دا پێشێلی بکەن، ئەمە شتێکی سەیرە (فأعتبروا يا أولي الابصار).

نوێنەری مـەحکومی گـەلە، بە واتا گـەل مـافی خـۆیەتی نوێنەری هەڵـبـژێرێت، چونکە ئێمە کاتێک نوێنەرێک هەڵدەبژێرین، لە پێناو دابین کردنی مافەکانی گەل و پڕکـردنەوەی کەمـوکـوڕییـەکـانی ناوخـۆیە، ئێـمـە لە نێـو خـۆمـاندا و بە ئـوسـووڵ، کەسانێک هەڵدەبژێرین کە مەرجی یاساییان تێدایە، ئەو مافەمان هەڵواسیوە، تا ئەو کـاتەی ڕاستی دەردەکەوێت و مـاف و وجوودمـان لە ئەنجوومەنی میللیدا پێ دەدرێتەوە.

هەروەکـو گـوتمان و لەبەر ئەوەی ئەو نوێنەرانە لە لایەن ئێمـەوە هەڵنەبژێردراون، بۆیە پشتیان پێ نابەستین و پەیوەندیشمـان نییە بە بڕیار و بەڵێنەکانیان، بۆ ئەوەی ئەم شـتـەش لە لای هەمـووان ئاشکرا بێت بە ناوی هەمـووانەوە ئاگـادارییـەک لە ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال دا [٧٨] بڵاو دەکەینەوە.

یاداشتەکەش لە لایەن دوازدە کەس لە ئەشرافی مەملەکەت و دە زانا و حەڤدە بازرگان و حەوت کوتاڵفرۆش و هەشت کەس لە سەیدان و دە کەس لە مووسەویان

(جوو)و ده عەتارو ده وەستای دروست کردنی پێڵاو و نۆ بەقاڵ و پێنج ئاسنگەرەوە ئیمزا کراوە، دواتر ڕۆژنامەکە لە ژمارەی دواتردا ئاماژەی بەوە دا کە ناوی حەفید زادە شێخ قادریش دەرنەچوو بوو.

٨- هەواڵەکانی بەغدا- بەدنیەتی

(لە نزیک شوێنی مانەوەیان، دوو سمێڵ بابڕ دەستدرێژییان کردە سەر شێخ عودەی ئەلجەریان و شێخ سلێمان ئەلبەڕاک کە نوێنەری هۆزەکانی حللەن، لە ئاکامدا زۆر بە خراپ دەست و قاچیان بریندار بوو و گومان لێکراوان دەستگیر کران، دوای لێپرسینەوە هەندێکیان بەرەڵلا کران و ئەوانەشی پەیوەندییان بەم کارەوە نییە ئازاد دەکرێن)[٧٩].

ئەم ڕووداوە بە تەبیعەتی حاڵ لە چوارچێوەی گرفتەکانی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی تەئسیسی دا بوون لە ڕۆژگاری خۆیدا.

هەروەها ڕۆژنامەکە دەچووە نێو گفتوگۆوە لەگەڵ بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی (شفق سرخ)ی ئێرانی و ڕۆژنامەی (العراق)یش.

وەستانی (ئومێدی ئیستیقلال) هەر وەک ڕۆژنامەکانی دیکەی شێخ مەحمود، بەند بوو بە نوشست هێنانی بزووتنەوەکەی شێخ مەحمودەوە.

## ژێدەر و پەراوێزەکانی بەشی دووەم

١- عبدالرزاق الحسني، تاريخ الصحافة العراقية، الجزء الاول، الطبعة الثالثة، صيدا، لبنان، ١٩٧١، ص٧.
٢- د. علي الوردي، لمحات اجتماعيه من تاريخ العراق الحديث، ج٣، بغداد، ١٩٧٨، ص١٦٣، ص٢٤٩.
٣- مەبەستمان کوردەکانی ویلایەتی مووسڵ و ئەو کوردانەی بە تایبەتی لە بەغدادا نیشتەجێن.
٤- مژدەهێنانی دۆمەنیکان لە ساڵی ١٨٥٦ەوە چاپخانەیان لە مووسڵدا هەبوو، ساڵی ١٨٦١یش یەکەمین کتێب بە ناوی (رياضة درب الصليب)ی لێ چاپ کرا، (چاپخانەی ویلایەت)یش لە ساڵی ١٨٧٥دامەزرا، ڕۆژنامەی (الموصل) و چاپەمەنییەکانی دیکەی چاپ دەکرد.
٥- هادی طعمه، الاحتلال البريطاني و الصحافه العراقيه، بغداد، ١٩٨٤، ص٩٥.
٦- بڕوانە: د. جەبار قادر، ڕۆژنامەی (کورد) و چەند زانیارییەکی نوێ، (کاروان) گۆڤارە، هەولێر، ژمارە ٣٢، مایس ١٩٨٥، ل٧.
٧- د. کەمال مەزهەر، کوردی سلێمانی و بەغدا لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا، لێکۆڵینەوەیەکی بڵاونەکراوەیە (بە بۆچوونی د. کەمال، ژمارەکە بەپێی ئاماری جۆراوجۆری ڕەسمی و ڕێژەی زیادبوونی ساڵانەی دانیشتووانی عێراق لە شار و گوندەکانی سەردەمی پاشایەتیدا دیاری کراوە).
٨- وەزیرانی وەک حەمدی و جەمال و جەلال و ئەحمەد موختار لە بنەماڵەی بابان و عەبدولڕەحمان و ئیبراهیم داود لە بنەماڵەی حەیدەری و سەبیح نەشئەتی هەولێری و ئەفسەرانی وەک بەکر سدقی و ئەمین زەکی سلێمان و فوئاد عارف و لە بازرگان و سەرمایەدارانیش فەتاح پاشا (خاوەنی گەورەترین کارگەی کوتاڵ)و عەبدوڵلا لوتفی و محەمەد تەیب حەوێزی (خاوەنی گەورەترین دوو کارگەی جگەرە)، جگە لە خاوەن خانەکانی وەک میرزا فەرەج ئال شەریف نوێنەری سلێمانی لە ئەنجوومەنی تەئسیسی ١٩٢٤ و ئەنجوومەنی نوێنەران ١٩٢٨ (خانەکەی لە سەرەتای شەقامی ئەلئەمیندا بوو) و ئەحمەد ئاغای کەرکووکی زادە نوێنەری کەرکووک لە ئەنجوومەنی نوێنەران ١٩٣٧ (خانەکەی لە سەرەتای شەقامی ئەلجسر بە لای شەقامی ڕەشیددا بوو).
٩- د. کەمال مەزهەر، کوردی سلێمانی و بەغدا.
١٠-مارف جیاوۆک، مەعروفی کوڕی عەلی ئەسغەر، ساڵی ١٨٨٤ لە بەغدا لە دایک بووە و لە ١٩٥٨/١/٢١ هەر لەوێدا کۆچی دوایی کردووەو لە هەولێردا نێژراوە، چونکە خانەوادەکەی سەر بە هۆزی باڵەک بوون لە قەزای ڕواندزی سەر بە دەڤەری هەولێر، دەرچووی قوتابخانەی ماف بوو لە ئەستانە، لە شارەکانی کەرکووک و هەولێر و دیوانیە و حەی و مسەیب و کەربەلا و حللەدا بووەتە دادوەر، هەروەها پایەی دیکەی دادگەریی وەرگرتووە، وەک نوێنەری هەولێر هەڵبژێردراوە، پتر لە جارێکیش وەک یەکەم جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران دەست نیشان کراوە، ساڵی ١٩٤٤یش بە متەسەڕیفی سلێمانی دامەزرا، لە ئەنجوومەنی نوێنەراندا لە گفتوگۆ و توندڕەویدا چالاک بوو، لە سەرەتای داگیر کردنی عیراق، ئینگلیزەکان لە بەسرا بە دیلیان گرت، لە ساڵی ١٩١٤ەوە تا ساڵی ١٩١٩ هەر لە گرتووخانەدا مایەوە، چەند کتێبێکی داناوە (دۆزی کورد-١٩٢٥) و (ڕێنووسی زمانی کوردی- ١٩٣٠) و (کارەساتی بارزان-ی زوڵم لێکراو- ١٩٥٤) و (نوێنەرایەتیم- ١٩٣٨) ئەو کتێبانەی بە زمانی عەرەبی بوون و کتێبی (پەند و قسەی نەستەق - ١٩٣٩)یشی بە کوردی داناوە.

١١- عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی، ژێدەری پێشوو، ل٧٠.
١٢- حکومەت مۆڵەتی (یانەی سمکۆ شکاک)ی لە ساڵی ١٩٣٥ نەدا، کە ژمارەیەک گەنجی ڕۆشنبیری کورد داوایان کرد بوو، وەک بەرامبەرێک بۆ (یانەی ئەلموسەننا) کە عەرەبە قەومییەکان دایانمەزراند بوو، سمکۆی شکاکیش سەرکردەی شۆڕشی کورد بوو لە کوردستانی ئێراندا.
١٣- د. کەمال مەزهەر، کوردی سلێمانی و بەغدا.
١٤- عەلی کەمال باپیری شاعیر، یەکێکە لە کارمەندانی گۆڤارەکە دەگێڕێتەوە: (ئیمتیازی ڕۆژنامەیەک - (لەوانەیە مەبەستی گۆڤار بێت- لێکۆڵەر)مان بە ناوی بانگی کورد، بەدەست هێنا، نیوەی بە زمانی تورکی و نیوەشی بە زمانی کوردی، تورک جلەوی دەسەلاتیان لەدەست دا بوو، ئەویش- واتە ڕۆژنامەکە- سیاسی و ئەدەبیش بوو، سێ چوار دانەمان دەرکرد (مەبەستی ژمارەیە- لێکۆڵەر) کاتێکیش ئینگلیز هاتن، سێ چوار دانەمان هەڵگرتبوو، بە زۆری لێمانیان سەندن و گوتیان ئەمە شتی مێژووییە، ئنجا بردیانن بۆ لەندەن (گۆڤاری کاروان، ژمارە شەش، ساڵی ١٩٨٢).
١٥- بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية/ زاهده ابراهيم، كشاف الجرائد و المجلات العراقية، بغداد، ١٩٧٦/ جەبار جەباری، مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی/ مير بصري، اعلام الكرد، دار رياض الريس للكتب و النشر، لندن- قبرص، ١٩٩١.
١٦- منذر الموصلي، ژێدەری پێشوو، ل٣٦١.
١٧- جەمالەدین بابان، جەمال کوڕی ڕەشید کوڕی عەبدوڵلا بەگ کوڕی خالید پاشا کوڕی ئەحمەد پاشای بابان، لەدایک بووی بەغدا ١٨٩٣، ساڵی ١٩١٤ قوتابخانەی مافی لە بەغدا تەواو کردوە، بە پلەی جێگری ئەفسەر و دواتر وەک مولازمێکی سوپای عوسمانی بەشداری لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا کرد، پاشان لە شەوی داگیر کردنی بەغدا ئینگلیزەکان بە دیل گرتیان و گواستیانەوە بۆ هیندستان، ئنجا بە پلەی مولازم پەیوەندیی بە سوپای شۆڕشی عەرەبییەوە کرد لە عەقەبەداو پاشان بوو بە سەرۆک و فەرماندەی بەتەریەی تۆپخانە، ساڵی ١٩٢٠ گەڕایەوە بەغدا و بووە پارێزەر، پاشان دادوەری سزا لە دادگاکانی بەغدا و سلێمانی و مووسڵدا، لە ١٣ی ئایاری ١٩٢٨ وەک نوێنەری هەولێر بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران (نوواب) هەڵبژێردرا، پاشان دووبارە لە ساڵانی ١٩٣٠، ١٩٣٣ بە نوێنەری مووسڵ هەڵبژێردرا، پاشان وەک نوێنەری هەولێر لە ١٩٣٤- ١٩٣٥ هەڵبژێردرا، هەروەها لە ساڵانی ١٩٣٧- ١٩٣٩ و ١٩٤٠-١٩٤٣، لە ١٩٣٠/٣/٢٣ پۆستی وەزارەتی دادی لە یەکەمین کابینەی وەزاریی نووری سەعیددا وەرگرت، لە ١٩٣١/١٠/١٩یش لە دووەمین کابینەی وەزاریی هەمان کەسدا و لە ١٩٣٣/١١/٩یش لە یەکەمین کابینەی ئەلمەدفەعی و لە ١٩٤٣/١٠/٢١ لە دووەمین کابینەی ناوبراودا، هەروەها لە ١٩٣٤/٨/٢٧یش هەمان پۆستی لە کابینەکەی ئەیووبی و لە ١٩٤٧/٣/٢٩ لە کابینەکەی ساڵح جەبر و لە ١٩٥٢/٧/١٢یش لە کابینەکەی مستەفا عومەری دا هەمان پۆستی هەبوو، ئینجا پۆستی وەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتیی لە ١٩٤١/١٠/٩دا لە شەشەمین کابینەی نوری سەعیددا وەرگرت و لە ئاداری ١٩٤٧ بووە نوێنەری سلێمانی، پاشان لە تەمموزی ١٩٤٧ەوە تا ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٥٥ بووە ئەندام لە ئەنجوومەنی ماقوولاندا (مجلس الاعيان)، دواتر لە (تشرینی دووەمی ١٩٥٥ەوە تا ١٩٥٨/٧/١٤) لە هەمان پۆستدا بوو، لە ١٩٦٥/١/١١دا لە بەیروت کۆچی دوایی کردوە.
١٨- پیرەمێرد هێشتا هەر لە تورکیا بوو گۆڤارەکەی بە ڕێکوپێکی وەردەگرت، (ئومێد ئاشنا، چەند ڕۆشنایییەکی نوێ بۆ سەر گۆڤاری بانگی کورد، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١٩، ئەیلوول ١٩٨٨، ل٦٠).
١٩- جەبار جەباری، ژێدەری پێشوو، ل٢٥.

٢٠- عومەر نەزمی، عومەر نەزمی سەفوەت مەلا محەمەد (لەدایکبووی کفری ١٨٩٤- کۆچی دواییەکەی لە بەیروت ١٩٧٨) لە خێزانێکی زانست پەروەردا گەورە بووە، قانوونی لە ئەستەمبوڵدا خوێندووە، دوای دەرچوونی لە ساڵی ١٩٢٠ گەڕاوەتەوە عێراق و بووەتە دادوەر لە زۆر شاری عێراقدا تا بووە سەرۆکی دادگاکان و ئنجا بووە متەسەڕیفی مووسڵ، دواتر بووە وەزیر لە چەند پۆستی وەک کاروباری کۆمەڵایەتی، داد، ناوخۆ، هەندێ جاریش بۆ ماوەیەکی کەم بوو بە وەزیری بەرگری یا جێگری سەرۆک وەزیران، بێلایەن مایەوە و نەچووە ڕیزی هیچ پارتێکی سیاسی، ڕۆڵەکانی ئەمانەن، جەمال (١٩١٤-١٩٦٨)، کەمال (١٩٢٠)، نەزیهە (١٩٢٥) و بەدیع (١٩٣٠)، جەمال- یان چەند ڕۆڵێکی دیاری سیاسیی بینیوە، هەروەها کورەکەشی د. وەمیز جەمال عومەر نەزمی.

٢١- بەهادین نوری، بەهادین کوڕی شێخ نورەدین کوڕی ئیسماعیل کوڕی حەسەن بەگ شێروانی، باوکیشی شێخ نورییە، باوکی (لە دایکبووی هەولێرە ١٨٦٧- کۆچی دواییەکەی لە بەغدا ١٩٤٢) لە زانایانی ناسراوی ئایین بوو، هەروەها بەڕێوەبەری خانەی مامۆستایان بوو لە بەغدا و بەسرا لە سەردەمی عوسمانی و بەڕێوەبەری کۆلیژی ئیمامی ئەعزەم بوو ١٩٢٠- ١٩٢٦ و دانەری چەند کتێبێکی بەهاداری ئایینی و فەلسەفییە، هەرچی بەهادینە ساڵی ١٨٩٧ لە سلێمانی لەدایک بووە و دەرچووی قوتابخانەی عەسکەرییە لە ئەستەمبوڵ، وەک ئەفسەرێکی سوپای تورک لە شەڕەکانی بەرەی عێراقدا بەشدار بوو پاشان دوای - بە دیل گرتنی - بووە ئەفسەری سوپای عەرەبی لە حیجاز و سووریا، ساڵی ١٩٢٤ بۆ خوێندنی سەربازی ڕەوانەی ئینگلیتەرە کرا، لە ساڵی ١٩٢٦یش کە گەڕایەوە، گەلێ پایەی سەربازیی وەرگرت لەوانە فەرماندەی کۆلیژی ئەرکان (١٩٣٧) و یاریدەدەری سوپاسالار و بریکاری بەڕێوەبەری گشتیی گارگێڕی لە وەزارەتی بەرگریدا، ساڵی ١٩٤١ پلەی لیوای پێ درا، ئنجا وەک فەرماندەی دەڤەری باشوور لە ١٩٤٢ گوێزرایەوە بۆ بەسرا پاشان کرایە متەسەڕیفی سلێمانی، لە ئاداری ١٩٤٧ و حوزەیرانی ١٩٤٨ وەک نوێنەری سلێمانی هەڵبژێردرا، پاشان کرایە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی (٦/١/١٩٤٩- ١٠/١٢/١٩٤٩) و باڵیۆزی عێراق لە تاران (١٩٥٣)و بە هەمان پایە لە عەممان (١٩٥٦)، زۆر کتێبی لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕاوە، کتێبی بە زمانی عەرەبی دەربارەی زانستی سەربازی داناوە و شیعریشی بە زمانی تورکی نووسیوە، نیسانی ١٩٦٠ لە ڕۆما - ئیتالیا کۆچی دوایی کردووە.

٢٢- لە د. کەمال مەزهەرەوە وەرگیراوە، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا ل٧٥-٧٦.

٢٣- لە د. کەمال مەزهەرەوە وەرگیراوە، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، ل ٧٥-٧٦.

٢٤- د. کەمال مەزهەر، کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا، ل٤٠.

٢٥- جەبار جەباری، ژێدەری پێشوو، ل٢٥.

٢٦- یەکەمین ژمارە ٢٢ لاپەڕە بوو، (د. کەمال باس دەکات کە سێ ژمارەی گۆڤارەکەی ٧٢ لاپەڕەی پێکهێناوە، وا دیارە ژمارەی لاپەڕەکانی هەر ژمارەیەک تەواوکەری ئەوانی پێشترە، ئەمڕۆش ژمارەکانی گۆڤارەکە دەست ناکەون تەنیا ئەوانە نەبێت کە لە لەندەن دان).

٢٧- نالی/ مەلا خدری کوڕی ئەحمەد شاوەیس ئێلی بەگی میکایلی، ئەستێرەی درەوشاوەی ئاسمانی ئەدەبی کوردی هەر وەک عەلائەدین سەجادی پەسنی دەکات، ساڵی ١٧٩٧ لە گوندی خاکوخۆڵ لە دەشتی شارەزوور لەدایک بووە، بە پێی نەریتی سەردەمەکەی خۆی خوێندنی قورئان و زانستەکانی ئایینی تەواو کرد و ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرت، بە فەقێیەتی شارەکانی کوردستانی ئێران و قەرەداغ وهەڵەبجە و سلێمانی گەڕاوە، لە قەرەداغدا عەشقی کچێک دەبێت بە ناوی (حەبیبە)، کە

کانیی شیعری تێدا تەقاندەوە و گەلێ قەسیدەی شیعری بەودا هەڵگوتووە، گەرچی پاش دوو ساڵ لە یەکدی جودا دەبنەوە، بەڵام ئەو تا مردن هەر دڵسۆزی بوو، سەردانی حیجاز و شامی کردووەو لە ساڵی ١٨٣٥دا چووەتە ئەستەمبوڵ، لە دیوانی ئەحمەد پاشای باباندا گیرسایەوە و دواتر بە سوڵتان عەبدولمەجید گەیشت و پێکەوە حەجی مەککە و مەدینەیان کرد. ئەوە ئاشکرا نەبووە کە لە ئەستەمبوڵدا ژنی هێنا بێت تا مردنی لە ١٨٥٥دا، شیعری بە زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی داناوە، نالی - یش نازناوێکی شیعرییە و گەلێ واتای هەیە، بۆی هەیە لە هەموویان ڕاستتر و جێی مەبەست ئەوەیە کە لە (ناڵین)ەوە دێت.

٢٨- بچووکترین یەکەی زانستی بوو کە لەو دەمەدا بەکار دەهات.

٢٩- لە ئومێد ئاشناوە وەرگیراوە، ژێدەری پێشوو.

٣٠- (روژ کرد) یا (ڕۆژی کورد) گۆڤارێک بوو کۆمەڵەی (هیڤی) لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩١٣ لە ئەستەمبوڵ دەریکرد، پاش سێ ژمارە ناوەکەی گۆڕا بە (هەتاو کرد) یا (هەتاوی کورد)، دواتر پاش دەرچوونی دوو ژمارە ڕاوەستا، عەبدولکەریم ئەفەندی سەرنووسەری بوو، کە ڕۆشنبیرێکی شاری سلێمانی بوو (بڕوانە: جەمال خەزنەدار، لە سەری نووسی و پێشکەشی کرد و بڵاویشی کردەوە)، ڕۆژی کورد ١٩١٣، بەغدا، ١٩٨١.

٣١- کوردی، مستەفا کوڕی مەحمود بەگ کوڕی ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان، خانەوادەی ساحێبقڕان ناسراوە و شاعیرێکی دیکەی ناسراوی تێدا پەیدا بووە کە (سالم)ە، (کوردی) ساڵی ١٨٠٩ لە شاری سلێمانی لە دایک بووە، هەر لەوێدا زانستە ئیسلامییەکانی تەواو کردووە، لاوێکی ناو (قالە) واتە (قادر)ی خۆشەویست و زۆر لە شیعرەکان و ژیانی خۆی بۆ تەرخان کرد، ماوەیەکی زۆر لە شاری سنەی کوردستانی ئێراندا ژیاوە، لە تاراندا سەری لە شا داوە و شەڕە شیعری لەگەڵ شاعیرانی ناسراوی فارسدا کردووە، هەروەها سەردانی شام و پاریسیشی کردووە، کوردی شوێنێکی شایستەی لە نێو شاعیرانی کورددا هەیە، شیعری بە فارسی و کوردی داناوە و کەمێکیش بە عەرەبی و تورکی، ساڵی ١٨٤٩ گەڕایەوە سلێمانی و بە دەردی عەشق و نەخۆشیی دەروونی لە تەمەنی چل ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

٣٢- عەبدولڕەزاق بیمار، پەخشانی کوردی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی- وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن، بەغدا، ١٩٩٨، ل١١٤-١١٥.

٣٣- هەندێ هەڵە لە ژمارە و بەرواری هەندێ لە ژمارەکاندا هەیە، لەوانە دوو ژمارە بە زنجیرەی (٢٠)و بە بەرواری ئاداری ١٩١٨ هەیەو تا ڕادەیەکی زۆر بە هەمان ناوەڕۆک، پاشان ژمارە (٢١) لە ئاداری ١٩١٨، کە لەسەر دوو ژمارەی دواتر دووبارە بووەتەوە، بەڵام بە ناوەڕۆکی تەواو جیاواز، هەرچی ژمارە (٦٧)ە کە دوایین ژمارەیە بە هەڵە ژمارە (٦٥)ی پێوەیە، لە کاتێکدا ساڵی ١٩١٧ بە هەڵە لە ژمارەیەکدا نووسراوە.. وێڕای ئەوە بە دەگمەن هەڵەی چاپ لە بابەتەکانی ڕۆژنامەکەدا بەدی دەکرێت.

٣٤- مەیجەر سۆن/ ئیلی بانستەر سۆن (Ely Banister Son)-١٦ی ئابی ١٨١٨ تا ٢٤ی شوباتی ١٩٢٣- یەکێکە لە ئەفسەرانی ناسراوی ئینگلیز، وەک ڕۆژهەڵاتناس و پسپۆڕێکی کاروباری کورد پایەیەکی بەرزی هەیە، بەر لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا سەری لە کوردستان داوە و، بە ناوی میرزا حوسێن غولامی شیرازی و وەک بازرگانێک خۆی ناساندووە، لە ساڵانی شەڕدا گەلێ ئەرکی گەورە و گرنگی پێ سپێردرا، لەبەر ڕۆڵی گرنگی لە مێژووی کورد لە ساڵانی داگیرکاریی ئینگلیزدا زۆر کەس بە (لۆرەنسی کورد) ناوزەدیان کردووە، پاش جەنگ بۆ ماوەیەک بووە حاکمی سیاسیی سلێمانی، چاکسازییەکی زۆر و ڕاستەقینەی ئەنجام دا، وای لە هەندێ لە ئینگلیزەکان کرد بە هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە دەڤەری سلێمانیدا بە سەرۆکایەتی خۆی، تاوانباری

بکەن، لە درێژەی کاری پڕ ئەرکی خۆیدا تووشی هەوکردنی سی هات و پێشی مرد، گەشتەکەی بە کوردستاندا دوو جار لە چاپ دراوە:

1912 and 1926, E. B. Sone, To Mesopotamia and Kurdistan in Disguise, London.

ئەم کتێبە بە ناوی (رحلة الى بلاد ما بين النهرين و كردستان) کراوەتە عەرەبی.

شوکری فەزلی/ شاعیر و نووسەر و ڕۆژنامەنووس و مێژوونووس و سیاسییەکی ناسراوە، ساڵی ١٨٨٢ لە بەغدا لەدایک بووە، لە گەڕەکی (ئەلفەزڵ) نزیک بە مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، کە شوێنی گردبوونەوەی کوردەکانە لە بەغدای ئەوسا و تا ساڵانێکی نزیکی ئێستاش، کوڕی مەحمود کوڕی ئەحمەد ئاغای خەڵکی سلێمانییە، هەرچی دایکیەتی ناوی ئایشەیە و بە ڕەچەڵەک لە عێلی (ئەلکرویە)ی عەرەبە، چواردە ساڵی ژیانی منداڵیی لە سلێمانیدا بەسەر بردووە، سەرەتای سەدەی بیستەم وەک ئەدیب و شاعیر و ڕۆژنامەنووسێکی بێ وێنە سەری هەڵدا، لەگەڵ شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا کەوتە شەڕە شیعرەوە، کە هەر یەکەیان چەندین قەسیدەی بە زمانی کوردی لە داشۆرینی ئەو دیکەیان داناوە، لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا لە ڕۆژنامەکانی (العرب) بە زمانی عەرەبی و (تێگەیشتنی ڕاستی) بە زمانی کوردی و (ایران) و (ظفر عراق) بە زمانی فارسی کاری کردوە، ڕۆژی سێ شەممە ١٩٢٦/٦/١ لە تەمەنی (٤٤) ساڵیدا لە بەغدا کۆچی دوایی کردوە.

٣٥- کۆی ژمارەی ئەو وێنانەی لە ژمارەکانی ڕۆژنامەکەدا بڵاوکراونەتەوە (١٢) وێنەیە، زۆربەیان وێنەی مەیدانی جەنگن و لە ژێرەوە نووسینی گونجاویان لەگەڵ دایە، یەکەمین وێنەش لە ژمارە دووی ڕۆژنامەکەدا بڵاوکراوەتەوە، کە وێنەی کەشتییەکی جەنگیی ئینگلیزییەو لە کەنارەکانی فەرەنسا وەستاوە.

٣٦- بە نموونەی دوو دیمانە لەگەڵ حەمدی بابان لە هەردوو ژمارەی (٢٠) لە ١٩١٨/٣/١١ و، (٢٨) لە ١٩١٨/٥/١٣ کراوە، تێیاندا کوردی هانداوە بۆ هاریکاری کردن لەگەڵ ئینگلیز.

٣٧- بۆ نموونە ژمارە (٥٨) لە کانوونی یەکەمی ١٩١٨ دەربارەی فرۆشتنی کەلوپەلی زیاد، هەروەها هەمان ژمارە دەربارەی سەفەرکردن بە فڕۆکە لە نێوان بەغدا و قاهیرەدا.

٣٨- ڕۆژنامەی (العرب): (١٩١٧-١٩٢٠)، یەکەمین ژمارەی لە چواری تەمموزی ساڵی ١٩١٧ بە دوو لاپەڕە دەرچووە، ڕۆژ نا ڕۆژێک دەردەچوو، پاش مانگێک ڕۆژانە بە چوار لاپەڕە دەردەچوو، لە ناونیشانەکەیدا نووسرا بوو (ڕۆژنامەیەکی سیاسی هەواڵدەری مێژوویی ئەدەبی ئاوەدانکاریی عەرەبی مەبدەء و مەبەستە لە بەغداوە عەرەب بۆ عەرەبی دەنووسێت)، یەکەمین ڕۆژنامەی حکومی بوو- لە لایەن دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیزەوە- بە زمانێکی پاراوی عەرەبی دەردەچوو، نووسەرانی بریتی بوون لە باشترین پیاوانی زانست و ئەدەبی ئەوسای عێراق، (فیلیپی) و دواتر (مسز بێڵ) سیاسەتەکەیان بەڕێوە دەبرد، ئەدیب و زمانزانی ناسراو ئەنستانس ماری ئەلکەرمەلی سەرپەرشتیی دەکرد.

٣٩- زانیاریی نێو کەوانەکان لە بەشی عەرەبیی نێوان لاپەڕەکانی ٢٦٢ و ٢٧٩ وەرگیراون کە پاشکۆیەکی کتێبەکەن، جێی باسە ڕۆژنامەکە ئێستا بزرە، کتێبەکەی د. کەمال مەزهەریش تەنیا ژێدەرێکە دەربارەی.

٤٠- محەمەد ئەمین زەکی لە کتێبی (خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان) دا بەرگی یەکەم (بەشی دووەم)، بەغدا، ١٩٣١، ل٢٩١ دەربارەی دەڵێ: (هێندەی کوردێک کوردیی دەزانی، پتر لە زانایەکی کورد شارەزای زمانی کوردی بوو)، د. کەمال مەزهەریش لە کتێبی (تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا)، ل ١٠٤ دەربارەی دەڵێ: «شارەزابوونی سۆن لە زمانی کوردیدا گەیشتە ئەو ئاستەی کە بە کارامەیی قورئانی پیرۆزی لە زمانی عەرەبییەوە وەردەگێڕایە سەر زمانی

کوردی).
٤١- د. کەمال مەزهەر، (تێگەیشتنی ڕاستی)، ل٢٠٣-٢٠٤.
٤٢- جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەشی دووەم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی- وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن، ١٩٩٨، ل٧٧-٧٨-٧٩-٨٠-٨١.
٤٣- دامەزراندنی ئەم مەڵبەندە ناڕەزایی و تووڕەبوونی خەڵکی بەسەر مەیجەر سۆندا داباراند.
٤٤- مەبەستمان لە کوردناسی، کەسی پسپۆر لە کاروباری کوردە، وا دیارە خراپترین سیفەتەکانی مەیجەر سۆن غروور و خۆ بە زل زانینەکەیەتی کە بۆی بووە بەڵای سەر.
٤٥- د. کەمال مەزهەر، چمکێک لە مێژووی یەکەم چاپخانەی کوردی لە شاری سلێمانی، چەند لاپەڕەیەک لە ژیانی گەلی کورد، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٥، ل١٥٤.
٤٦- عەبدولڕەزاق بیمار، ژێدەری پێشوو، ل١١٩.
٤٧- کلۆدیوس جیمس ریچ/ لە ٢٨ی ئاداری ١٧٨٧ لە نزیک دیجۆنی سەر بە بورگوندی لە فەرەنسا لەدایک بووە، پاشان هەر بە منداڵی چووەتە پریستۆل لە ئینگلتەرا، لە سەرەتای تەمەنی لاوێتیدا فێرە زمانی لاتینی و یۆنانی بووە، پاشان فێرە زمانی عەرەبی و فارسی و عیبری و کلدانی و تورکی بووە،ساڵی ١٨٠٣ بووە بە قوتابییەکی جەنگی لە کۆمپانیای هیندیی ڕۆژهەڵاتدا، سەفەری کرد بۆ هیندستان و چەند پلە و پایەکی لەو کۆمپانیایەدا وەرگرتووە تا ڕۆژی دامەزراندن و دەست بەکاربوونی لە بەغدا، ساڵی ١٨٢٠ لەگەڵ هاوسەرەکەی و هەندێ لە دەست و پێوەندی، گەشتەکەی دەست پێکرد لە بەغداوە بۆ سلێمانی لە سەردەمی میرنشینی باباندا، یاداشتێکی گرنگی بە ناوی چیرۆکی مانەوە لە کوردستان و لە شوێنی نەینەوای دێریندا لەگەڵ گەشتێکی ڕێڕەوی ڕووباری دیجلە تا بەغدا و، ڕاپۆرتێکیش دەربارەی سەردانی شیراز و شتی دیکەشی نووسیوە، بەهادین نوری یاداشتەکانی ریچی بە ناوی (گەشتەکەی ریچ بە عێراقدا- ساڵی ١٨٢٠) وەرگێڕاو لە چاپخانەی (السکک الحدیدیه) لە بەغدا ساڵی ١٩٥٦ چاپ کرا.
٤٨- د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە...، ل١٥٥.
٤٩- عەلی ناجی کاکە حەمەئەمینی عەتار و (سیروان بەکر سامی)، پێشکەوتن، ١٩٢٠- ١٩٢٢، هەولێر، ١٩٩٨.
٥٠- مستەفا پاشا یامولکی/ مستەفا شەوقی کوڕی عەزیز یامولکی کوڕی مەلا مستەفا کوڕی مەلا عەزیز کوڕی مەلا حەیدەر، ساڵی ١٨٦٦ لە سلێمانی لەدایک بووە، لە بەغدا خوێندنی ئامادەیی تەواو کردووە، ساڵی ١٨٨٨ لە قوتابخانەی عەسکەری و قوتابخانەی ئەرکان بە پلەی سەرۆک روکن دەرچووە، گەلێ پلەی جۆراوجۆری سەربازیی لە شوێنی جیاجیای دەوڵەتی عوسمانیدا بینیوە، لە شەڕی بەلقاندا وەک فەرماندەی هێزی بیست و حەوت بەشداریی کردووە، ساڵی ١٩١٤ ئەنوەر پاشای وەزیری جەنگ خانەنشینی کردووە، ساڵی ١٩١٨ وەک ئەندامێکی دادگای عورفیی عەسکەری دامەزراوە، پاشان بووە بە والیی بۆرسە، ساڵی ١٩٢٠ سەرۆکی ئەنجوومەنی سەربازی بووە، کە موحاکەمەی مستەفا کەمال پاشا (دواتر ناسراو بە ئەتاتورک) و هاوەڵانی کرد و بڕیاری لە سێدارەدانی دەرهەق دەرکردن. ساڵی ١٩٢١ پاش سەرکەوتنی مستەفا کەمال، مستەفا پاشا یامولکی گەڕایەوە سلێمانی و (کۆمەڵەی کوردستان)ی دامەزراند و ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان)ی دەرکرد، پاشان بووە وەزیری مەعاریف لەو حکومەتەی کە شێخ مەحمود ساڵی ١٩٢٢ پێکییەوەنا، لە ٢٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٦ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە، شانازیی بە نەتەوەی کوردەوە دەکرد و لەو باوەڕەشدا بوو، کە بێ زانست و سیاسەت کورد هیچ ژیانێکیان نابێت، بە یەکێک لە پێشەنگەکانی شیعری سیاسی دادەنرێت لە ئەدەبی نوێی کوردیدا.
٥١- عەلی کەمال باپیر/ ساڵی ١٨٨٧ لە هەڵەبجە لەدایک بووە و، ساڵی ١٩٧٥ لە سلێمانی کۆچی

دوایی کردووە، بە دوایین شاعیرانی کلاسیکی کورد دادەنرێت، لە ماوەی سەرەتاکاندا لە زۆربەی ڕۆژنامە کوردییەکانی سلێمانیدا کاری کردووە، لە ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحمودیشدا بەشدار بووە، زۆر چاک فارسیشی دەزانی سەرباری کوردی، لە بەرهەمەکانی:
- گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم، سلێمانی، چاپخانەی ژین، ١٩٣٩.
- باغی میر (کۆمەڵە شیعر)، سلێمانی، چاپخانەی کامەران، ١٩٦٨.
- شاعیرە ناو ونبووەکان، سلێمانی، چاپخانەی ڕاپەڕین، ١٩٣٧.
- دیوانی کەمالی.

هەروەها ژمارەیەک چیرۆک و ئەفسانەی فارسیی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی.

٥٢- م. نوری/ شێخ نوری کوڕی شێخ ساڵح کوڕی شێخ غەنی کوڕی شێخ عەبدولقادر کوڕی سەید حوسێن کوڕی محەمەد کوڕی سەید عەلیی بەرزنجی، لەدایکبووی سلێمانی ساڵی ١٣١٥ی کۆچی و لە ١٩٥٨/١٢/٢٠ کۆچی دوایی کردووە، لەبەر مەلا خوێندوویەتی و بەهرە ئەدەبییەکەی هەر لە منداڵییەوە سەری هەڵداوە، بە ڕاستی بە شاعیری نیشتمان پەروەری دادەندرێت، هەرچەندە هاوڕێی عەبدوڵلا گۆران بووە، بەڵام لە دەرکەوتن و بڵاوکردنەوەدا پێش گۆران کەوتووە، بۆیە بە پێشەنگی شیعری نوێی کوردی دادەندرێت و لە زۆربەی بابەتەکاندا نووسیویەتی بە تایبەتی بابەتی ڕۆمانسی و کۆمەڵایەتی و سەرباری و سیاسی (بڕوانە: موسڵح مستەفا جەلالی، شێخ نوری دەنگی ڕەسەنی شیعر، بەغدا، ١٩٨٤).

٥٣- ڕەفیق حیلمی/ لە دایکبووی کەرکووک ١٨٩٨، باوکی لە سوپای تورکدا ئەفسەر بووە، ڕەفیق حیلمی ئامادەیی لە سلێمانی و بەغدا خوێندوە و ئنجا چووەتە کۆلێژی سەربازی لە ئەستەمبوڵدا، لەگەڵ بەرپابوونی جەنگدا گەڕاوەتەوە سلێمانی، دوای تەواوبوونی جەنگ چووەتە قوتابخانەی ئەندازە و ساڵی ١٩٢٠ تەواوی کردووە، چووەتە پاڵ شێخ مەحمود و یەکێک بووە لە نزیکەکانی، لە فێرکردن و وانە وتنەوەدا کاری کردوە و بووە بە بەڕێوەبەری مەعاریفی سلێمانی و هەولێر و بەسرا و دیالا، پاشان کراوەتە نوێنەری ڕۆشنبیری لە یەکێ لە باڵیۆزخانەکانی عێراقدا پاش تەمموزی ١٩٥٨، لە ٤ی ئابی ١٩٦٠ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە سلێمانیدا نێژراوە، زۆر چاک زمانی کوردی و عەرەبی وتورکی و فارسی و فەرەنسیی دەزانی، زۆر کتێبی بە زمانی عەرەبی و کوردی و تورکی داناوە یا وەرگێڕاوە، میر بەسری وا وەسفی دەکات: (ڕەفیق حیلمی ڕابەرێکی ڕێنیسانسی ڕۆشنبیریی کوردی بوو، باوەڕی بە مافی گەلەکەی هەبوو لە دەستەبەر کردنی ژیانێکی دیموکرات و سەربەرزانە، لەو پێناوەشدا خەباتی کردوە).

٥٤- ئیمزاکانی شێخ مەحمود بەسەر ئەو بەیاننامانەی کە لە ڕۆژنامەکەدا بڵاودەبوونەوە کتوپڕ و بێ هیچ پێشەکییەک لە ژمارە ١٣دا لە سێی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ لە حوکمداری کوردستانەوە گۆڕان بە مەلیکی کوردستان، لە لاپەڕە سێی ژمارەی ئاماژە پێکراودا، وێڕای ئەوەی نازناوی حوکمداری کوردستان لە زۆر بابەتی هەمان ژمارەدا هەیە.

٥٥- سمکۆ/ سمایل ئاغای سەرۆکی هۆزی شکاک، دیارترین سەرکردەی خەباتی رزگاریخوازی کوردی ئێرانە لە ماوەی دوای یەکەمین جەنگی جیهانیدا، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٢١دا بزووتنەوە بەهێزەکەی دەستی پێکرد، بەوەی توانیی دەسەڵاتی بەسەر شارەکانی ورمێ و مەهاباد و سەڵماس و خوی و سیلدز و سەقز و بانە و شوێنانی دیش بسەپێنێ، ڕاپەڕینەکەی تا ناوەڕاستی ١٩٣٠ لە پاشەکشە و بەرەو پێش چووندا بەردەوام بوو، لەو بەروارەدا دەسەڵاتی شا توانیی بە پیلانێک لە شاری شنۆ بە خۆی و دە جەنگاوەریەوە بیکوژێت، دوای ئەوەی بەگیریان هێناو دانوستاندنیان لەگەڵدا کرد، پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ عەبدولڕەزاق بەدرخاندا هەبوو، لە ورمێدا ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردو شەوی عەجەم)ی دەرکرد، بەر لەوەی ناوەکە بکاتە (ڕۆژی کورد) پاشان (کورد). (بە

درێژی دەکرێ بڕوانیتە/ د. کمال مظهر، دراسات فی تاریخ ایران الحدیث و المعاصر، منشورات مکتبه الیقظه العربیه، بغداد، ١٩٨٥، ص٢٤٩- ٢٥٣).

٥٦- عەبدولڕەزاق بیمار، ژێدەری پێشوو، ل١٤٥.

٥٧- هەمان ژێدەر، ل١٤٨.

٥٩- ڕۆژنامەی (نجمه)/ ژمارە یەکی لە ١٩١٨/١٢/١٥ بە زمانی عەرەبی لە کەرکووک دەرچووە، پاشان هەر بە زمانی تورکی دەردەچووە، ماوەی دە سالێش لە دەرچوون بەردەوام بوو، یەکێ بوو لەو ڕۆژنامانەی دەسەڵاتی داگیرکەری بەریتانی دایانمەزراند بوو، ساڵی ١٩٢٦ ناوەکەی گۆڕا بە (کرکوک) و پاشتر گۆڕا بە (نجمه کرکوک).

(لە زنجیرەی پەراوێزەکانی دەقە عەرەبییەکەدا ژمارە (٥٨) پەڕێوە - وەرگێڕ).

٦٠- مەبەستمان لە خواستەکانی کورد، خواستەکانی شێخ مەحمود و ئەو حکومەتەی دیمەزراند.

٦١- جەمال خەزنەدار (کۆکردنەوە و پێشەکی نووسین) ڕۆژی کوردستان ١٩٢٢-١٩٢٣، بەغدا، ١٩٧٣.

٦٢- جەبار جەباری لەو باوەڕەدایە کە سەرنووسەرەکەی ساڵح زەکی بوو.

٦٣- لە کاتی داگیرکردنی ئەشکەوتەکەدا و کشانەوەی شێخ مەحمود، ئینگلیزەکان دەستیان بەسەر هەر سێ ژمارەکەدا گرت، کە دواتر ئەدمۆندز پێشکەش بە زانکۆی (کامبرج)ی کرد.

٦٥- د. کەمال فوئاد، (بانگی هەق) یەکەمین ڕۆژنامەی شۆڕشی کوردستان، مرۆڤایەتی (گۆڤار)، (پاشکۆی یادی سەد ساڵەی ڕۆژنامەگەریی کوردی، ل١٠)، سلێمانی، چوارشەممە ١٩٩٨/٤/٢٢.

٦٦- بۆی هەیە خوێنەر هەندێ لاوازی لە وەرگێڕانەکەدا بەدی بکات، بەڵام لاوازییەکە مەبەست بووە، لە پێناو پەیوەست بوون بە ئەمانەتی وەرگێڕان و پاراستنی دەستەواژە ڕەسەنەکان بەپێی توانا.

٦٧- ٨ی ئاداری ١٩٢٣.

٦٨- مەبەست کوردستانی ئێستای عێراقە.

٦٩- هەرچەندە چەند بارە گۆڕانی سەرنووسەر بۆی هەیە بە ڕادەیەک ڕاڤەی ئەو نارێکییە لە دەرچووندا بکات، بەڵام ئەوەش بە دوور نازانین کە چاپخانەکە لە کار کەوتبێت، چونکە د. کەمال مەزهەر لە لێکۆڵینەوەیەکیدا دەربارەی مێژووی یەکەمین چاپخانە لە سلێمانیدا - کە هەر ئەو چاپخانەیەیە و ئینگلیزەکان کاتی کشانەوەیان ساڵی ١٩٢٣، بەر لە گەڕانەوەی شێخ مەحمود و دەرکردنی (ئومێدی ئیستیقلال) - دەڵێ: پارچەیەکی چاپخانەکەیان لەگەڵ خۆیاندا برد بە مەبەستی لە کار خستنی، بەڵام یەکێ لە وەستاکان توانیی پارچەیەکی لە جیاتی دروست بکاتەوە، ئەمەش وای لە شێخ مەحمود کرد، کە پاداشتێکی گەورەی بداتێ.

٧٠- ئومێد دەکەین لە وەرگێڕانەکەدا سەرکەوتوو بووبین بە هۆی ئەوەی کوردییەکەی ناتەواوە، چونکە وشە و دەستەواژەی کۆنی عەرەبیی تێدایە، ڕستەکانیش بەپێی ڕێسای پەخشانی تورکی نووسراون.

٧١- ئومێدی ئیستیقلال، ژمارە دوو، ٢٧ی ئەیلوول ١٩٢٣، ل١.

٧٢- ئومێدی ئیستیقلال، ژمارە شەش، ٢٥ی تشرینی یەکەم ١٩٢٣، ل٣.

٧٣- ئومێدی ئیستیقلال، ژمارە هەشت، ٨ی تشرینی یەکەم ١٩٢٣، ل١.

(لێرەدا دەبێ ٨ی تشرینی دووەم بێت- وەرگێڕ).

٧٤- ئومێدی ئیستیقلال، ژمارە چواردە، ١٩٢٤/١/١٠.

٧٥- حوسێن نازم/ لەدایکبووی سلێمانی ١٨٧١، وەک بەڕێوەبەری ناحیە و، قایمقام کاری کردووە، لە کاتی بزووتنەوەکەی شێخ مەحمووددا ڕاوێژکاری بووە، پاشان ساڵی ١٩٢٤ بووە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال) ئۆرگانی حکومەتی شێخ مەحمود، پاشان سەرپەرشتی ڕۆژنامەی (ژیان)ی دەکرد، کە شارەوانیی سلێمانی دەری دەکرد تا ساڵی ١٩٣٢ کۆچی دوایی کردوە، زۆر بە

چاکی فـارسی و تورکـیی دەزانی سەربـاری کـوردی، مـیـر بەسـری وەها پەسنی کـردووە کـە (دیارترین کەسانی رۆشنبیری کورد بوو لە سەردەمەکەیدا).

٧٦- بەر لەوە، لە تورکیادا ئێران بە عەجەم ناسرا بوو.

٧٧- ئومێدی ئیستیقلال، ژمارە ١٥، ١٩٢٤/١/٢٤، ل١.

٧٨- ئومێدی ئیستیقلال، ژمارە ٢٢، ١٩٢٤/٤/١٠.

٧٩- ئومێدی ئیستیقلال، ژمارە ٢٥، ١٥ی مایسی ١٩٢٤.

# ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا
# ١٩٢٤- ١٩٣٩

## بەرکوڵ

لەو ساڵانەی لێکۆڵینەوەکەمان دەیانگرێتەوە، گەلێ هۆکار ئامادە دەبن بۆ کارکردن لە ڕۆژنامەگەریی کوردی، ئەو ساڵانەش دەکەونە سەرەتای سەردەمی پاشایەتی لە عێراقدا، لە لایەک دەبینین هەندێ لەو سیاسەتمەدارانەی جڵەوی دەسەڵاتیان گرتە دەست پەیڕەوی سیاسەتێکی کورتبینی قەومیی عەرەبییان کرد، کە تەنگی بە کورد هەڵچنی [١]، بە تایبەتی کە لە ئاکامی کێشەی ویلایەتی مووسڵ دڵنیا بوون، کە بە ڕەسمی دەخرێتە سەر عێراق، وێڕای ئەو سیاسەتە دووربینەی مەلیک فەیسەڵی یەکەم لە ئاستی کورددا پەیڕەوی کرد [٢]، کە بە هۆی ڕێ پیشاندانی ئینگلیزەکانەوە بەوەی دەیانویست عێراق ئارام بێت و، لە ئاکامی مەرجەکانی کۆمەڵەی گەلان لە یەکلاکردنەوەی کێشەی ویلایەتی مووسڵ، هەوڵی دا کار لە پێناو ڕاگرتنی لەنگەری هەڵسوکەوتەکان بکات هەمبەر بە کورد، کە بە مەرجی دابین کردنی مافەکانیان دەنگیان لە بەرژەوەندیی ئەو دا [٣]،هەروەها بە ڕەچاوکردنی پێویستییەکانی دەوڵەتێکی تازە دروستبوو.

بەڵام سیاسەتی ئەو حکومەتانەی دیدێکی کورتبینانەی قەومییان هەبوو لە بەغدا و، سستی بازاڕی ڕۆژنامەگەری لە سەرانسەری عێراقدا بە هۆی زەحمەتیی سەرف بوونی، گشتیان کۆبوونەوە بۆ ئەوەی دیمەنێکی ناشی بۆ ڕۆژنامەگەریی کوردی لە ساڵانی ١٩٢٤- ١٩٣٩ پێکەوە بنێن، بۆیە ڕۆژنامەکان بە گشتی ڕوو

لە خوێنەرانی دەکەن بۆ ئەوەی ئابوونەکانیان بدەن، یاخود هانیان دەدەن بۆ ئەوەی ئابوونەیان هەبێت.

هەروەها دەبینین ڕۆژنامەگەریی کوردی لەم ماوەیەدا تووشی پاشەکشە کردن هاتووە، گەر لەگەڵ ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)دا بەراوردی بکەین، بۆ نموونە لە لایەک بەرەوپێش چوونی بە خۆوە نەبینی، لە لایەکی دیش لە بەجێ گەیاندنی ئەرکە ڕۆژنامەوانییەکەی پاشەکشەی کرد و ڕێی بەوە دا بە فراوانی ڕوو بکرێتە ئەدەب و شیعر و کاروباری کۆمەڵایەتی.

بەڵام دیاردەی سەرنج ڕاکێش ئەوەیە، بە بەراورد لەگەڵ کات و بوار و ڕەوش و دەرفەتی بەردەست، ژمارەیەکی زۆر لە گۆڤار دەرچوون، وێڕای ئەوەی لەبەر چەندین هۆ باریان گران کرا بوو، بەوەی دەبوو ڕووبەرێکی زۆر لە لاپەڕە کەم و بەرتەسکەکانیان بۆ دووپات کردنەوەی لایەنگیرییان لە تەختی پاشایی و شتی لەم بابەتە تەرخان بکەن، ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی لە ماوەی دیاری کراوی لێکۆڵینەوەکەماندا دەرچوون، بە گشتی و بەپێی ئەو دەرفەتەی بۆیان هاتووەتە پێش، هەوڵیان داوە گوزارشت لە خواستە نەتەوەییە ڕەواکانی کورد بکەن لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا، بەمەش کۆسپ و ئاستەنگیان بۆ دروست دەبوو، کە لە ئاکامدا دادەخران.

بەهەر حاڵ سووربوونی ڕۆشنبیرانی کورد لە دەست گرتن بەم هۆکارە هاوچەرخە، واتە ڕۆژنامەگەری، بۆ گوزارە کردن، وێڕای هەر هەموو شتێک ژیان و هێز و کاریگەرێتی پێ بەخشی، لێکۆڵیار لەو باوەڕەدایە سیمای ڕۆژنامەگەری یەکەمین جار لە (ژیانەوە)دا بەرجەستە بوو، کە نموونەی ویستراوی ڕێ پێدراوی ئەم ڕۆژنامەگەرییە بوو، بە واتایەکی دی ناسنامەی چوارچێوە دراوی خۆی پێ بەخشی.

## أ- ڕۆژنامەکان

### (ژیانەوە) سەرەتای قۆناغێکی نوێ

(ژیانەوە) چ وەک دەرچوونی و چ وەک ڕۆژنامەیەک، خاوەنی گەلێ سیما بوو، لە زۆر لاشەوە بە هەق دەیکاتە ئەوەی، سەرەتای سەردەمێکی نوێ بێت لە نێو

قۆناغی سەرەتای ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا.. یەکەم و بەر لە هەموو شتێک سەر لەنوێ (ژیانەوە) ئەسپەکەی هێنایەوە بەردەم عەرەبانەکەو، لە ئاراستە کردنی گوتارە ڕۆژنامەوانییەکەیدا بە تەنیا زمانی کوردیی بەکار هێنا، پاشان درکی بەوە کرد کە دەبێ ڕۆژنامە تەمەن درێژ بێت، واتە درێژە بە پردی پەیوەندییەکانی بدات و بێ پسانەوە لەگەڵ خوێنەردا، بۆی هەیە هەر لەبەر ئەو هۆیە بوو بێت کە لە لاپەڕە یەکی ژمارە یەکیدا ڕاگەیاندراوێکی بڵاوکردەوە، بە گۆڕینی ناوی ڕۆژنامەکە- کە بەر لە ئەو ڕۆژنامەی دی نەبووە بێ لە دوایین ڕۆژنامەکانی شێخ مەحمود- بۆ (ژیانەوە) واتە گەڕانەوەی ژیان.

بۆی هەیە هەر ئەو درک پێ کردنە بێت- پێ دەچێ ڕۆشنبیرانی سلێمانی هەستیان پێ کرد بێت - کە وای کرد ناوی ڕۆژنامە تازەکەی پاش وەستانی (ژیانەوە) دەرچوو، ناو بنێن (ژیان) کە ئەویش لە لای خۆیەوە لە یەکەمین ژمارەیدا ئاماژەی بەوە دا، کە ناوێکی نوێ لە ڕۆژنامەکە نراوە.

هۆیەکی دیکەی وای لە (ژیانەوە) کرد دەسپێکی سەردەمێکی نوێ تۆمار بکات، ئەوەیە کە دوای هەرەس هێنانی بزووتنەوەکەی شێخ مەحمود و کۆتایی هاتنی حوکمدارییەتییەکەی بۆ هەتا هەتایە و، ڕژێمی پاشایەتیی عێراقیش لە ساڵی ١٩٢٤دا بە یارمەتیی هێزەکانی ئینگلیز، بە شێوەیەکی واقیعی دەسەڵاتی دەڤەرەکەی گرتە دەست، کە پاش ماوەیەکی کورت بە دەرچوونی بڕیاری کۆمەڵەی گەلان بە لکاندنی ویلایەتی مووسڵ بە عێراقی پاشایەتی و لە ژێر مانداتی بەریتانی، ئەو دەسەڵاتە جێگیر بوو، بەوەی ئەحمەد تۆفیق بەگ وەک متەسەڕیفی سلێمانی دامەزراو لە ڕۆژی ١٩٢٥/٣/٧دا دەست بەکار بوو، واتە (ژیانەوە) ڕۆڵی کاریگەری خۆی بینی لەو ماوە گۆڕانکاری ئامێزەدا، بۆ ئەوەی کەش بۆ حاڵەتە نوێیەکە بسازێنێ... بەم جۆرە دەکرێ بڵێین (ژیانەوە) یەکەمین ڕۆژنامەی نیمچە ڕەسمیی عێراقییە بە زمانی کوردی، دوای نەمانی دەسەڵاتی عوسمانییەکان و ڕاگەیاندنی مەملەکەتی عێراق و مەلیکەکەی فەیسەڵی یەکەم.

پاشان ڕووداوی هەرە دیارتر هاتە ئاراوە، ئەویش ئەو حاڵەتە نوێیەی کە دەستی

پێکرد، بوارێکی فـــراوانی کـــردەوە لە بەردەم ئەوەی دەکـــرێ ناوی لێ بنێین ڕۆژنامـەگەریی ئەدەبیی کـوردی و بایەخدانـی ئەو ڕۆژنامـەگـەرییـە بە چەسـپـاندنی ناسنامەی کـورد و خـۆ تەرخـان کردنـی لە خـەباتی چەکـدارییـەوە بۆ خـەباتێک، کـە لەسەر بنەمای سەلماندنی خود و سەلماندنی بوون، ڕۆنراوە، هەروەها کارکردن لەپێناو دەست گرتن بە مافە نەتەوەییەکان و، ئەو مافانەی وەک بەڵێن بە کورد درابوون و جێبەجێ کردنی ئەو بەڵێنانەش لە چوارچێوەی قەوارەی دەوڵەتی عێراقدا.

ئەم کـارەش پتر ڕەنگی دایەوە لە دیاردەی بەشداری کـردنی شارە کـوردییەکـانی دیکەش شان بە شانی سلێمانی لە بزاڤی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەگەری و سپاردنی ئەو هەوڵانەش بە چەندین گـۆڤـار کە بەسـەر نەخشـەی عـێـراقدا لە بەغـدا و هەولێـر و کەرکووک و ڕواندز، دابەش بوو بوون.

دیمەنی ڕۆژنامـەگەریی کـوردی لە مـاوەی نێـوان سـاڵانی ١٩٢٤ و ١٩٣٩ دەکرێ لەوێوە بۆی بڕوانین، کە ڕۆژنامـەیەکی هەفـتـانەی سەرەکی لە سلێـمـانی دەردەچوو، بەوەی (ژیان) لەمـپەری دە ساڵ ژیانی بۆ یەکـەمین جار لە مێژووی ڕۆژنـامـەگـەریی کـوردی بڕی، لەپاڵ گـەلێ گـۆڤـار کە لە شارە جۆراوجۆرەکـانی کـورد دەردەچوون لە نێویشـیاندا سلێمانی بۆ یەکەمین جار لە مێژوویدا ڕۆژنامە تاقانەکەی (زانستی)ی لە ساڵی ١٩٣٨ تێدا دەرچووە.

سیـمـا تازەکانی سەردەمی (ژیانـەوە) ئەو ڕاسـتـییە دووپات دەکـاتەوە کە دوای بۆردوومـان کـردنی سلێـمـانی لە لایەن فـڕۆکـەکـانی ئینگلیـزەوە پەیدا بوو، بەوەی توندیی ئەو هێرشەی هێزەکانی بەریتـانیا کردیانە سەر شارەکە بە ئامانجی دەرکردنی شێخ مەحمـود، وای لە خەڵکی سلێمـانی کرد، بۆ یەکەمین جار لە ژیانیـاندا، هەر هەموویان شارەکە جێ بهێڵن!

لە کۆی (٢٠) هەزار کەسی دانیشـتووانی ئـەوسای سلێمـانی، هێزی داگیـرکەر پتر لە (٧٠٠) کەسیان لە شاردا نەبینییەوە... دوو مانگی تەواویش تێپەڕی ئنجا نیـوەیان هاتنەوە!.. چەند مـانگێکی دیکەی برد ئنجـا ئەوانی دی هاتنەوە!!.. ئەم کـارەسـاتە ئینسـانییـە، بۆ مـاوەیەکی دوور لەسـەر لاپەڕەکـانی (ژیانـەوە)دا ڕەنگی

دایەوە، پاش ئەو لە (ژیان) و تەنانەت ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی دیکەش وەک ئەو سێ ژمارەیەی (بانگی کوردستان) کە ساڵی ١٩٢٦ لە بەغدا دەرچوون، ڕەنگی دایەوە.

(ژیانەوە) یەکەمین ژمارەی لە ڕۆژی دووشەممە هەژدەی ئابی ١٩٢٤ دەرچووە، لە ژێر ناوی ڕۆژنامەکەدا ئەم دەستەواژەیە نووسرا بوو (ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی حکومەتییە هەفتەی جارێک دەردەچێ)، ئەو دەستەواژەیە لە هەردوو ژمارەی شازدە و حەڤدەی ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٢٥/٢/١٩ و ڕۆژی دووشەممە ١٩٢٥/٢/٢٣دا گۆڕا بە (ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی حکومەتییەو هەفتەی دوو جار دەردەچێ)، پاشان لە ژمارە (١٨)ی ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٢٥/٢/٢٦دا، بووە بە (ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی سیاسی، ئەدەبی ئیجتماعییە، هەفتەی دووجار دەردەچێ)، پاشان گۆڕا بە (ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی سیاسی، ئەدەبی ئیجتیماعییە هەفتە یەک جار دەردەچێ) لە ژمارە (٢٠)ی ڕۆژی دووشەممە ڕێکەوتی ١٩٢٥/٣/٩دا، هەر واش مایەوە تا ژمارە (٥٦) کە دوایین ژمارەیە، لە ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٢٦/١/١٤.

لە دامێنی دوایین لاپەڕەی دە ژمارەی سەرەتای ڕۆژنامەکەدا، ڕستەیەک نووسراوە کە (لە چاپخانەی حکومەت لە سلێمانی چاپ کرا)، بەڵام لە ژمارە (١١) بەدواوە گۆڕاوە بە (لە چاپخانەی بەلەدیە لە سلێمانی چاپ کرا)، هەرچەندە ناوی سەرنووسەری ڕۆژنامەکە لەسەر لاپەڕەکاندا نەنووسراوە، بەڵام گۆڕانی سەرنووسەرەکەی لە ژمارە (٣٨)ی ڕۆژی پێنج شەممە (٣٠)ی ئەیلوولی ١٩٢٥بۆنەیەک بوو بۆ ئەوەی بزانین (م.ئەدیب) [٤] سەرنووسەری تازەی ڕۆژنامەکەیە، پاش ئەوەی پۆزشێکی جەمیل سایب[٥]، سەرنووسەری پێشوو، لە ژمارە (٣٧)ی ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٢٥/٨/٢٧ دا دەخوێنینەوە.

ئەم نووسەر و شاعیرانە نووسینیان لە ڕۆژنامەکەدا بڵاوکردوەتەوە: م. نوری و، عەونی ئەفەندی و، زێوەر و، عەلی عیرفان و، عیزەت و، فایەق زێوەر و، کوردی و، کەریم سەعیدو، ئەحمەد تۆفیق و، مەحمود جەودەت و، عەبدولواحید ئەمین

ڕواندزی و، م. شەوقی و، مستەفا وافی و، ئەحمەد موختار، و عەلی کەمال و، بێکەس و، کەرکووکی و، حاجی قادری کۆیی.

(ژیانەوە) بە چوار لاپەڕە و قەبارەی ٣٢×٢٠سم دەردەچوو، وا دیارە، جار جار پاشکۆی سادەی دەردەکرد، وەک پاشکۆی ژمارە (١٥) کە لە ١٩٢٥/٢/١٦ دەرچووە، کە تەنیا یەک لاپەڕە بوو بە قەبارەی ٢١.٥×١٧سم، بەیاننامەیەکی تێدایە لە لایەن (جەمعیەی مدافعەی وەتەن لە سلێمانی- مرەخەس ئەحمەد لە بەرواری ١٩٢٥/٢/١٥) بەیاننامەیەکە خەڵک هان دەدات بۆ خۆپیشاندان و داکۆکی کردن لە عێراقیەتی ویلایەتی مووسڵ، دواتر پاشکۆی ژمارە پەنجاو سێ کە ڕۆژی پێنج شەممە ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ دەرچووە، بریتییە لە یەک پەڕ و بە قەبارەی خودی لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکەیە، تێیدا دەقی بڕیاری کۆمەڵەی گەلان دەربارەی کێشەی مووسڵ بڵاوکراوەتەوە.

سیاسەتی (ژیانەوە) بریتی بووە لە هەڵسەنگاندنێکی یەک لایەنە کە هەموو هەلومەرجە بابەتییەکانی تێدا ڕەچاو نەکرا بوو، هێرشی دەکردە سەر شێخ مەحمود و پیاوانی و ئازارکێشان بۆ ئەو هەموو وێرانکاری و کاولکارییەی لە ئاکامی ئەو بزووتنەوەیە بەسەر کورددا هات، لە بەجێ هێشتنی شاری سلێمانی لە لایەن تێکڕای دانیشتووانییەوە ئازارەکان بە ترۆپک گەیشتن، کە بە تەواوی لە دانیشتووان چۆڵ بووە، دوایی پاش جێگیربوونی ڕەوشی نوێ یەکسەر نەگەڕانەوە نێو شار، بەڵکو ماوەیەکی چاکی ویست تا خەڵکەکە گەڕانەوە، بە تایبەتی لەو کاتە ئاڵۆزەدا.

لە بەرامبەردا ڕۆژنامەکە زۆر ستایشی سیاسەتی بەریتانیای کرد سەبارەت بە یارمەتیدانی کورد بۆ ئەوەی ساز و ئامادەی ژیان بن پاش تاریکی و زوڵمی عوسمانییەکان، هەروەها ڕۆژنامەکە بایەخێکی زۆر گەورە و شایانی بە هەواڵ و ڕووداوەکانی حکومەت دەدا لە بەغدا، هەروەها بەدواداچوونی چالاکییەکانی مەلیک فەیسەڵی یەکەم و سەرۆکی کابینە وەزارییەکانی عێراق و پیاوانی سەردەمی پاشایەتی و پرۆگرامی وەزارەتەکان.

ڕۆژنامەکە بەیداخی داکۆکی کردنی هەڵکرد بۆ لکاندنی ویلایەتی مووسڵ بە عێراقەوە، چرکە بە چرکە بەدوای کێشەکەدا دەچوو، داواشی لە کورد کرد، گوێ بەوانە نەدەن کە پشتگیری لە خواستەکانی تورکیا دەکەن، (ژیانەوە) سەرگەرمانە داکۆکیی لە عێراقی بوونی ویلایەتەکە دەکرد، لە هەمان کاتدا هێرشی دەکردە سەر ڕێبازی شێخ مەحمود و لایەنگرانی بە تایبەتی کە هێشتا هەر لە نێو چیاکاندا شەڕی دەکرد، بەڵام زۆر بە توندی پشتگیریی لە شۆڕشی کوردی تورکیا دەکرد بە سەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران، بە سەرکوت کردنی ئەو شۆڕشە لە لایەن تورکەوە ڕازی نەبوو، هەمووانیشی لەو چارەنووسە ڕەشە ئاگادار کردەوە، کە چاوەڕوانی کورد دەبێت گەر هاتوو تورکیا لە دەست بەسەردا گرتنی ویلایەتی مووسڵدا سەرکەوێت.

لە کاری ڕۆژنامەوانیدا، ڕۆژنامەکە بە هەمان شێوە جۆرەکیانەی ئەو ڕۆژنامانەی لە پێش خۆیدا دەرچوو بوون ، ئەویش بەردەوام بوو، لە ڕووی بڵاوکردنەوەی وتاری جۆراوجۆر و ڕاپۆرتی ڕۆژنامەوانی، لەم بارەیەوە پشتی بە ڕۆژنامەکانی بەغدا دەبەست، بە تایبەتی (العراق) و (العالم العربی)، هەروەها ڕۆژنامەی (نجمە)ی کەرکووکی، [٦] کە هاوکاریی (ژیانەوە) لەگەڵ ئەو ڕۆژنامەیەدا گەیشتە ئەو رادەیەی، لە ژمارە (٢٠)ی ڕۆژی دووشەممە نۆزدەی ئاداری ١٩٢٥ و ژمارەی دیکەش ئاگادارییەکی بڵاوکردەوە کە هەر کەسێک ئابوونەی ڕۆژنامەی (نجمە)ی دەوێت با سەر لە بارەگای ڕۆژنامەی (ژیانەوە) بدات.

ئەو سەروتارەی یەکسەر دوای هەواڵی گۆڕینی ناوی ڕۆژنامەکە بە (ژیانەوە)، کە لە لاپەڕە یەکی ژمارەی یەکەمی، ڕێکەوتی ڕۆژی دووشەممە (١٨/٨/١٩٢٤) بە ناونیشانی (ژیانەوە) بڵاوکراوەتەوە ، ڕۆشناییەکی زۆر دەخاتە سەر ئامانج و سیاسەتی ڕۆژنامەکە... دەبا بیخوێنینەوە: **«چاو بکەنەوە بڕوانن ئەم مللەتە مەزلومە، ئەم چەنگە زەویە، ئەم تۆزە کوردە چی دی و چی بەسەر هات و تووشی چ بوو، ئەمە ئەگەر زەریف ورد بکرێتەوە هەموو لە تێنگەیشتن و نەزانینەوە بووە. هەمووی لە ڕووی ئەوەوە بوو کە ئەوی ئیشی ئەکرد هەر هەوڵ و تەقەلای نەفسی**

**خۆی بوو، هەر وای نەفسی نەفسی بوو کەس بۆ کەسی تر هەوڵێکی نەئەدا، ئاخری نەتیـجەی ئەمە گەیشتـە دەرەجەیێک کە وەکو درەختێ وەکو گیـاییێک بێ ئاو بمێنێتـەوەو هالاوی گەرم بە سەریا بچێ هەمـووی هەڵپـروزێ، هەڵقـرچێ خەریک وشک بوون بێ، وامان لێهاتووە. ئێستا کەوا خوا رەحمی کرد دەرووی خێرمان لێ کراوەتەوەو رێگای رووناکمان پێ نیشاندراوە، ئەمجا فرسەتە وەخت بە قیمەتە سا قوربانە نۆرەی هەوڵ و تەقەلایە، وەختی تێکۆشینە، بە هەمـوو لایەک هەوڵ بدەین ئەم درەختە ئەم گیایە هەڵپروزاوە بژێیێتەوە، زیندوو بێتەوە. لەمەو دوا هەر کەسە بە قەدەر زانین و توانینی خۆی ئەگەر هەوڵ نەداو تێنەکۆشێ لە دەست ئەڕوا – لە کیس ئەچێ.**

**دیسانەوە پارچە پارچە مەکەنەوە، هەر یەکە شوێن «کلاوێکی لار نەکەوێ»**[7] **ئەگەر تێگەیشتێن کە دنیا چ باسە، ئەم قسە پڕوپووچانە ئەم خەیالانە هەمووی خاوە هەمووی قوڕبەسەری و ماڵ وێرانییە، هەمووی بێ نەتیجەیە، لە ئاخری دا بەرە بەرە وای لێ یێت بە جارێ هەمـووی مەحو بێتەوە ئەم جارەش عەرزتان ئەکەم بۆ خاتری خوا هەموو چاومان هەیە، تەجرەبەمان دیوە، بەس شوێن کلاوی لار بکەوین هەموو یەک بگرین و چیمان بۆ چاکە هەوڵ بۆ ئەوە بدەین.**

**دیســانەوە عـەرزتان ئەکـەم چیـمـان بۆ چاکـە بۆ ئەوە هەوڵ بدەین. بە جـارێ تێـبکۆشێن واز لەم بەرو ئەو بەر بهـێنێن، ئەوەی خـراپە بۆمـان لە خـۆمـانی دوور بخەینەوەو خـۆمانی لێ لادەین، بە هەمـوو هێزو قـوەتی خۆمان پەلامـار شتی چاک بدەین، بەڵکو ئینشائەڵڵا بژێینەوە، سەر بکەوینەوە، زیندوو بینەوە»**[8].

زۆر لە سەروتارەکانی ڕۆژنامەکە لەسەر ئەم ڕێچکەیە ڕۆیشتن، کە بۆ بابەتی دیکەش تەرخان دەکرا، سەروتاری ژمارە دوو، لاپەڕە یەک و بەشی زۆری لاپەڕە دووی گرتوەتەوە، لە بارەی مانگ گیرانەوەیە، وتارێکی بەڵگەداری زانستییە لەو ڕۆژگارەدا وتارێکی دەگمەن بووە لەو بوارە و لە نێو ڕۆژنامەگەریی کوردیدا، دەبارەی ئەو دیاردەیە، وا دیارە لەو ڕۆژگارەدا ڕووی دابێت و خەڵکی سلێمانیش بینیویانە و، هەوڵیان داوە بە تەنەکە لێدان و مەسینە لێدان مانگ بگێڕنەوە دۆخی جارانی!

ڕۆژنامەکە ئەم کارانەی ڕەت کردوەتەوە، چونکە ئەوەی بەسەر مانگ هاتووە، دیاردەیەکی مەزەندە کراوی زانستییە، متەسەڕیفی کەرکووک، پێشتر بەر لە مانگ گیرانەکە، ئاگادارییەکی لە بارەیەوە ڕاگەیاند بوو، ئنجا ڕۆژنامەکە داوا لە زانایانی ئیسلام دەکات کۆببنەوە و ڕوانینی شەریعەت بۆ ئەم کارە، روون بکەنەوە، چونکە تەپڵ و دەف و تەنەکە لێدان عەیبە و مایەی گاڵتەجارییە.

باس کردنی ئەم جۆرە شتانە، بەم ڕوونی و قووڵییەوە لە ڕۆژنامەگەریی ئەوسای عێراقدا، کارێکی دەگمەن بوو.

شتێکی دیکەی (ژیانەوە) ئەو بایەخە جێ سەرنجەی بە هەواڵە جیهانییەکانی دەدا، لەگەڵ ئەوەی هەواڵەکانی سلێمانی و هەواڵی دەڤەرە کوردییەکانی دی، شوێنی خۆیان گرتبوو لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکەدا، بەڵام پاشەکشەیەکی گەورەشیان پێوە دیار بوو لە پێناو هەواڵەکانی سەراپای عێراق بە تایبەتی بەغدای پایتەخت و حکومەتەکانی، هەروەها هەواڵی نێودەوڵەتی لە سەرانسەری جیهانەوە، بە تایبەتی ئەوانەی گەر دوور بە دووریش بێت، پەیوەندییان بە هەواڵەکانی عێراق و بەریتانیاو تورکیاوە هەبوو، کە پەیوەست بوون بە کێشەی ویلایەتی مووسڵەوە.

بێ لەوانە، ڕۆژنامەکە زۆر کەم بایەخی بە شتەکانی دی دەدا، تەنیا مەگەر فێرکردن و بە شارستانی بوون نەبێت، بەڵام دەسکەوتی هەرە گەورەی بڵاوکردنەوەی چیرۆکی (لە خەوما) بوو، کە سەرەتا پێشەکییەکەی لە ژمارە ۲۸ی ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ۲۶/٦/۱۹۲۵دا بڵاوکردەوە، پاشان ئەڵقەی یەکەمی لە ژمارە (۲۹)ی ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی ۱/۷/۱۹۲۵دا بڵاوکردەوە، پاشان ئەڵقەکان تا ۱۸مین ئەڵقە لە دوایین ژمارەی ڕۆژنامەکەدا بەردەوام بوون.

حوسێن عارف، دیارترین چیرۆکنووسی ئەمڕۆی کوردە،لە کتێبەکەیدا دەربارەی چیرۆکی هونەریی کوردی، دەبارەی ئەم چیرۆکە و نووسەرەکەی بەو واتایە دەڵێ، ئەوانەی جەمیل سایب-یان بۆ سەرنووسەری ڕۆژنامەکە هەڵبژارد، کە سەردەمی نوێی لە ژیانی ناوچەکەدا دەست پێکرد، لە گرنگیی هەڵبژاردنەکە ئاگاداربوون:

**((ئەم دژایەتییەی جەمیل سائیب بەرامبەر شێخ مەحموود، شێوەیەکی تایبەتی**

**وەرگرت، واتە شێوەی (هزرەوەر - لێکۆڵەر) منەوەرێکی قەڵەم بەدەست و چەکی نووسین و بە تایبەتی ئەدەبی لێ بخاتە کار چیرۆکی (لە خەوما)[9]ی کە بایەخدارترینی نووسینە ئەدەبییەکانێتی و کە منیش لێرەدا لێی دەکۆڵمەوە، دێڕ بە دێڕی تەرخانە بۆ هێرش بردنە سەر شێخ مەحموود، ئەوپەڕی بەهرەو تواناو ئەدەبی خۆی بۆ ئەم مەبەستە تیا بەکار هێناوە، کە بەوە بێ ئەوەی خۆی لێی بە ئاگا بووبێ، یەکەمین چیرۆکی هونەری لە ئەدەبی هاوچەرخی کوردیدا هێنایە بەرهەم و بۆ یەکەم جار (٥) نموونەی ئەم بابەتە ئەدەبییە نوێیەی تیا هێنایە کایەوە))**[١٠].

(ژیانەوە) سەروتاری دوایین ژمارەی، ژمارە (٥٦)ی ڕۆژی پێنج شەممە، ١٤ی کانوونی دووەمی ١٩٢٦ی بۆ (تکایەکی تایبەت) تەرخان کردووە، تێیدا زۆر ستایشی خۆی کردووە، بەوەی هەمیشە **(خزمەتی هەموو کوردێکی کردووە، بۆ بڵاوکردنەوەو نەشری ئەو دەنگانەی کە بە جدی و سەمیمی لە ئەعماقی قلوبی کوردەکانەوە بۆ تەرەقی و پێشکەوتنیان سدووری کردووە)** هەرچەندە داوا لە خوێنەرانی دەکات ئابوونەی تێدا بکەن، داواش لەوانە دەکات کە ئابوونەیان هەیە، لەپێناو پشتگیری کردن لە ڕۆژنامەکە هەرچی زووە ئەوەی لەسەریانە بیدەن و پشتیوان بن بۆ بەردەوام دەرچوونی ڕۆژنامەکە، وێڕای ئەوە لە هەفتەی دواتردا ناوی خۆی گۆڕی بە (ژیان) و لە ژمارە یەکەوە کەوتەوە دەرچوون.

ڕوونە کە لەگەڵ بە ڕەسمی لکاندنی ویلایەتی مووسڵ بە عێراقەوە، ئەرکی (ژیانەوە) تەواو بوو، قۆناغێکی نوێش دەستی پێکرد پێویستی بە ڕۆژنامەیەکی تازە و بە ئەرکی تازە دەبوو.

## ژیان

(ژیان) ڕۆژنامەیەکی (سیاسی ئەدەبی) بوو هەفتەی جارێک دەردەچوو، ژمارە یەکی لە ڕۆژی پێنج شەممە، ١٩٢٦/١/٢١ دەرچووە، واتە یەک هەفتە دوای دەرچوونی دوایین ژمارەی (ژیانەوە)، کە ژمارە ٥٦ بوو لە ١٩٢٦/١/١٤. (ژیان) لە چاپخانەی شارەوانیی سلێمانیدا چاپ دەکرا، هەر خۆشی لایەنی دەرکردنی

ڕۆژنامەکە بوو بە چوار لاپەڕەی قەبارە ٣٢×٢٠سم.

لە سەروتاری ژمارە یەکی بە ناونیشانی (ناوی تازەی غەزەتەکەمان) دا هاتووە **«مەعلوومە کە لیوای سلێمانی مەعزور ئەو ئینقیلابە بوو کە دیان و لە حەقیقەتدا مەحکومی مەحوو بوو، غەزەتە مەحبوبەکەشمان هەروەها تووشی ئەو تەئسیراتە هات، رووناکی نەما بوو تاریک مابوەوە. نیهایەت شەفەقی حامی موعەزەم لە دوایی هێنانی، ئەو فەلاکەتە ئێمەی ژیاندەوەو نوری غەزەتەکەمان هەڵگیرسایەوە. بۆ ئەوەی ئەم حاڵە تەسویر بکا ناونرا «ژیانەوە»، ژیانەوە هەتا مدەتێکی مناسیب فەلاکەت رابردووی بە ئاوازێکی حەزین و بە ئادابێ کە دڵ بتوێنێتەوە ئەیدا بە گوێ، وای خستە بەرچاوی خوێندەواران بۆ نەوعە دەرسێکی عیبرەتی ئەدا. دیسان هەر لەبەر ئەوەی مقەددەرات و ئیستیقبالمان ساغ نەبووبوەوە، دەوری ژیانەوەش بۆ ئێمە نەبوو بە بەرزەخێکی ژین و مردنی وەها غەزەتەکەمان کە میسالێکی ئەم وەتەنەیە یاخو سینەماییێکە کە مقەددەرات و مەوجودییەتمان پەردە پەردە نیشان ئەدا، سوورەتی حەقیقەتی پێ دەرنەئەخراو حەقیقەت مەغدور بوو.**

**پەیامی خێر کە مژدەی مانەوەی وەتەنە خۆشەویستەکەمانی گەیاندە روحێکی تازەی واو سەعادەتێکی ئەبەدی بەخشی بۆمان.**

**بەو مناسەبەتەوە غەزەتەی ژیانەوەش کەوتە دەورەیەکی تازەو گەشاوە، بۆ ئەوەی بوون و ژیانمان تەمسیل و ئیرشاد بکا ناوی نرا «ژیان» تەنها لە ناوی پێشووی بە لابردنی دوو (ە)و (و)[11]یک دواییەوە. ئینجا ئومێد گەورەمان هەیە کە لەمەو دوا ئەم غەزەتە خۆشەویستەمان نائل معاونەت هەموو لایەک بێ مقالات فائیدەدار کە مناسەبەتی بێ بە ژیانمان و بە پێشکەوتن و سەعادەتمان بۆ ئەم غەزەتەیە بنێرێت.**

**ئیتر خوای تەعالا (ژیان)مان مبارەک و مەسعود بفەرموێت».**

(ژیان) تا ساڵی ١٩٣٨ بە بەردەوامی دەرچووە، دوایین ژمارەی ژمارە ٥٥٣ بوو لە ١٩٣٨/٣/١٠دا دەرچووە، بەم جۆرە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا یەکەمین جار بوو ڕۆژنامەیەک نزیکەی ماوەی سێزدە ساڵ بەردەوام بێت، ژمارەکانیشی

(٥٠٠)[١٢]ی تێپەڕاند.

(ژیان) خەسڵەتێکی دیکەشی هەیە و دەخرێتە سەر کاروانی ڕۆژنامەوانییەکەی، بەوەی یەکەمین ڕۆژنامەیە لە حکومەت جیابووەتەوەو بووە بە ئەهلی، پیرەمێردی[١٣] شاعیر ئیمتیازەکەی کڕییەوە و، وەک ڕۆژنامەیەکی ئەهلی کەوتە دەرکردنی، لە ژمارە (٤٠٦)ەوە لە چواردەی ئابی ١٩٣٤دا بوو بە سەرنووسەری، پاش ئەوەی لە ژمارە (٣٢١)ەوە لە شەشی ئایاری ١٩٣٢دا دوای مردنی حوسێن نازم سەرنووسەری پێشووی، ئەرکی سەرنووسەرایەتییەکەی گرتە ئەستۆ.

دەکرێ ئەرکی نوێی (ژیان) لەوەدا بخوێنینەوە، کە لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکەدا پاشەکشەیەکی گەورەی سیاسەت و هەواڵی سیاسی، چ نێودەوڵەتی یا ناوخۆ، بەدی دەکرێت، بەوەی پانتایی زۆری بۆ ئەدەب و زانست و زانینەکان تەرخان کرد، ژمارە ١١ کە ڕۆژی پێنج شەممە لە یەکی نیسانی ١٩٢٦ و ژمارە ١٢ی ڕۆژی دووشەممە لە ١٩٢٦/٤/١٢ و زۆر لە پانتایی گەلێ ژمارەی دیکە و جیاجیا، بێ لە ئاگادارییەکانی لاپەڕە چوار، بە تەواوی بۆ (مژدەیەکی گەورە بۆ هەموو کوردان) تەرخان کراون، بە بۆنەی دامەزراندنی (کۆمەڵەی زانستی)یەوە لە سلێمانیدا.

لە ژمارەکانی دوا دواییدا، ڕۆژنامەکە تەنیا بایەخی بە ئەدەبیات و کۆمەڵایەتی دەدا، بە کورتی ئامانجی (ژیان) لەوەدا پوختە دەکرێت و، وەک دەردەکەوێت هەوڵی بە گوڕ و بەتینی دەدا بۆ ئارام کردنەوەی سۆزی گڕگرتووی نەتەوەیی و خافڵاندنی لەوەی بچێت بە لای بیری سیاسی کە شەڕ و توند و تیژیی لێ دەکەوێتەوە، هەروەها ئاراستە کردنی ئەو سۆزە نەتەوەییە بەرەو مەیلە ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و زانستی و ڕۆشنبیرییەکان، بە ڕادەیەک کارکردنی (ژیان) لە ژیانی ئەدەبی و بە تایبەتی شیعر زۆر دیار و ئاشکرایە.

هەر بە نموونە (ژیان) درێژەی بە بڵاوکردنەوەی چیرۆکی (لە خەوما) دا، کە لە (ژیانەوە)وە بۆی مابووەوە، ئەڵقەی ١٩ی لە ژمارە یەکدا بڵاوکردەوە، لە

بلاوکردنەوەشیدا بەردەوام بوو، تا ئەڵقەی ۲۳ لە ژمارە ۲٦ لە ڕۆژی پێنج شەممە ۱۹۲٦/۷/۲۹دا بلاوکردۆتەوە، وێڕای ئەوەی لە کۆتاییەکدا پەیڤی (ماویتی) نووسراوە، بەڵام هەر وەکو پێشتر گوتمان پاشماوەکە لە کتێبەکەشدا دەرنەکەوت کە لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا دەرچووە، تێیدا چیرۆکەکە وەک کە لە خودی نووسەرەکەی وەرگیراوە، بلاوکراوەتەوە.[١٤]

هەرچی وتاری (ئەدەبیاتی کوردی)یە بە زنجیرە لە ژمارە (۲۰) ڕێکەوتی ڕۆژی پێنج شەممە ۱۹۲۷/٦/۱۰دا بلاوکراوەتەوە، مەحمود زامدار یەکێ لە ڕەخنەگرانی دیاری هاوچەرخ لە بارەیەوە دەڵێ: **«شێخ نوری - زنجیرە وتارو لێکۆڵینەوەیەکی وردو دوورو درێژی دەربارەی شیعرو بزاڤی نوێی شیعر لە چەند ئەڵقەیەکدا لە ڕۆژنامەی «ژیان»دا بلاوکردۆتەوە، کە بە رای من پێش هەوڵ و تەقەللاو بەرهەم و لێکۆڵینەوەکانی پیرەمێردو ڕەفیق حیلمی و عەلادین سجادی دەکەوێت، بەم کارەی بەردی بناغەی لێکۆڵینەوە هاوچەرخەکان و تێگەیشتنی قووڵی لە بواری شیعر دانا»**[١٥].

(ژیان) لە ژمارە (۳۳٦)ەوە بە زنجیرە چیرۆکی مێژوویی (دوانزە سوارەی مەریوان)ی پیرەمێردی بلاوکردوەتەوە، بەردەوام شیعرەکانی لە پاڵ شاعیرانی هاوچەرخی خۆیدا بلاودەکردەوە، لەوانە گۆران شیعرێکی لە ژمارە (۲۹۰)دا بلاو کردۆتەوە، هەروەها فایەق بێکەس و زۆرانی دیکە.

وا دیارە حکومەت زۆر هۆشیارانە دێتە بەرچاو، لە مامەڵە کردنیدا لەگەڵ (ژیان)، لە سەرەتادا سەرنووسەرایەتییەکەی بە حوسێن نازم سپارد، ئەویش بە واتای ڕۆشنبیری و شارستانیەتی هاوچەرخ، ڕۆشنبیرێکی گەورە بوو، کاتێکیش ئەو مرد حکومەت وازی لە ئیمتیازی ڕۆژنامەکە هێنا و ئەو مافەی دایە پیرەمێرد، لەم هەڵبژاردنەشدا زیرەک بوو، ئەم شاعیر و ڕۆشنبیرە گەورەیە، نەتەوە پەرستێکی دیار بوو، بەڵام لە بواری ڕۆشنبیریدا نەک لە بواری سیاسی و چەکداری و شۆڕشگێڕیدا.

با نامەیەکی کراوەی ئەو (واتە پیرەمێرد- وەرگێڕ) بخوێنینەوە کە لە ژمارە

(٥٠٢)ی ڕێکەوتی ١٤/ ١٠/ ١٩٣٦دا، ئاراستەی ئەمین زەکی بەگی کردوە بە بۆنەی کاندید نەکردنی لە کابینەی وەزارییەکەی حیکمەت سلێماندا، نووسیویەتی:
**«نور دیدەی عرفانی ولاتەکەمان ئەمین زەکی بەگ[١٦]: زۆر کەس هەیە کردوویانە بە خوو. یەکێ مەنسەبێکی گەورەی دەستکەوتبێ کتوپڕ تەبریکی بۆ دەنووسی کە لێشکەوت تەئەسوور!!**

**من ئەو دەمەی تۆ بووی بە وەزیر نووسیم هیچ ئارەزووم نەبوو، بۆ تۆ بنووسم معالی یەعنی حەزم نەکرد ببی بە وەزیر، ئێستاش زۆر لام خۆشە لە وەزیری دا نەمای، چونکە ئەمەندە سالێ وەزیریت کرد (ئەما چ وەزیریێک؟) ئێران دەڵێن مۆسیقا دوازدە مەقام و ٢٤ شوعبەیە. ئیدارەی دوازدە مەقام و ٢٤ شوعبەت کرد بە قەد دوو جزمە تاریخەکەت[١٧] بەکار نەهات و لەمیشت دا خۆم ئەیزانم کە قەرزداری، بە سایەی خواوە وا ئەمجارە بۆ خۆمان یەعنی بۆ قەومەکەت بویتەوە بە ماڵ .. خێر، خێر! قەومەکەت ناڵێم ئەگەر قەوم ئەبووین ئێمەش یەکێکمان لە کایدا ئەبوو!! ئەویکەش بە ناچاری تۆ دەبویت چونکو کەسی تر شک نابەین بۆ ئەو بڕیینی.**

**ئەوە کەیفی خۆیانە ئێستا ئەوەی من ئەمەوێ، تا من ماوم تۆ بنووسە من بۆت چاپ بکەم. بەرگوزاری کوردی هەژار ئەوەیە یادگاری بەکار.»**

(ژیان) (بە گەلێ وتاری کۆمەڵایەتی ڕازابۆوە، کە چارەسەری هەندێ گرفت و نەریتی نارێک و باوی نێو کۆمەڵگای کوردەوارییان دەکرد) هەروەکو جەبار جەباری[١٨] دەڵێ. هەرچی جەمال خەزنەداریشە لە بارەیانەوە دەڵێ: (ئەم ڕۆژنامەیە دەورێکی باڵای بووە لە بڵاوکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی و چەسپاندنی هەندێ بیروڕای ڕاست و ماقوول لە بارەی زمان و ئەدەب و فۆلکلۆرو سەرگوزشتەو چیرۆک و لەناوبردنی نەخوێندەواری و چەسپاندنی مافی ئافرەت و پەرەسەندنی بیروباوەڕی ڕاست و بێزاری دەربڕین بەرامبەر بە دوژمنانی کورد)[١٩].

بەڵام وا دیارە پیرەمێرد زۆر جار ئەو هێڵە سوورە زۆر و زەبەندانەی دەبەزاند کە بە دەوری ڕۆژنامەکەیدا کێشرا بوون، لەگەڵ ئەوەی بە ڕەنج و ئازارێکی زۆرو کەم

دەرامەتی رۆژنامەکەی دەرکردووە. کار بەدەستە گەورەکانی میری و دەوڵەمەندەکان زۆر جار هاوکارییان لەگەڵ نەکردووەو گێچەڵیان بۆ دروست کردووە، بایەخیان بە رۆژنامەو بە زمانی کوردی نەداوە [٢٠].

پیرەمێرد گەلێ جار ئاماژە و رەخنەی دەمامک دراوی بڵاوکردۆتەوە، با ئەم هەواڵەی لە لاپەڕە سێی ژمارە (٤٧٥) ڕێکەوتی شەممە ١٩٣٦/٤/١٨ بخوێنینەوە بە ناونیشانی (چەواشە):

**(ئەم جارەیان مامۆستای بەڕێز رەفیق حیلمی ئەفەندی رەوانە کراوە بۆ بەڕێوەبەری ناوەندی ناسرییەو منتەفک خوا کاریان ڕاست بێنێ کە بۆ دوورتریان ڕەوانە نەکردووە ئەوان لە لایەک پێمان دەڵێن ئێوە مامۆستای باشتان نییە. تا لێرەدا بیانکەین بە بەڕێوەبەری قوتابخانە، لە لایەکی دیکەش رەفیق حیلمی ئەفەندی دەتارێنن کە عەرەبی و کوردی و فارسی و تورکی و زمانی دیکەی بێگانەش دەزانێت و کتێبی چاپکراویشی هەیە، ئینجا داوا لە عەلی کەمالیش دەکەن کە بێدەنگ بێت)** ئەمە وای لە بەرپرسان کرد گرێبەندی چاپخانەکەی بۆ تازە نەکەنەوە کە لە ساڵی ١٩٣٧دا کۆتایی هات و دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی دی کە پتر بە گوێی حکومەت بکات پەسند بکەن، جا لە ١٩٣٧/٩/١١ بەدواوە ڕۆژنامەی (ژیان) یان دەرکرد، هەرچەندە پیرەمێرد چاپخانەیەکی تایبەت بە خۆی هێنا، بەڵام زۆری نەبرد ئیمتیازەکەشیان لێ سەندەوە و بۆ باشووری عێراق دوور خرایەوە، پاش ئەوەی وتارێکی بڵاوکردەوە تێیدا هێرشی کردە سەر متەسەریف، بەم جۆرە (ژیان) وەستا.

## کەرکووک (کرکوک)

کەرکووک (کرکوک) ڕۆژنامەیەکی سیاسیی وێنەدار بوو، شارەوانیی کەرکووک بە زمانی عەرەبی و کوردی و تورکی دەری دەکرد، ژمارە یەکی لە ١٩٢٦/١٠/١٢دا دەرچووە، بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ و شێوازی جۆراوجۆر و بە لاپەڕە و قەبارەی جیاجیا [٢١]، درێژەی بە دەرچوونی خۆی دا تا ١٩٧٢/٨/٢٠ بە

دەرچوونی ژمـــارە (٢٠٣٣)، ئەم رۆژنامـــەیە تا ژمـــارە (٣٩) لە چاپخـــانەی (الحوادث) چاپ دەکرا، لەوەدوا لە چاپخانەی شارەوانیی کەرکووکدا چاپ دەکرا (٢٢).

لە سـەرەتادا (کـرکـوک) هەفـتـەی دوو جـار بە چوار لاپەڕە بە زمـانی تورکی دەردەچوو، وەجدی ئەفەندی تا سالّی ١٩٢٧ ئەرکی نووسـینی تێدا بەڕێوە دەبرد، پاشان لە ژمارە (٦٦)ەوە هیجری دەدەی کاکەیی شاعیری ناسراوی کورد ئەرکەکەی گرتە ئەستۆ، بە درێژایی هەردوو سالّی ١٩٣٠ و ١٩٣١ بەشی کوردی خرایە سەر رۆژنامەکە، لە ژمارە (٣٠٩)ی ڕێکەوتی ١٩٣٠/٦/٣٠دا ڕۆژنامەکە بۆ نموونە، خـۆی بەم ڕسـتـە کـوردییـە دەناسـێنێ (هەمـوو شـتێ دەنووسێ، جـارێ هەمـوو دووشەمووان دەردەچێ، غەزەتەیەکی تورکی و کوردییە).
دەکـرێ بلـّێین زۆربەی سـەروتـارەکـانی بەشی کـوردی وەرگـێـڕانی سـەروتارە تورکـیـیـەکـانن، هەروەها سەبارەت بە هەوالّە ناوخۆ و نێـودەولّەتی و برێ لە وتارە کۆمەلاّیەتییەکان، سەرباری هەوالّ و وتاریش کە بە کوردی لەسەر کۆمەلّگای کورد نووسراون، هەروەها هەوالّەکانی کوردستانی تورکیا و ئێران بە سۆزێکی ئاشکرای نەتەوەیی نووسراون، وەک ئەو وتارەی لە ژمارە ٣٢٨دا بلاّوکراوەتەوە، دەربارەی لە سێدارەدانی شێخ سەعیدی پیران سەرکردەی شۆڕشی کورد لە سالّی ١٩٢٥دا دژ بە مستەفا کەمال ئەتاتورک.
زۆر لە نووسەران و شاعیرانی کورد، لە ڕۆژنامەکەدا بابەتیان بە زمـانی کوردی بلاّوکردوەتەوە، وەک: عەبدولخالیق ئەسیری، شێخ سەلام، ئەحمەد موختار جاف، مـحـەمـەد زەکی و ، ئەحـمـەد کـۆیی، هەروەها گـەلێ نووسـەر و شـاعـیـری دیکەی دیاریش لە نووسینی ڕۆژنامەکە و دەولّەمەند کردنی بە بابەت بەشدار بوون، وەک: هیجری دەدە، پیرەمێرد، نوری سایب (حەبەزبووز) و کەسانی دی.
بەشە تورکییەکەی زۆر وتاری دەربارەی مێژووی کەرکووک و هەندێ لەو هۆزانەی دەوروبەری وەک تالّەبانی، بلاّودەکـردەوە سـەرباری شـیـعـری تورکی بۆ شـاعـیـرانی تورکمـان و کورد، وەک شێخ ڕەزا و خالّسی و فـائیزو خالّس و کەسانی دیکە، لەو

ماوەیەدا ڕۆژنامەکە لە نێوان هەردوو بەشی تورکی و کوردیدا شیعری فارسی و هەواڵی بە زمانی عەرەبی بڵاودەکردەوە.

## زوبان (زبان)

(زبان) وەک ڕۆژنامەیەکی ئەلتەرناتیڤی (ژیان) دەرچوو، چونکە مەجید یەعقوبی متەسەریفی سلێمانی لە (ژیان) ڕازی نەبوو، وا دیارە ناکۆکییەکە شەخسی و دژ بە پیرەمێردی خاوەن و سەرنووسەری (ژیان) بوو، بۆیە ڕۆژنامەیەکی نوێ و بە هەمان ناوی (ژیان) دەرچوو، بەڵام لە ژمارە یەکەوە دەستی پێکرد واتە ژمارە یەکی ڕۆژنامە تازەکە، کە هەر بە ناوی خودی ڕۆژنامەکەی پیرەمێرد (ژیان) ەوە دەرچوو، پاش ئەوەی چاپخانەکەیان لەو سەندەوە، ژمارە (یەکی) پێوە بوو لە ڕێکەوتی ١١/٩/١٩٣٧.

پاش دەرچوونی دووەمین ژمارە، پیرەمێرد لێی کردنە هەرا و هەڵلا، وا دیارە لەگەڵ بەردەوام دەرچوونی ڕۆژنامەکەی دەیتوانی بەرەو ڕووی دادگایان بکاتەوە، هەروەها لەوەی پێگەیەکی کۆمەلایەتیی هەبوو، وای لە بەرپرسان کرد لە دژایەتی کردنی بسلەمنەوە، کەچی پەنایان بۆ فێڵێک برد و ئەویان پێ بێ دەنگ کرد، چەند خاڵێکیان لە ناوە کۆنەکە ڕەش کردەوە، بۆ ئەوەی ناوێکی چاک و بێ خەوش بە دەستەوە بدات، کە (زبان)[٢٣] بوو هەر لە ژمارە سێوە پەیڕەو کرا [٢٤].

لایەنی بەرپرس لە دەرکردنی (زبان) شارەوانیی سلێمانی بوو، ساڵح قەفتانیش [٢٥] سەرنووسەرەکەی بوو.

هەرچەندە (زبان) ناوی بەوە دەرکردوە کە ڕۆژنامەیەکی مێژووییە [٢٦]، بەڵام ڕۆژنامەکە خۆی بەم ڕستەیە دەناسێنێ: (زبان ڕۆژنامەیەکی کوردییە هەموو یەک شەمموانێ دەردەچێ)، وا دیارە هۆی ئەو ناوبانگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە ساڵح قەفتانی سەرنووسەرەکەی یەکێک بوو لە ناودارترین مێژوونووسانی کورد لەو ماوەیەدا، د. کەمال مەزهەر وا پەسنی دەکات کە **(جێگەی دیارە)و (کەم لە ڕووناکبیرانی سەردەمی خۆی بە ڕادەی ئەو عەوداڵی مێژوو بوون کە تەنانەت وەک**

**دەرسیش ئارەزووی وتنەوەی لە هەموو بابەتەکانی تر زیاتر بوو)**[27].

ڕۆژنامەی (زیان) بە کردار پانتاییەکی زۆری بۆ بابەتە مێژوویيەکان بە گشتی و مێژووی کورد بە تایبەتی تەرخان کرد، زۆربەشی هەر ساڵح قەفتان خۆی دەینووسی، کاری پیت چنین و چاپەکەی لە ئەستۆ گرتبوو، هەروەها ئەحمەد شوکری و، ئەحمەد عەزیز ئاغا، یارمەتییان دەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا ژمارە هەیە هیچ بابەتێکی مێژوویی تێدا نییە، تەنیا بابەتی زمانەوانیی تێدایە، ڕێک بەپێی ناوی ڕۆژنامەکە، وەک ژمارە نۆ لە ڕێکەوتی ١٤/١١/١٩٣٧، کە زۆربەی لاپەڕەکانی بۆ وتارێک بە ناوی (چۆن بنووسین؟) تەرخان کردووە.

ئاشکرایە ئەوانەی لە دەرکردنی (زیان) بەرپرس بوون، هەوڵیان دا ئەو هەستە نەتەوەییەی پیرەمێرد وروژاندی و گەشەی پێ دا، کۆنترۆڵی بکەن، کۆششیان کرد بەرەو دوا بیگێڕنەوە و هەندێ خامۆشی بکەن، بێ ئەوەی بتوانن بە یەکجاری لەناوی ببەن، بۆی هەیە ئەم شتە بە هۆی پەیوەست بوونی دەسەڵاتی مەلیکی بە پەیماننامەی نێودەوڵەتییەوە بوو بێت، بە تایبەتی لەگەڵ بەریتانیا، هەروەها بڕیاری کۆمەڵەی گەلان بە لکاندنی ویلایەتی مووسڵ بە عێراقەوە، کە هەر هەموویان باسی مافی رۆشنبیری و نەتەوەیی کورد دەکەن لە باکووری عێراقدا.

(زیان) ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی زۆر جار شەش لاپەڕەیی بوو، ڕێک بە قەبارەی خودی ڕۆژنامەی (ژیان) هەر جارێکیش ٣٠٠-٥٠٠ دانەی[28] لێ چاپ دەکرا، هەروەها ٤٧ کەس ئابوونەیان تێدا هەبوو ،دانەیەکیش بۆ شێخ مەحمود ڕەوانە دەکرا، کە بۆ باشووری عێراق دوور خرابووەوە، دانەیەکیش بۆ پسپۆری کاروباری کورد مینۆرسکی[29] ڕەوانە دەکرا، شەش دانەش بۆ ئەدمۆندز[30] لە بەغدا، بۆ ئەوەی بۆ هەڵگرتن بینێرێتە ئەوروپا.

دوایین ژمارەی (زیان) ژمارە ٩٤ بوو لە ١٨ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤١دا دەرچووە، لە ساڵانی دەرچوونیدا نەوەد و چوار ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە، پاشان نەزانراوە لەبەر چی، ڕاگیراوە، لەوانەیە وەستانەکەی پەیوەست بێت بە ڕەوشی

دووەمین جەنگی جیهانییەوە.

جەبار جەباری پەسنی دەکات و دەڵێ، بەشدار بوو (لە بەرەوپێش بردنی ئەدەبی کوردی و زیندوو کردنەوەی کلتووری نەتەوەیی گەلی کورد)[٣١].

## ب- گۆڤارەکان

### دیاری کوردستان

گۆڤارێکی هەفتانە بوو بە زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی، خاوەن ئیمتیاز و بەڕێوەبەری بەرپرسی ساڵح زەکی ساحێبقڕان بوو، ڕەشید شەوقییش بەڕێوەبەری کارگێڕیی بوو، (دیاری کوردستان) ئەدەبی، کۆمەڵایەتی، وێنەدار بوو، هەواڵی هەمەڕەنگی ناوخۆ و جیهانیی بڵاودەکردەوە، هەروەها شیعری شاعیرانی ناسراوی کورد و چیرۆک و حەکایەتی فۆلکلۆری کوردیشی بڵاو دەکردەوە، وێنەکانیشی بە زۆری ناودارانی کورد بوون.

ژمارە ١ی (دیاری کوردستان) لە ١١ی ئاداری ١٩٢٥دا دەرچووە، دوایین ژمارەشی- ژمارە (١٦) لە ١١ی مایسی ١٩٢٦دا دەرچووە، هەر ژمارەیەکی ٢٤ لاپەڕەی قەبارە ٢٢×١٦سم بوو، بەڵام جووت ژمارەی (١٣و ١٤)ی بریتی بوو لە ٤٠ لاپەڕە، لێکۆڵیارێک وا پەسنی کردووە کە (گۆڤارێکی دەوڵەمەندە)[٣٢] جەبار جەبارییش وا پەسنی دەکات، کە ناودارترین گۆڤارێکی کوردییە لە بەغدا دەرچووە.[٣٣]

(دیاری کوردستان) لە چاپخانەی فورات لە بەغدا چاپ دەکرا، هەر پازدە ڕۆژ جارێک دەردەچوو، چونکە توانای دارایی خاوەنەکەی کەم بوو، پاشان لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی چووە ڕێچکەی سەربازییەوە، گۆڤارەکە لە دەرچوون وەستا.

هەموو ژمارەکانی (دیاری کوردستان) بە وێنەیەکی سەلاحەدینی ئەییووبی ڕازابوونەوە، لە ژێریان دا بە زمانی کوردی نووسرا بوو **(تۆ نەمردووی ئەی سەلاحەدینی ئەییووبی نەسەب، هەر بژی ئەی شاهی بەیتی کورد ئەی فەخری عەرەب)** هەرچی وێنەکانی دیکەیە کە لە ژمارەکانی گۆڤارەکەدا بڵاوکراونەتەوە، وێنەیەکی ڕوون سەبارەت بە ئامانجەکانی بە دەستەوە دەدات، وێنەی مەلیک

فـەیسـەڵی یەکـەم و شـازادە غـازی و سـێـر هینری دوبس مـەندوبی سـامی و ڕۆژنامەنووس خەڵەف شەوقی ئەفەندی داودی- وەک پاداشتێک بۆ هاوکاری کردنی گـۆڤارەکـە بە نووسین و وەرگـێـڕان لە بەشـە عـەرەبییـەکـەیداو - چەند وێنەیەکی دەرچووانی خـانەی مـەشـقی سـەربازی و حـوجـەتولئـیـسـلام ئایەتوڵڵا شـێخ مـەهدی ئەلخـالسی و سەرۆکی وەزیران تەها ئەلهاشمی و جەمیل سدقی زەهاویی شاعیر و سـەرکـردەی کـورد سـەید ئەحـمـەدی خـانەقـا و سـەرۆک وەزیرانی پێشـوو جـەعـفـەر عەسکەری و تالیب ئەلنەقیب و ڕەشید عالی گەیلانی و عـەبدولکازم ئەلشەمخانی نوێنەری بەسراو، وێنەی مەککەی موکەڕەمە و مـەلیکی پێشووی حیجاز حوسێنی یەکەم و مـەلیکی حیجـاز عـەلی کـوڕی حوسێن و پیری تەمەن درێژان زۆراو ئاغـاو، عەبدولحوسێن ئەلسەعدونی سەرۆک وەزیران و وەزیران سەبیح نەشئەت و حـیکمەت سلێمـان و ناجی ئەلسویدی و عـەبدولحوسێن ئال چەلەبی و حەمدی ئەلپاچەچی و حوسێن کەنعـان پاشا بەدرخان و، نێـردراوی بەغدا شێخ محەمەد ڕەزا ئەلشبیبی و هەردوو ئەندامی ئەنجوومەنی مـاقـوولان مـەولود موخلیس و شێخ سـالح بەگ باش ئەعیـانی عەباسی و زەعـیم سەید محەمەد سەدرەدین و جێگری مەلیک میر زەیدو، سەماحەتی ئیبراهیم حەیدەری و نوێنەری مووسڵ حازم بەگ شەمدین ئاغا و هەردوو نوێنەری هەولێر داود ئیـبراهیم حەیدەری و عـەبدوڵڵا مـوخلیس ئال ڕەسـوڵ پاشا و بەڕێوەبەری پۆلیسی هەولێر عـەلی سـەروەت و شێخ عـەبدوڵڵا ئەلخـالسی و خەلیل بەگ ئال بابان و دوایین شـای ئێـران لە سـەردەمی قـاجـاری دا ئەحـمـەد شـا قـاجـارو حـاکـمی نوێ ڕەزا خـان پەهلەوی و نوری سـەعـیـد پاشا و نـوێنەری هەولێـر سەعـید بەگـزادە ئیـسـمـاعـیل و یوسف ئەفـەندی زادە ئیبـراهیم و ژەنەراڵ لیـدونەر و شـێخ سـەعـیـد سـەرکـردەی شـۆڕشی کـورد و مـەعـاون پۆلیـسی سـەمـاوە عـەلی کـەمـال و نێردراوی مـووسڵ سەعـیـد سابت ئەلچەلەبی و نێردراوی بەغـدا چەرچەفچی زادەی حـاجی ئەمین ئەلچـەلەبی و نێـردراوی دیالا - مـەندەلی نەقـیب سـەید ئەلیـاس و نێردراوی سلێمانی میرزا فەرەج و نێردراوی مووسڵ شێخ نور محەمەد ئەفەندی.

هەمـوو ئەو وێنانە لەتەک ئەو وتارو نووسینانەی گۆڤارەکەدا بڵاوکراونەتەوە کە

بڵاوکردنەوەیان پێویست بووە، واتە بە سادە و ساکاری، گۆڤارەکە مەیلێکی ڕوونی نەتەوەییانەی کوردیی هەبووە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوەشی لە بیر نەچووە، برایەتیی عەرەب و کورد دووپات بکاتەوە، هەروەها خەباتی کورد و چالاکییان لەپێناو ئەوەیە، کە لە نێو دەوڵەتی عێراق و لە چوارچێوەی یاساکانیدا ژیانێکی باشتر بژین.

گۆڤارەکە بە درێژایی ژمارەکانی و بە زنجیرە ژیاننامەی سەلاحەدینی ئەیووبی و قارەمانێتییەکانی بڵاوکردوەتەوە، وەک سیمبولێکی کورد کە قەدری کوردی بەرز کردۆتەوە و خەباتی ئەوانی ئاوێتە بە خەباتی عەرەب کردوە، هەروەها ئەم گۆڤارە شیعری حاجی قادری کۆیی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و کوردی و مەولەوی و سالم و عەبدولخالیق ئەسیری و ئەحمەد موختار جاف و عەلی کەمالی بڵاوکردوەتەوە، ئەم شیعرانە تایبەت بوون بە بەشی کوردیی گۆڤارەکە، هەرچی بابەتەکانی دیکەیە، کە ناوی کەسایەتییەکانمان هێنان بە هەر سێ زمانی گۆڤارەکە بڵاوکراونەتەوە، لەگەڵ بایەخدانێکی ئاشکرا بە لایەنی نەتەوەیی کورد، لە بابەتەکانی دیکەی بەشە عەرەبییەکەیدا، شیعری شاعیرانی وەک عەبدولقادر ئەلزەهاوی و عەبدولڕەحمان ئەلبەنناء و وەرگێڕانی خەیام بەرچاومان دەکەوێت، سەرباری چەند گۆشەیەکی چەسپاو وەک بزەی لێو، وتەی دانایان، (ما رق وراق) کە گۆشەیەکی هەواڵ و هەمەڕەنگی سەیر و سەمەرەی جیهانی بوو.

لە بەشە عەرەبییەکەدا ئەوەی مایەی سەرنجە ، ئەو زمانە ئەدەبییە عەرەبییە پاک و پوختەیە کە لە زمانی ئەمڕۆ نزیکە گەر باڵاتر نەبێت، با سەروتاری یەکەمین ژمارە بخوێنینەوە، کە بە ناونیشانی (كلمه لابد منها ) (وتەیەکی پێویست)ە.

**(کارێکی نابەجێیە گەر بکەوینە ژماردنی سوودەکانی ڕۆژنامەگەری و ئەو خزمەتە مەزنەی پێشکەش بە وڵاتی دەکات، ئەم شتە بووەتە کارێک هیچ دوو کەسێک نییە مشتومڕی لەسەر بکەن، ئەوەندەی بەسە کە (زمانی قسەکەری نەتەوەیە)، هەروەها (ئاوێنەی ئەو وڵاتەشە کە لێی دەردەچێت) جا گەر بمانەوێ سوودەکانی بژمێرین شوێنەکەمان لێ تەنگ دەبێت، ئەم هۆکارە سەرەکییانە پاڵیان**

**پێوە ناین ئەم گۆڤاری (دیاری کوردستان)ە دەربکەین، مەبەستمان بوو ڕۆژانەو سیاسی و هەمەلایەن دەری بکەین، بەڵام هەردەم (با) بە ویستی کەشتیوان هەڵناکات، بۆیە بڕیارمان دا (ئەدەبی، کۆمەڵایەتی، وێنەدار) هەفتانە بە زمانی کوردی و عەرەبی و بە تورکی و فارسی لە کاتی زۆر پێویستدا دەری بکەین، جا ئەوەتا ئەمڕۆ یەکەمین ژمارەی وا دەردەکەین، هیوادارین برایانمان لە ئەدیبانی کورد و عەرەب لە هەردوو ئاستی ماددی و ئەدەبیدا پشتگیریمان بکەن).**

هەروەها بە ناونیشانی (غایتنا) (مەبەستمان) نووسیویەتی: **(مەبەستمان ئەوەیە لە هەر باخە و گوڵێک بە خوێنەر بگەیەنین، هەروەها هەموو شتێکی بەتام و خۆشی زادەی بیری پیاوانی سەردەمی ئێستاو، دۆزراوەی زانستی و رشتەی کۆمەڵایەتی، بە تایبەتیش بایەخ بە کاروباری کوردستان دەدەین، لێکۆڵینەوەی جوگرافی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی دەربارەی ئەو وڵاتەی باکوور بڵاودەکەینەوە، بۆ ئەوەی عەرەبی مەرد ئاگاداری ڕەوشی برا کوردەکانی بێت، هەروەها چاترین بایەخ بە ئەدەبی عەرەبی و مێژووە شکۆدارەکەی دەدات، بەمە خزمەتێکی گەورەی هەردوو نەتەوەی عەرەب و کورد دەکات).**

لە سەروتاری بەشە کوردییەکەشدا بە ناونیشانی (دیباجە) و بە زمانی کوردی نووسیویە **(لە پایتەخت حکومەت فەخیمەی عیراقییەدا جەریدەیەکی سیاسی و یەومی لازم بوو کە لیسانی حالی میللەتی کورد بێ. ئەوەڵەن بۆ ئیمتیاز ڕۆژنامەیێکی سیاسی و ئیجتیماعی و ئەدەبی و ئیقتسادی ئیستیدعایەکم دابوو، بە ناوی تەئمینات ملکم نواند بوو، لاکین قەوانین و ئەوامیری حکومەت بۆ نەشری، جەریدەی سیاسی دوو هەزار ڕوپیەی نەقد دەپوریتوی تەلەب ئەکرد، ئیستیدعایەکی تر بە ناوی (دیاری کوردستان) ئیمتیازی جەریدەیەکی ئیجتیماعی و ئەدەبی مسەوەرم ئیستیرحام کرد. حکومەتی فەخیمە دریغ مەرحەمەتی نەفەرموو، هیچ شتێک نییە کە نەبێژرابێ، هەرچی تازە ڕوویدا ئەوەیە کە لێمان گوم بووەو لە بیرمان نەماوە، (دیاری کوردستان) دیار دیار ئەگەرێ، گوڵ و گوڵزار ئەپشکنێ هەرچی دەست کەوت دەستە دەستە ئەی پەسنێ، جەستە جەستە وەک دەستە گوڵ**

**پێشکەش خوێندەواران و ئاشنایانی خۆی ئەکا.**

**(دیاری کوردستان) کوردی و عەرەبی و تورکی دەرئەچێ، بۆ فارسیش مەئزونە پڕ بکاتەوە، ئینشائەڵلا ئەویش ئەبێ. (دیاری کوردستان) تفلێکی نەوزادە، فیترەتی پاکە. مەقسەدی چاکە، لە ئیجتماعیات و ئەدەبیات باس ئەکا. دەخلی بەسەر سیاسەت نییە. هەفتەی جارێک دەرئەچێ رەسم باو باپیرانمان سورەتی گەورە گەورە پیاو ماقولانمان فوتوغراف مەشاهیر جیهانمان پێ نیشان ئەدا تەرجەمەی حالیان، تەقویمی حەیاتیان بەیان ئەکا.**

**(دیاری کوردستان) کتێبی هەموومانە، یارو هەم حالی خۆمانە، بە کەڵک هەمووماڹ بێت، دیارییەکی باشە، هەرچەندە هێشتا بچووکە فەقەت بۆ ئێمە بە قیمەتە، هەموو شتێک بەرە بەرە گەورە ئەبێ و پێ ئەگا، ئەربابی کەمال و ئەدەبی خۆش ئەوێ. بۆ ئەوانیش ئەگری. بە دیاری بۆ ئەوانی ئەنێرێ .. دیاری هەرچی بێ خۆشە هەتا کۆن بێ بە قیمەت تر ئەبێ، لای ئەولادو ئەحفادمان یادگاری ئەسام و مەرامان ئەبێ).**

هەروەک لە پێشەکییەکەدا ڕوون دەبێتەوە، ئیمتیازی (دیاری کوردستان) بۆ ڕۆژنامەیەکە، ئەمەش زانیارییەکی نەگۆڕ و ئاشکرایە لە کۆتایی ڕۆژنامە یا گۆڤاردا پیشان دەدرێ، هەرچەندە لە فۆرم و شێوە و پۆشاکی گۆڤاردا دەرچووە، هەروەها ئەویش خۆی بە زمان و ڕێنووسی کوردییەوە خەریک بووە، یەکێک لە نووسەرانی گۆڤارەکە لەم بوارەدا زانای زمانزان تۆفیق وەهبییە.

ژمارەکانی گۆڤارەکە لە چاپخانەی ئەلسەلام و چاپخانەی ئەلعەسرییە و چاپخانەی ئەلفورات و چاپخانەی ئەلسریانی کاتولیکی چاپ کراون.

گۆڤارەکە ئاگاداریی کەم و بچووکی بڵاوکردوەتەوە، بۆی هەیە دیارترینان ئەوەیە کە نووسراوە (بە ناونیشانی وانەی تایبەت بە زمانی کوردیی پەتی و، فارسی و، تورکی) ، (ئەوانەی ئارەزووی فێربوونی ئەو زمانانە دەکەن، با سەردانی مستەفا شەوقی نووسەری ڕۆژنامەی بانگی کوردستان بکەن).

## پەیژە

(پەیژە) لە ساڵی ١٩٢٧دا یەک ژمارەی لێ دەرچووە، لە ژێر ناوەکەیدا ئەم دەستەواژەیە نووسرا بوو **(ئەدەبی، ئیجتیماعییە، بە کوردی بۆ کوردایەتی ئەدوێ)** [٣٤] ناوی گۆڤاری تێدا نەهاتووە، بەڵکو لە ژێریدا ئەم رستەیە نووسراوە (دانەر: مستەفا شەوقی)[٣٥].

لە پەراوێزی لاپەڕە پێنج دا ئەمە دەخوێنینەوە **(بۆ چاپ کردن و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە، لە وەزارەت جەلیلەی داخلیە داوای ئیزنم کرد بوو کە لەسەر فەرموودەی ئەوان ٢٩-١١-١٩٢٦، (٥٨٧) ژمارو بە پێی مادە (٤)ی قانونی چاپ لە چاپ دراوە - م.ش)**.

لە ناواخندا بە ناونیشانی (پێشەکی) ئەمە دەخوێنینەوە **(تا ڕۆژنامەیەکمان بۆ رایی ئەبێت، جارێ هەر بۆ ئەوەی کە نووسینمان بڵاو ببێتەوە بە هیوای یارمەتی تێگەیشتوان مللەتەوە ناو بە ناو، بەم جۆرە خزمەتی مللەتم گرتووەتە بەر. هیچ نەبێت لە ناو یارو ئەغیارا نووسینمان بڵاو ئەبێتەوە، کە ئەویش ئەمڕۆ بۆ ئێمە گەلێ گەلێ پێویستە . بە تایبەتی تکا لە تێگەیشتووانی مللەت ئەکەم: لە لایەنی ناتەواویشیەوەی نووسینەوە لێم ببوورن)**.

**بیست و هەشت ساڵ لەمەو پێش هەشت ساڵان بووم کە لە کوردستان دوور کەوتمەوە تا ئێستا هەر بە زمانی فارسی و عەرەبی و تورکی لە خوێندن و نووسینا راهاتووم .. بە زمانی خۆ بەبێ هاودەنگ ئەمڕۆ هەر ئەوەندە ئەتوانم بنووسم، لەبەر ئەوە هیوام گەورەیە لێم ناگرن لێم ئەبوورن.**

ئەم زمانەی کە خاوەنەکەی سەبارەت بە کورت هێنانی، داوای بەخشین دەکات، د. کەمال مەزهەر لە بارەیەوە دەڵێ زمانێکی پاک و ڕەوانەو (هەر ئەو ژمارەیەی لێ دەرچووە، زیاتر لەو نامانە دەکات کە دەستەی ئەلئەهالی دەریان دەکرد) [٣٦]، گۆڤارەکە بریتییە لە هەشت بابەت، چواریان پارچە شیعرن، دوو پارچەیان هی (سەید عەبدولخالقی کەرکووکی)ن کە شاعیری ناسراو (ئەسیری)یە، دوو پارچە شیعرەکەی دیش یەکیان هی (م. نوری)یەو ئەوی دیش هی (قازیی هەڵەبجە مەلا

حەسەن)ە، چوار بابەتەکەشی وتارن و لە لایەن مستەفا شەوقییەوە نووسراون.

(پەیژە) بریتییە لە ٤٦ لاپەڕە- هەردوو بەرگی پشت و پێشەوەی - بە قەبارەی ١٨×١٢سم بوون، لە بەرگی پێشەوە، بێ لەو ناساندنانەی ڕابردوو، ئەم دەستەواژەیەش نووسراوە: (حقوقی چاپ بۆ دانەریەتی)و (چاپخانەی ئەلفورات- بەغدا- ١٣٤٥- ١٩٢٧).

ڕێبازی (پەیژە) لە هەموو بابەتەکانیدا سیاسی نەتەوەیی بوو، هەر لە وتاری یەکەمەوە (وەتەن و میللەت) (نیشتمان و گەل) کە تێیدا ئازاری نووسەر ڕوون دەبێتەوە سەبارەت بە ئەشکەنجەی نەتەوەکەی و پاشکەوتنی و بێ بەش بوونی لەو مافانەی نەتەوەکان دی پێی فەراهەم بوون، کە ئەوان یەکیان گرت و فێربوون و هەوڵی زۆریان دا تا سەرکەوتن، لە کاتێکدا کورد پێویستی بەوەیە لە مێژووی جیهان ورد بێتەوە بۆ ئەوەی درک بە هۆی پاشکەوتن و پەرتەوازە بوونی خۆی بکات.

هەرچی شیعرەکەی (سەردەمێکی ڕابردوومان)ی عەبدولخالق کەرکووکییە، زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێت، کە بە پەرەموچی شیعر نەخشەی کوردستان دەکێشێ، خاوەن وتاری یەکەم لە بارەیەوە دەڵێ: بنەماکانی سەربەخۆییەکەی بەر لە حەفتا ساڵ ڕیشەکێش کراون، بۆی هەیە مەبەستی ڕووخانی میرنشینە کوردییەکان بێت بە دەستی دەوڵەتی عوسمانییەوە، وتارەکە هەر لە لێدوانێکی سیاسی دەچێ.

هەرچی شیعری (گلەیی)ی (قازیی هەڵەبجە مەلا حەسەن)ە، لوتکەیەکە لە داڕشتنی شیعری و سۆزی هەڵایساوی نەتەوەیی، بێگومان مستەفا شەوقی لەگەڵ وتارەکانی خۆیدا بڵاوکردوەتەوە، چونکە هاوجووت بووە لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی، بۆیە خستییە پاڵ گۆڤار- کتێبەکەی، لەوانەیە جیاوازیی نێوانیان ئەوە بێت، شاعیری هەڵەبجەیی ڕوون و ئاشکرا هۆیەکانی (ناڵین) و (گریان) و (خوێن)ی ڕژاوی کورد بۆ خەڵکی دی دەگێڕێتەوە، لە کاتێکدا مستەفا شەوقی کورد لە بەرپرسایەتی نابوورێت، ئەوەی ڕایەکەی ئێمە دووپات دەکاتەوە ئەوەیە، شیعرەکە حاڵی بە چەشنی حاڵی ئەو پێشەکییەیە کە لە لاپەڕە پێنج دا بڵاوکراوەتەوە-

هەرچەندە بەجیاشە، بەڵام خراوەتە نێو وتارە درێژەکەی (وەتەن و میللەت) (نیشتمان و گەل) کە دابەشی سەر چەند بڕگەیەکی ژمارەدار کراوە و لە لاپەڕەکانی ٣ و ٤و ٥و ٦ و ٧ و ٨ و ٩ و ١١ و ١٢ و ١٩ و ٢٠ و ٢١دا بڵاوکراونەتەوە، کەچی بە تەنیا بۆ بڕگەی چوار، کە لە لاپەڕە (١١)دا بڵاوکراوەتەوە ناونیشانێکی گەورە داندراوە، کە بە ناوی (براگەل)ە، بۆی هەیە بۆ زیاتر دووپات کردنەوەی گوتارەکە بێت بۆ خوێنەران.

دەکرێ بڵێین شیعری (هاواری وەتەن)ی شێخ نوری شێخ سالح، خۆی هەر لە ناونیشان را ئاشکرا دەکات، بابەتەکەی دیش بە ناونیشانی (گفتوگۆ)یە، دیالۆگێکی درێژە لە نێوان (بارام) و (رۆستەم)، کە بە درێژی و بە وردی ڕەوشی ئەوسای کورد دەخاتە ڕوو، تەنانەت گرفتی ویلایەتی مووسڵ و پەیوەست بوونی بە کورد دەخاتە روو، پاشان قسە بەوە دەگات کە داوا دەکات بابەتەکانی خوێندن بگۆڕدرێن، تێیدا حکومەت خەم ساردییەکی زۆری نواندوە، لەو کاتەدا کە بڕیاریش درابوو، هەروەها داوای کردنەوەی خانەی مامۆستایانی دەکرد بۆ پێگەیاندنی مامۆستایانی کورد، هەر لەو کاتەدا زۆر بە بەربڵاوی داوا دەکرا، وتارەکە بە گشتی دووپات کردنەوەی بوون و ئامادەبوونی نەتەوەی کوردە، هەروەها کورد وەک گەلانی دی مافی خۆیەتی بگاتە ئامانج و خواستەکانی.

پاشان گۆڤارەکە پتر لە ٣٥ پەندی کوردیی لە لاپەڕە ٣٨ و ٣٩دا بڵاوکردوەتەوە، پاشان شیعری (وەسیەت)ی عەبدولخالق کەرکووکی و وتارێکی دیش بە ناونیشانی (نووسینەکەمان) کە بە هەمان ڕێچکەدا دەڕوات.

بۆی هەیە ئەو حەماسە گەرمە نەتەوەییە بووبێتە هۆی ئەوەی ڕێ لەوە بگرێت ئیمتیازی هیچ گۆڤار و ڕۆژنامەیەکی دی بە (مستەفا شەوقی)[٣٧] بدرێت، هەر وەکو لە پێشەکیی (پەیژە) دا دەردەکەوێت، هەوڵی بۆ داوە.

## زاری کرمانجی و ڕواندز

هەر دەبێ باسی شاری ڕواندز بکەین، کە (زاری کرمانجی)ی تێدا دەرچووە، هەروەها باسی حوسێن حوزنی موکریانییش بکەین، کە خاوەن و نووسەر و چاپکەر و، تەنانەت دابەشکاریشی بووە، بەر لەوەی باسی گۆڤارەکە بکەین.

### ڕواندز

شاری ڕواندز کەوتووەتە سێگۆشەی سنووری نێوان عێراق و تورکیا و ئێران ۱۳۰ کم لە باکووری شاری هەولێر، شارێکی سەخت و چیاییە، عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی لە بارەیەوە گوتوویەتی: **(بە یەکێک لە مەڵبەندە گرنگەکانی بازرگانی دادەندرێت) و (بارەگای سەرکردەکانی کوردە، بەسەر هەموو بینا بەرزەکانی دەوروبەری و خەرەند و دۆڵ و سەختەنە سەیرە سروشتییەکاندا زاڵە، بەسەر کەرتە شاخێکدا پەرش و بڵاوبووەتەوە، کە لە چیای بەرزی کۆڕەک دەبێتەوە تا دەگاتە لێوارێکی شاخی تەخت بەسەر ڕووباری ڕواندزەوەو، بە تیژی بەرەو دۆڵەکە دادەکشێ و، لە نێوان دوو دیواری بەرز و بە سامی شاخدا دەڕوات، سەرچاوەی ڕووبارەکەی بۆ کانییەکانی چیاکانی دەوروبەر و کانییەکانی نزیک بە شار دەگەڕێتەوە، بازاڕێکی درێژو کراوەو قیرتاو بە نێو شاردا گوزەر دەکات، دوکانەکانی بە ڕێکی بە تەنیشت یەکەوەن، جار جارێک مەیدان و وێستگەی ئۆتۆمبێل و ولاخیان دەکەوێتە نێوانەوە، لە پشت بازاڕەکەشەوە خانووی خەڵکەکەیە، خانووەکان لە یەک ئاستدا نین، بەڵکو بەسەر یەکەوەن، چونکە زەوییەکەی تەخت نییە، هەندێ باخچەی جوانی لە نێودایە و بە شینایی هەمە جۆر دەورە دراوە، قەڵایەکی مەحکەمی سوپای لێوە نزیکە، گەلێ جۆرە بینای حکومیی تێدایە، لەوانە قوتابخانەی کچان و کوڕان، خانوو بۆ فەرمانبەران و سەرایەکی حکومەت و بینایەکیش بۆ گومرگ و یەکی دی بۆ بەیتەرە و یەکیش بۆ پۆستە و گەیاندن و یانەیەکی فەرمانبەران و ژمارەی دانیشتوانیشی (۳۲۲۰) کەسە[۳۸].**

**بە هۆی شوێنی سەخت و گرنگی ڕواندز، لە ساڵی ۱۷۸۷ز دا ئۆغوز بەگ کوڕی**

**عەلی بەگ کوڕی سلێمان بەگ، کردەیە پایتەختی میرنشینەکەی میرنشینی سۆران، لەوساوە میرنشینی سۆران لە هەموو بوارەکانی سەربازی و ڕۆشنبیریدا پەرەی سەند و فراوان بوو تا گەیشتە سیدەکان و خەلیفان و دیانا، واتە تا دەوروبەری هەولێر، دەکرێ لە دروستیی ئەم بڕیارەی میر دڵنیا بین، کە ڕواندزی کردە پایتەختی میرنشینی سۆران، بەوەی بزانین سلێمان پاشای بابان یەک مانگی تەواو ئابڵوقەی ڕواندزی دا بێ ئەوەی بتوانێ داگیری بکات، چونکە (شوورە قایەکانی شار و ئەو دۆڵە هەزار بە هەزارانەی دەوری هی ئەوە نەبوون داگیر بکرێن)**[٣٩].

ڕواندز لە سەردەمی حوکمی میر محەمەدا بووە مەڵبەندێکی گرنگی سیاسەت و کارگێڕی لە سەرانسەری دەڤەرەکەدا، بەپێی یەکێ لە ژێدەرەکانی د. جەلیلی جەلیل، ڕواندز لە ساڵی ١٨٤٧دا نزیکەی (١٦٠٠) ماڵە کوردی تێدا بووە، ژمارەی دانیشتووانیشی بووەتە (٦) هەزار کەس.

بەم جۆرە لە کاتی حوکمی میر محەمەدا زۆر پێشکەوت، بە ڕادەیەک میر کارگەیەکی بۆ دروست کردنی **(شمشێر و خەنجەر و لوولە و گوللە تۆپ و جۆرەها چەکی دی)** [٤٠] **دامەزراند، زۆربەی ئەو هەشتا تۆپەی کە والیی مووسڵ هەی بوو، لە دەسکاری کرێکاران (کارگە- لێکۆڵیار)ی ڕواندز بوون، شیاوی گوتنە ئەو کانزایەی بۆ دروست کردنی تۆپەکان بەکار دەهات ، بە هۆی کرێکاری کرێگرتەوە لە دەوروبەری ڕواندزدا دەردەهێنرا)**[٤١].

ژمارەی سەربازانی میر گەیشتە (١٥) هەزار سەرباز، زۆر چاک بە شمشێر و تفەنگی کورت پڕ چەک کرابوون، هەر هەمووشیان یەک جۆر بەرگیان لەبەر بوو، پاشان چالاکییەکانی دیکەی میرنشینییەکەی لە بواری بازرگانی و ئاواکاری و کارگێڕی و داراییدا ڕێک خست، تەنانەت سکەشی بە ناوی خۆیەوە لێ دا، لە دیوێکیدا بە زمانی عەرەبی نووسرابوو (الامیر المنصور محمد بگ)، لە دیوەکەی دیشدا نووسرابوو (ضرب فی رواندز) ، کارە دیار و پرشنگدارەکەی تری دانانی ئەنجوومەنی زانا و حەکیمان بوو، کە هەندێ ڕێسای دەرکرد و بوونە یاساو دەبوو خەڵک پەیڕەوی بکەن[٤٢].

سالّی ۱۸۳٦ کاتێک میر محەمەد لەسەر دەستی هێزی داگیرکەری عوسمانیدا شکا، ئەویش بە هۆی خیانەتی سەرکردەکان و لایەنگرانی، کە بۆ دەرباز بوون لە زولّم و توند و تیژییەکەی، هەلیان قۆزتەوە، جا دوای ئەوەی ئاو و خۆراک لە شارە ئابلّووقەدراوەکەی بڕا ناچار بە دەستییەوە دا.

د. عیماد عەبدولسەلام ڕەوف دەربارەی ڕواندز دەلّێ: **(شارۆچکەکە لە سەردەمی میرانی سۆراندا چالاکییەکی بەرچاوی ڕۆشنبیریی تێدا بوو، لە زۆر لاوە قوتابیان بۆ سوود وەرگرتن لە زانایانی، ڕوویان تێ دەکرد، یاخود ئەو زانایانەی ڕوویان تێ دەکرد، بە مەبەستی وانە وتنەوە بوو لە قوتابخانەکانی، میر محەمەد پاشای ناسراو بە (میرە کوّر)** [٤٣] **(۱۲۳۹- ۱۲٥٤/ ۱۸۲۳- ۱۸۳۸ز) ڕۆلّێکی دیاری هەبوو لە هاندانی بزاڤی ڕۆشنبیری) (ڕواندز تا سەردەمێکی دواتریش هەر بە مەلّبەندێکی ڕۆشنبیری مابووەوە)** [٤٤].

جا ئەوەی ئاماژەیەکی گەورەیە و پالّپشتی ئەو ڕایە دەکات ئەوەیە، د. کەمال مەزهەر باسی دەکات، کە ژمارەی بەشدارانی ڕۆژنامەی (الزوراء) لە **(شارۆچکەیەکی لاتەریکی وەکو ڕواندز لە سالّی ۱۸۷۷دا گەییوەتە ۱۱ کەس، دواتر تەنها لە ماوەی سالّێکدا ژمارەکە گەییوەتە ۲۹ بەشداربوو)** لەگەلّ ئەوەی **(کوردی زمانی خەلّکی ڕواندزە، لە کاتێکدا زەوراء بابەتەکانی بە عەرەبی و تورکی بلاودەکردەوە)** [٤٥].

هەروەها ئەوەی بۆی هەیە پالّپشت بێت بۆ ئەو ڕایە، کردنەوەی کتێبخانەیەکی گشتی ئەهلییە لە شارەکە دا لە سالّی ۱۹٤۳ز [٤٦]، وەک بەلّگەی ئەوەی خەلّکی شارەکە ڕۆشنبیری و خوێندنەوە و بەدواداچوونیان پێ خۆشە.

بە هۆی گرنگیی شوێنی ڕواندز، لە ۱۳ی ئایاری ۱۹۱٦دا هێزەکانی ڕووسیا لە کاتی یەکەمین جەنگی جیهانیدا داگیریان کرد، چوار هێزی خۆ بەختکەری ئەرمەن و نەستوورییانی لەگەلّدا بوو، بۆ ئەوەی تۆلّەی کوشتاری عوسمانییەکان دژ بە ئەوان بکەنەوە، **(بە پێی زۆر سەرچاوە لە کاتی ئەم کوشتارەدا دەوروبەری (٥) هەزار پیاو و ئافرەت و مندالّی کورد بوونەتە قوربانی و گوایە زۆربەی هەرە زۆریان بە**

**گولله نەکوژراون، بەڵکو فڕێ دراونەتە گەلی رواندزەوە، لە نزیکەی دوو هەزار خانوویەرەی ناو شاریش تەنها ٢٠ ماڵی بە سەلامەتی دەرچوون)**(٤٧)، ئەویش هێزەکانی رووسیا بۆ بەکارهێنانی خۆیان پێویستیان پێ بووە.

لە شۆڕشی بیستدا رواندز دژ بە هێزەکانی ئینگلیز ڕاپەڕی و شاربەدەر کران، **(رەوشەکە لە باتاس و رواندز بە هۆی راپەڕینی عەشیرەتی ناسراوی سوورچی، بە شێوەیەکی دیکە تەقییەوە کە پیاوانی توانییان لە یەکی ئەیلوولدا (١٩٢٠ - لێکۆڵەر) باتاس رزگار بکەن، لەوێوەش بەرەو رواندز چوون و ئابڵووقەی هێزەکەی ناو شاریان دا دواتر ئەو هێزە زۆر بە زەحمەت توانییان بەرەو هەولێر بکشێنەوە. ئەویش پاش شەڕێک کە (١٨) کەسیان سەریان تێدا چوو)** (٤٨).

لە ١٢ی ئابی هەمان ساڵداو نزیکی ڕواندز، **(دەستەیەک چەکداری کورد دەستڕێژیان لە کاپتن (Hay) کردو چەند جارێکیش پەلاماری یەکێک لە یاریدەدەرەکانیان دا کە سەیر لە مەرگ رزکاری بوو)**(٤٩).

ئینگلیزەکان بایەخێکی زۆریان بە ڕواندز و ئەو ڕێگایە دا، کە بە هەولێر و ڕایاتەوەی دەبەستەوە، چونکە سەرباری بایەخە ستراتیژییەکەی دەیانویست **(بیکەنە یەکێ لە هۆیەکانی زیاتر بەستنەوەی بازاڕەکانی ڕۆژاوای ئێران بە جیهانی سەرمایەدارییەوە، تا ئەوەندەی بتوانن پەیوەندیی ئابووریی ئەم وڵاتە لەگەڵ شوورەوی کز بکەن)**(٥٠).

لە حوزەیرانی ١٩٢٢دا هێزێکی سەربازیی تورک (٥١) بە سەرکردایەتی ئۆزدەمیر پاشا، کە گەورە ئەفسەرێکی شارەزا بوو لە لایەنگرانی مستەفا کەمال، شاریان داگیر کرد، ئۆزدەمیر پەیوەندیی لەگەڵ سەرەک هۆزە کوردەکاندا بەست، بە تایبەتی شێخ مەحمودو پاش گەڕانەوەی کەوتە بەخشینی بەڵێنی هەنگوینی، ئینگلیزەکان زۆر پێی نیگەران بوون، ئەوانێک کە (خەباتیان) بۆ دەستەبەر کردنی سەرکەوتنی عێراق دەکرد لە (شەڕ)ی ویلایەتی مووسڵدا.

وێڕای یەکلاکردنەوەی کێشەی ویلایەتی مووسڵ، ڕواندز هەر هێور نەبووەوە، ڕاپۆرتێکی ئینگلیزی (٥٢) بە ناڕەحەتییەوە باسی هاتنی سمکۆی شۆڕشگێڕی

کوردی ئێران و سەد کەس لە پێشمەرگەکانی بۆ ڕواندز دەکات، ئەو کارەی هەندێ گیروگرفتی لەگەڵ ئێراندا نایەوە.

لەوانەیە ئەو باسەی ڕابردوو جۆری بیرکردنەوەی دەسەڵاتی حوکمڕان ڕاڤە بکات، با بڵێین بیرکردنەوەی ئینگلیز، بەوەی ڕواندز بکەنە سەربار بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی حکومەت بەسەر باکووری عێراقدا و پیادەکردنی سیاسەتە تازەکەیان پاش نەمانی کێشەی ویلایەتی مووسڵ، ئەوەبوو ساڵی ١٩٢٣ سەید تەهای نەهری کوڕی شێخ عوبێدوڵڵای سەرکردەی شۆڕشی کورد لە ١٨٨١دا، بە دەسەڵاتێکی فراوانەوە بە قایمقامی شار دامەزرا، بۆ ئەوەی سەنگی مەعنەوی و عەشایەری و عەسکەریی خۆی بەکار بەرێت بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجەکەی.

جا بۆ ئەوەی ئەم کارە بەجێ بهێنێت **(ئیدارە و خوێندن و چاپخانەکان و گۆڤارەکانی بەگەڕخستن، بە شێوەیەک وای لە ڕۆشنبیران کرد بە بایەخەوە لە ڕواندز بڕوانن، ئەوەبوو سەید حوسێن حوزنی (١٨٩٣- ١٩٤٧) بە خۆی و چاپخانەکەیەوە هاتە ئەوێ)** [٥٣].

## حوسێن حوزنی موکریانی

کاتێک هامیلتن -ی ئەندازیاری ئینگلیز سەری لە ڕواندز دا چاوی بە حوسێن حوزنی موکریانی کەوت، هەوڵەکانی ئەوی بۆ دەرکردنی گۆڤاری (زاری کرمانجی) بەدی کرد، لەو ئەرکەی کە دەیکێشا سەرسام بوو، ئەو ئەرکەی بەم جۆرە بەڵگەدار کردوە، دەڵێ: **(خۆی بە تەنها وتارەکانی گۆڤارەکەی دەنووسی، خۆی بە تەنها وێنەکانی دەکێشان، خۆی بە تەنها لە چاپی دەدان و ئینجا دەشی پێچایەوە. ئەمە بۆ خۆی نموونەیەکی بێ هاوتایە لەسەر ڕووی هەموو زەمین)** [٥٤].

د. کەمال مەزهەریش بەم جۆرە باسی ئەم گەواهی دانە دەکات: **(بەڵام هامیلتن دەبوو بشڵێ، موکریانی - ماڵی ئاوا - بە هەمان دەستوور خۆی بە تەنها دانەرو تیپکارو چاپکەری بەرهەمە مێژووییەکانی بوو. ئەوەی دیسان، تا ئێستە لە وێنەی نەبووە، دیارە زۆر زەحمەتە لە وێنەشی بێ)** [٥٥].

ئەو مێژوونووس و نووسەر و وەرگێڕ و ڕۆژنامەنووسەی هەموو ژیانی هەر لە ناخۆشی و چەرمەسەریدا بردە سەر، تا خۆی بە (حوزنی)[٥٦] ناوزەد کرد، ناوی (حوسێن کوڕی سەید عەبدوللەتیف کوڕی شێخ سمایل کوڕی شێخ عیسا کوڕی شێخ لەتیف)ە، لە ١٢ی ئەیلوولی ١٨٩٣دا لە شاری مەهابادی کوردستانی ئێران -ناوچەی موکریان - لەدایک بووە، لە ئەیلوولی ١٩٤٧یشدا لە بەغدا- هەروەک دەڵێن - ژەهران خواردوو کراوە.

لە نێوان ئەم دوو بەروارەدا ئەوەی حوسێن پێشکەشی کرد زۆر کەم کەس توانیوبەتی پێشکەش بە نەتەوەکەی بکات، حوزنی هێشتا تەمەن (١٢) ساڵان بوو، شارەکەی خۆی بەجێ هێشت، زۆر شار و وڵاتان گەڕاوە، وەک سووریا و ئەفغانستان و ئەرمینیا و رووسیا و تورکیا، لە پاڵ کوردی زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی و ئەفغانی و هیندی و رووسیی زۆر چاک فێربووە، سەرباری شارەزاییەکی چاک لە هەردوو زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی، کاتێکیش ساڵی ١٩١٥ لە شاری حەلەبدا گیرسایەوە، چاپخانەیەکی لە ئەڵمانیا کڕی، هەر لەوێ دا دایناو قاڵبی تایبەتی بۆ پیتە کوردییەکان دروست کرد و کەوتە چاپ کردنی کتێب و ڕۆژنامە [٥٧]، بەم شێوەیە بەردەوام بوو، بە دروست کردنی مۆر و زەنکۆگرافیش نانی پەیدا دەکرد، تا سەید تەهای نەهری داوای کرد، کاتێک هاتە بەغدا، سەیدی نەهری بە فرۆکە لەگەڵ خۆیدا هێنایە ڕواندز، لەوێدا هەمان چاپخانەی دامەزراندەوە و ناوی نا چاپخانەی (زاری کرمانجی)، واتە زمانی کورد **(دواتر ناوی بە (کوردستان) گۆڕا و تا ماوەیەکی درەنگ هەر کاری دەکرد، تا ئێستاش ئەو چاپخانەیە هەر لە هەولێردا ماوە).**

بە هۆی ئەو چاپخانەیە (حوزنی) دەیان کتێبی لە دانانی خۆی و کەسانی دیکەی چاپ کرد، زۆربەی دەربارەی مێژووی کورد بوون، تا وادەی کۆچی دوایی حەڤدە کتێبی هەمە جۆری داناوە، یازدەیان دەربارەی مێژووی کوردن و دوانیشیان بە گشتی دەربارەی مێژوون، بە ڕادەیەک یەکێک لە ئاگادارن لە بارەیەوە بڵێ: **(وا بزانم لە ڕاستی دوور ناکەومەوە گەر بڵێم حوسێن حوزنی موکریانی یەکەم**

**مێژوونووسی کورده، دوا بەدوای ئەمین زەکی بەگ شایانی باس و لێدوان بێ)**[٥٨].

بە بڕوای ئێمە گەورەترین کارێکی لە بواری ڕۆژنامەنووسیدا بەرجەستە دەبێت، لە ڕواندزدا (زاری کرمانجی)ی دەرکرد، لە هەولێریشدا (ڕووناکی)ی دەرکرد، لە ١٩٣٤یشدا یارمەتیی پیرەمێردی دا بۆ چاککردنەوەی چاپخانەکەی [٥٩]، بۆ ماوەیەکیش لە تەک پیرەمێردا لە نووسینی (ژیان)دا بەشدار بووە، لە دووەم جەنگی جیهانیدا ئینگلیزەکان ناچاریان [٦٠] کرد (دەنگی گێتی تازە) [٦١] دەربکات، هەروەها چالاکانە بەشداری لە (گەلاوێژ)[٦٢]دا کرد.

لە هەموو ئەم کارانەدا گیوی موکریانی (١٩٠٣- ١٩٧٧) برای حوسێن حوزنی موکریانی هاریکاریی دەکرد، وەک بەڕێوەبەری کارگێڕی لە (زاری کرمانجی)دا کاری دەکرد، هەروەها لە چاپ و بڵاوکردنەوەی (ڕووناکی)یشدا بەشدار بوو، چاپخانەکەش پاش مردنی خاوەنەکەی بۆ ئەو مایەوە، کە تا مردنی درێژەی بە کاروانەکە دا، لەتەک کتێب دا، گەلێ گۆڤاریشی لە هەولێر دەرکرد، (هەتاو)[٦٣]و، (هەولێر) [٦٤] و ، (تیشک) [٦٥] و، (بیری نوێ) [٦٦]و، ڕۆژنامەی (هەولێر)[٦٧]یش، بەڵام ناوی حوسێن و گیو پتر بە (زاری کرمانجی)یەوە بەندن تا گۆڤاری دیکەی کوردی.

## زاری کرمانجی

(زاری کرمانجی) یەکەمین گۆڤاری کوردییە، واتە یەکەمین گۆڤارێکە لە شارێکی کورددا لە عێراق دەردەچێت، یەکەمین ژمارەی لە ٢٥ی ئایاری ١٩٢٦دا دەرچووە، ژمارەکانی بەرایی (٢٠) تا (٢٤) لاپەڕە بوون، بەڵام ژمارەکانی دوایی لە کورتییان دا تا بوونە (١٦) یا (١٢) لاپەڕە و هەمووشیان بە قەبارەی ٢٨×٢٠سم بوون.

دواین ژمارەی (٢٤) و بەروارەکەی ٣١ی تەمموزی ١٩٣٢ـە، لە ژێر ناوی گۆڤارەکەشدا نووسراوە (گۆڤارێکی ئیجتیماعی، تاریخی، فەنی، ئەدەبی، مانگانەیە) گەلێ وتاری لە بواری جۆراوجۆری مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و

زانستی بلاوکردوەتەوە، تەنانەت وتاری سیاسیش، هەروەها هەواڵی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی تێدا بلاوبووەتەوە، سەرباری گۆشەی چەسپاوی وەک چیرۆک و بزەی لێو و وتەی دانایان و نەخۆشییەکانی دەروون و هی دیکەش.

هەموو نووسینەکانی بە زمانێکی پاراوی کوردین، گەلێ وشەی عەرەبییان دەکەوێتە نێوانەوە، هیچ ڕەنگدانەوەیەکی تانوپۆی پەخشانی عوسمانیی پێوە دیار نییە، بە هۆی ئەوەی خاوەنەکەی بەم پەخشانە گۆش نەکرابوو، بەڵکو تێکەڵەیەکی یەکگرتووی **(زارو شێوە زمانی وەکو کرمانجی ژووروو، موکریان (واتە کوردستانی ئێران- لێکۆڵیار) و ڕواندز و کۆیە و کەرکووک و سلێمانی و هی دیکەو، کۆششی سەرنووسەرو لاوانی تازە پێگەیشتووی نەتەوە پەروەر دەرگای لە بەردەم دەوڵەمەند بوون و یەکیەتی زمان کردۆتەوە)** (٦٨).

موکریانی لە شێوەی بەکارهێنانی زمان و نووسینی ڕێنووسی کوردی هۆشیار و ئاگادار بووە، کە هێشتا جێگیر نەبوو بوو، لە گۆڤارەکەیدا هەوڵی چارەسەر کردنی(٦٩) هەندێ گیروگرفتی ئەو ڕێنووسەی دەدا، کە هێشتا لەم فۆرمەی ئێستای نەچەسپا بوو، بەشدارییەکەی گەیشتە ئەو ئاستەی کە گەلێ زاراوە و وشەی داهێنا، زۆربەیان ئەمڕۆش (٧٠) هەر بەکار دێن.

هەرچەندە زۆربەی وتارەکانی گۆڤارەکە ناوی ئاشکرایان بە سەرەوە نییە، بەڵام ئەوەی رایەکان لە بارەیەوە کۆکن، ئەوەیە زۆربەیان لە نووسینی خودی حوزنی موکریانیی سەرنووسەرن، سەرباری نووسەر و شاعیرانی وەک: ئەسیری، مامەند کەرکووکی، عەبدولخالق قوتب، مەسعود فانی، سەعید فەهیم، کەریم سەعید، حەسەن کوردستانی، مستەفا شەوقی و هی دیکە.

لە یەکەمین ژمارەی گۆڤارەکەیدا موکریانی وتارێکی کورتی پێناساندنی بە ناونیشانی (زاری کرمانجی و شئوونی) نووسیوە(٧١): **(هەرچەندە تەماشا دەکرێت و بەچاوی دیتن دەبینرێت تێدەگا کە لەم عەسرەدا پێشکەوتن و تەرەقی ئەساسی لەسەر دوو کاردا دادەمەزرێ، یەک مەتبوعات. دووەم مەکتەب. هەر میللەتێک ئەو دوو لازم و مەلزومانەی نەبوو، مللیەتی بۆ سەبات ناکرێت و چەنێکی ئەحوالی خۆی**

**به بێگانەو دۆست بداتە زانین. ئەو هەر دووانەی سەرەوە بۆ مللەت و وەتەن فائدە بکا لەبەر ئەوە هەرچەندە ساڵێک ئەوانەم لە خەیاڵ خانەدا هێناو برد تاکو ئەو مەتبەعەیەم هێنا گۆڕێ بۆ نەشریات گەیاندمە ڕەواندز. وە سەبەبی تەسمیەی «زاری کرمانجی» ئەمەیە کە خزمەتی لوغەتی قەومی کوردان و تاریخ و ئەدەبیات و سنعەت و فەن).**

گۆڤارەکە پابەند بوو بە سیاسەتی یەکێتی خاکی نیشتمانی عێراق، بە خۆشحاڵییەوە بەدوای هەواڵەکانی مەلیک فەیسەڵی یەکەم و وەزیرانی کابینە حکومییەکانی عێراقی لە بەغدادا دەگەڕا، بە بایەخێکی سەرنج ڕاکێشەوە بڕیارەکانی بڵاودەکردەوە، هەروەها ستایشی بەریتانیا و سیاسەتەکەشی دەکرد، ئەویش لە قەناعەت و متمانەی ئەو کۆششەوە هاتبوو، کە لەپێناو پاراستنی ویلایەتی مووسڵ لە تەماحی تورکان، دەیدا.

گۆڤارەکە لە ژمارە دوویدا وەقایعی یەکێ لە کۆبوونەوەکانی پەرلەمانی عێراقی لە ڕێککەوتی ١٩٢٦/٦/١٧ دەگوازێتەوە، بەوەی مەلیک فەیسەڵیش ئامادەی دەبێت و وتارێکی تێدا پێشکەش دەکات دەربارەی پەیماننامەی سنوور لە نێوان عێراق و تورکیا، نووسیویەتی: **(ئەلحەمدولیللا لە هیمەت و مەرحەمەتی دەوڵەتی عەداڵەت پەنای بەریتانی گەورەوە لە غەم و تەفەکورات، رزگاریمان بوو، ئێمە بە تەواوی لەو بابەتەوە دەستی منەتداری بۆ دەبەستین و مەتەشەکری ئەو دەوڵەتە گەورەیەین. تەواوی خاکی کوردستان لەبەر ئەو غایە دەستی نەدەچووە کارو کەسبەوە، ئێستا لەمە بەولاوە بە رحەتی دەست بە کارو کاسبی دەکەن و لە دەسیسەی ئەو فەلاکەتە رەها بوون، ئومێدەوارین کە نەزەری مەرحەمەت دەوڵەتی بەریتانی گەورە هەروەکو بوو، لەمەش بەولاوە، بیخاتە سەرمان تاکو ئێمەش بو علم و مەعاریفمان بکۆشێن. بە ئاسوودەیی هەوڵی پێشکەوتن بدەین).**

ئەم هەوڵەی لە پێناو بەدەست هێنانی زانست و مەعاریف، گۆڤارەکە بە درێژایی هەر (٢٤) ژمارەکەی بایەخی پێدا، چەندین جار داوای دەکرد خوێندن بە زمانی کوردی بێت، هەروەها مامۆستایان دەبێ کورد بن یا ئەوانەی زۆر چاک کوردی

دەزانن، لە ژمارە (٣)یدا نووسیویەتی: **(لازمە حکومەت لە هەموو جێگایێکی کوردستاندا مەدرەسەو مەتبووعاتمان بۆ زۆر بکا، تاکو ئەو میللەتە نەجیبە نەختێک بۆنی تەمەدونی عەسری بکاو معەلمێکی بۆمان دەنێرن لە خۆمان بن تاکو بە زبانی خومانمان تێ بگەیەنن)**.

گۆڤارەکە دەگاتە ئەو ئاستەی بلێ، چاکتر وایە نەزان بین نەک بە زمانێکی غەیری کوردی فێر بکرێین، کە وای لێ بێت کورد نەخۆی و نە زمان و نە مێژووی بناسێتەوە، پاشان داوا [٧٢] لە نوێنەرانی کوردی نێو پەرلەمان دەکات، هەوڵی دابین کردنی مافە نەتەوەییەکانی کورد بدەن، هەروەها داوا لە خەڵکی دەکات هەوڵ بدەن ئاستی کۆمەڵایەتی پێش بخەن و منداڵان بنێرنە قوتابخانە و کار بۆ چاککردنی ئابووریی دەڤەرەکە و بە تایبەتی کشتوکاڵ بکەن.

موکریانی لە ڕەوشی گەل نیگەرانە کە بەرەو دوا دەڕوات نەک بەرەو پێشکەوتن، جا لە ژمارە (٥)ی بەرواری تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٢دا، وەک وەڵامێک بۆ (نامەیەکی کراوە بۆ ڕۆژنامەی ژیان) لە نووسینی بەشیر موشیری[٧٣] بەرگدرووە، نووسیویەتی، کە لە هەمان ژمارەی (زاری کرمانجی) دا بڵاوکراوەتەوە: (گەر ئەمە حاڵەتی کۆمەڵایەتی گەلێک بێت، جا چۆن دەتوانێ لەپێناو خزمەت کردنی زانست و زانین و چاپەمەنیدا هەوڵ بدات؟ ڕۆژنامەی (ژیان) چ تاوانێکی کردووە تا پەنجەی تاوانی بۆ ڕادێرن؟ باشە (زاری کرمانجی) چ تاوانێکی کردووە تا لۆمە و سەرزەنشت بکرێت سەبارەت بە دەرنەکردنی تەنیا ژمارەیەک لە ماوەی یەک ساڵدا؟ گەر تاوانێکی هەبێت، ئەوە لە بنەڕەتدا لە ئەستۆی بەرپرسان دایە و بە هۆی کەمتەرخەمیی ئەوانەوەیە.

گەر ڕەگەزی کورد بەختیار بوایە وەک نەتەوەکانی دی، ئەوە دارا و دەوڵەمەندانی ئەو پارە و پوولەی لێرە و لەوێدا خەرجی دەکەن، لە بڵاوکردنەوەی زانین و چاپەمەنیدا خەرجیان دەکرد، لە هەر شارێکی گەورە لە شارەکانی کوردستاندا، گەلێ گۆڤارو ڕۆژنامە و کتێبی هەمە جۆر دەردەچوون، ئەو کات ئەوەی بە دڵی کوردانی دڵسۆز دەبوو، بڵاودەکرایەوە)[٧٤].

گۆڤارەکە گەلێ بایەخی بە وتاری مێژوویی دەدا، زۆر درێژەی دەدانێ، وەک وتاری (شاری ڕواندز، ئەمڕۆ و سبەی و دوارۆژ) کە لە ژمارە (٢)دا بڵاوکراوەتەوە، هەروەها خەباتێکی زۆریشی کرد لە پێناو هۆشیاریی کۆمەڵایەتی، بە زنجیرە (نەزانی لەگەڵ دەروون)ی لە ژمارەکانی شەشەم و حەوتەم و هەشتەم و نۆیەمدا بڵاوکردوەتەوە، هەروەها (تێگەیشتن لە ئاکاری کۆمەڵایەتی و ژیان) لە هەردوو ژمارەی دوو و سێیدا، بە گشتی دەربارەی ئافرەت و بە تایبەتی دەربارەی ئافرەتی کوردیش دەینووسی، هەر وەک لە ڕاستیدا چۆنە و وەک ئەوەی لە نێو کۆمەڵگا دواکەوتووەکاندایە وەک کۆمەڵگای ئەو ساڵانە، ئەویش لە ژمارە هەشتدا بە ناونیشانی (پەروەردە کردن و بەرەو پێشبردنی ئافرەت زەروورەتە).

گۆڤارەکە ئەوەشی لەبیر نەچوو باسی بابەتی زانستی بکات، زۆر شتی لە بابەت (بۆچی دەبێ بوونی رادیۆم دەگمەن بێت؟) لە ژمارە ٢٣ی ڕۆژی چواری حوزەیرانی ١٩٣٠دا دەخوێنینەوە، کە وتارێکی ورد و درێژی زانستییە، بۆی هەیە وەرگێڕدرابێت.

دەکرێ ئێمەش لە لای خۆمانەوە بڵێین، گۆڤارەکە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە پەرەپێدانی هونەری دیالۆگ، زۆر لە گۆشەکانی، وەک گۆشەی نەخۆشییەکانی دەروون و گۆشەی بزەی لێو، بریتین لە گفتوگۆ و دیالۆگی نێوان کەسانی وەهمی، گۆڤارەکە وا ڕاهات بوو لەسەر لاپەڕەکانیدا پێشکەشیان بکات.

لە ژمارە سێدا گفتوگۆیەکی رەمزییە لە نێوان میوانێکی دەوڵەمەندو خانەخوێیەکی هەژار، کە داوای لێ دەکات بەڵێنەکانی بەجێ بهێنێت و ئەوەی بە دراوسێکەی داوە بەویشی بدات، هەر لە ژمارە سێدا، (گورگۆ ئاغا) و (مەلا باپیر) هێرشێکی توندو بێڕەحمانە دەکەنە سەر نوێنەری هەولێر لە پەرلەماندا، کە بۆ بەسەربردنی شەوانی خۆش دەچێتە پایتەخت نەک بۆ ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە، ئەو هیچ شتێکی ئەوتۆ نەبوو، بەڵکو لەسەر حیسابی ئازاری هەژارو چەوساوان پێگەیشتووە.

لە گۆشەی (بزەی لێو)یشدا گەلێ گفتوگۆ دەخوێنینەوە، وەک ئەو گفتوکۆیەی

نێوان مامۆستا و قوتابییەکی کە هیچ لە زمانی ناکوردیی مامۆستاکەی ناگات، بە هەمان شێوە لە بزەی لێوەکانی ژمارە یەکدا.

لە گەڵێ ژمارەی (زاری کرمانجی) دا دەقی ئەدەبی دەخوێنینەوە، گۆڤارەکە ناوی ناوە (پەخشانە شیعر) لە چەشنی نووسینەکانی (ز.ع.هەورتی) لە ژمارە پێنج داو، (حەمە کاکە) لە ژمارە (٢١)ی ڕێکەوتی ٦ی نیسانی ساڵی ١٩٣٠، کە گەلێ سیمای پەخشانە شیعری ئێستای تێدایە.

کەریم مستەفا شارەزا وای دەبینێ، بەشداری کردنی گۆڤارەکە لە پەرەپێدانی ڕۆژنامەگەریی کوردی، نەخاسمە هونەری وتار نووسین، زۆر روون و ئاشکرایە[٧٥]، هەرچی نزار جەرجیس عەلییە وای دەبینێ گۆڤاری هەڵوێستەکان بووە، داکۆکیی لە هەموو شتێک دەکرد، کە لە بەرژەوەندیی کورددا بێت، هەروەها دژ بە هەموو هێزە زاڵم و شەڕخوازەکان خەباتی کردووە، کە بندەستی و کۆیلایەتییان بە جەماوەری کورد رەوا دەدیت[٧٦].

وا دیارە هەر ئەم هەڵوێستانە بوون گۆڤارەکەیان راگرت، واشی لە حوزنی موکریانی کرد بچێت لە پەنا پەردەوە (رووناکی) لە هەولێر دەربکات.

## یادگاری لاوان

(یادگاری لاوان) دوو ژمارەی لێ دەرچووە، یەکەمین ژمارەی لە ساڵی ١٩٣٣ دا، دووەمین ژمارەشی بە ناونیشانی (دیاری لاوان) لە ساڵی ١٩٣٤ دا دەرچووە، هەر بە چەشنی پەیڕە، تەنانەت (یادگاری لاوان) لەسەر یەک تەنیا ئەم زانیارییانەی لەسەر تۆمار کراوە (LAWAN - یادگاری لاوان - نرخی ٣٠ فلسە - بەغدا - چاپخانەی کەرخ - ١٩٣٣)، واتە ناوی گۆڤارەکەو نرخەکەی و شوێن و چاپخانەی گۆڤارەکە بە زمانی کوردی و ناوی ئەو کۆمەڵەیەی[٧٧] گۆڤارەکەی دەرکردووە، هەروەها ساڵی دەرکردنی بە ژمارەی ئینگلیزی واتە بێ هیچ ئاماژەیەکی کە ئاخۆ کتێبە یا گۆڤار.

(یادگاری لاوان) هەشتا لاپەڕەیە - بێ لە بەرگ - بە قەبارەی ١٦٫٢×٢٢سم،

دەكرێ وا بناسێندرێ كە ئەدەبی كۆمەڵایەتی ڕۆشنبیری گشتییە، خودان ڕێڕەوێكی ڕوون و بەهێزی كوردانەیە، با هەردوو لاپەڕەی سێ و دوو بە ناونیشانی (دیاری) بە ئیمزای (لاوان) بخوێنینەوە، بۆ ئەوەی درک بە پشووی شۆڕشگێرانەو بۆی هەیە چەپڕەوانەی بکەین:

( بۆ ئەو لاوانەی بەیداخی پێشكەوتنیان هەڵگرتووە، بۆ ئەو هەتاوانەی ڕێی تاریكی ژیان بۆ كۆمەڵگاكانمان ڕووناک دەكەنەوە، بۆ ئەو مەچەكە پۆڵایینانەی كۆت و بەند دەشكێنن بۆ ئەو دڵسۆزانەی گوێ لە ناڵەو گریانی هەژاران دەگرن و، داماوی لیقەوماوانیان دیوەو، لەگەڵیان دا بەدەنگ دێن و یارمەتییان دەدەن، بۆ ئەو گیانانەی لێواو لێوی برایەتی و ئاشتی و خۆشەویستی و لێبوردنن، بۆ ئەو پاڵەوانانەی پێشكەوتنی وڵاتیان لە ئەستۆ گرتووە، بۆ ئەو دڵانەی بۆ خۆشەویستی لێدەدەن، بۆ ئەو زمانانەی بە وشەیەكیان شەوەزەنگەكانمان ڕووناک دەكەنەوە، بۆ ئەو دایكانەی ڕۆڵەكانیان لە پێناو خزمەت كردنی نیشتمان دا لە باوەش دەگرن، بۆ ئەو كچانەی دایكانی دواڕۆژن، بۆ ئەو گەنجانەی خاوەنی سبەین، بۆ ئەو منداڵانەی زمانیان بە كوردی دەپژێ و، گوێیان بە بیستنی دەنگی كوردی دەكرێتەوەو، چاویان بە دیمەن و وێنەكانی سروشتی جوان و ڕەنگاوڕەنگی كوردستان دەپشكوێ، بۆ ئەو دڵانەی بە خۆشەویستییەكی پاک و بێگەرد بۆ كوردو كوردستان پڕ بوەتەوە، بۆ ئەو كەسانەی متمانەیەكی تەواو و جێگیریان بە سەركەوتن و ژیانەوەو هەڵسانەوەی كورد هەیە، بۆ زین بۆ هیوا ئەم یادگارە پێشكەش دەكەین[٧٨].

هەرچی بابەتەكانی دییە، (گریان بۆ گوڵێک) دەخوێنینەوە، كە گفتوگۆیەكە لە نێوان هەژارێک و گوڵێكی وەریودا، ئینجا بابەتی (ئافرەت) كە داكۆكی كردنە لە مافی ئافرەت، پاشان(شەو) پارچە پەخشانێكە شەو دەلاوێنێتەوە، دواتر شیعری (یادگاری و هیوا)[٧٩] وتاری (ئازادیی منداڵ) دەخوێنینەوە، سەبارەت بە چۆنیەتی چاک پەروەردە كردنی منداڵ لە ڕوانگەی نووسەرەوە نەسیحەتی تێدایە، دواتر شیعری (هەوری پاییز) و ئینجا وتارێكی زانستی دەربارەی (دەردو دەرمان).

لە گۆشەی (ئەدەبیاتی كوردی) بابەتی (شاعیرانمان) دەخوێنینەوە، بیرۆكەی

گشتیی تێدایە دەربارەی شیعر، کە بۆ زەمانی خۆی شتی تازەگەریی تێدایە، پاشان شیعری (یادم کە) کە شیعری (شوکری)یە، پاشان وتارێکی زانستی دەربارەی (پاراستنی چاو) ئینجا شیعری (گەشتێک بۆ هەورامان)، پاشان قسە کردن دەربارەی دابێکی کۆمەڵایەتی، کە شەرم کردنە، نووسەر بە زیانبەخش و بێ سوودی دادەنێت.

دواتر شیعری (تۆی بەهار) دەخوێنینەوە، ئینجا وتارێکی راماناوی دەربارەی (ژیان چییە؟) دوای ئەوە (چیرۆکی راستەقینە) دەربارەی (کرداری دەروێشان) دەخوێنینەوە، دەربارەی وەقایعی تاوانێکی راستەقینە بەپێی گوتەی نووسەر کە چوار دەروێش دژ بە کەسێکی خانەخوێیان کردوویانە.

هەروەها (مام ورچ) لە لاپەڕە (٧٥)دا لە گۆشەی (چیرۆک)دا دەخوێنینەوە، ئینجا لە لاپەڕە (٧٧)دا هەندێ ڕێنمایی بۆ درێژبوونی تەمەن دەخوێنیەوە، پاشان (وتەی گەورە) دەخوێنینەوە، وتەی گەورەو ناودارانە، ژمارەی دووەمیش هەر بەم جۆرەیە.

ئەم گۆڤارە بە ئۆرگانی (کۆمەڵەی لاوان)ی کورد لە بەغدا دادەندرێت، لە دوو راستییەوە مرۆڤ دەکارێ درک بە سیاسەت و پەیڕەوەکەی بکات، یەکەمیان: کۆمەڵەکە پەیوەندییەکی بەتینی[٨٠] لەگەڵ گرووپی (الاهالی)[٨١] دا هەبووە، ئەندامانیشی بە سەرسامییەوە ڕۆژنامەی (الاهالی)یان دەخوێندەوە.

دووەمیان: زۆربەی ئەوانەی لەم کۆمەڵەیەدا کاریان کردووەو، سەرپەرشتیی گۆڤارەکەیان دەکرد،دواتر ڕۆڵێکی گەورەو کاریگەری سیاسییان گێڕاوە لە بزاڤی رزگاریخوازی کوردو دامەزراندنی حزبەکاندا.

## روناکی

لە بن ناوی (روناکی) دا پێناسەی گۆڤارەکە نووسراوە: (گۆڤارێکی هەفتانەی زانستی کۆمەڵایەتی ئەدەبی کوردییە) لە بەرگی پشتەوەی هەموو ژمارەکاندا ئەم دەستەواژانە نووسراون: (رووناکی ئاکارو بەرنامەیەکی بەرزی هەیە کە رابردوو بە

ئێستا دەبەستێتەوەو، لە پۆشاکێکی چاکدا، رووناکی بە دڵێکی پاک بۆ یەکێتی عێراق خەبات دەکات، رووناکی ئەدەبیات و زانستی کوردان کۆ دەکاتەوە، رووناکی مەعاریف بۆ کورد دروست دەکات، رووناکی ئاکارو کەسێتی کورد تازە دەکاتەوە، رووناکی ناوی ناودارانی کورد دەپارێزێ، رووناکی لە ژمارەکانیدا دیوانەکانی ئێستا و کۆن و قامووس و شێوەزارەکان کوردو زانست و کۆمەڵایەتییەکان بڵاو دەکاتەوە). لەو پێناوەدا لە ناوەوەی بەرگی دواوەی ژمارەکانی (٦ تا ١١) تکا دەکات، کە ئەو نووسەرانەی بە وتارە بەرزەکانیان گۆڤارەکە دەوڵەمەند دەکەن، بابەتەکان تەنیا زانستی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی بن.

خاوەنی (روناکی)و بەڕێوەبەری بەرپرسی (شیت مستەفا)ی پارێزەرە، نووسەرانیشی حوسێن حوزنی موکریانی دوو لەسەر سێی بابەتەکانی ژمارە بەراییەکانی دەنووسی و محەمەد عەلی کوردی و شیت مستەفا و مەحمود فەهمی و محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی و کانی و گیوی موکریانی و سەعید ناکام و ئیسماعیل حەقی شاوەیس و یونس مستەفا و دڵدارو کەسانی دی بوون، بە تایبەتی لە لاوانی خوێنگەرمی ڕۆشنبیری و نەتەوایەتی.

ژمارە یەک و دووی گۆڤارەکە لە چاپخانەی مووسڵی نوێ لە مووسڵدا چاپ کراون، هەرچی ژمارە سێ و چوار و پێنج و شەشە ئەوە لە رواندز چاپ کراون، کەچی ژمارەکانی دی، تا ژمارە یازدە کە دوایین ژمارەیەتی لە هەولێردا چاپ کراون، پاش ئەوەی حوسێن حوزنی چاپخانەکەی گواستەوە بۆ نێو شاری هەولێر، ئنجا گیو موکریانیی برای چاپخانەیەکی دیکەی لە مووسڵ کڕی و لە هەمان شاردا دایبەست.

بەرگەکانی (روناکی) وێنەیەکی قەڵەمکێشی چیای تێدایە، لە نێو لوتکەکانیدا خۆر دیارەو بە هەموو لایەکاندا تیشک پەخش دەکات، لەسەر قەڵەمکێشییەکە ناوی (روناکی) بە خەتی فارسی نووسراوە، گۆڤارەکە (١٦) لاپەڕەی قەبارە ٢٨×٢٠سم بوو، ژمارە یەکی لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٥ دا دەرچووە، دوایین ژمارەشی ژمارە یازدە لە ١٦ی ئایاری ١٩٣٦ دا

دەرچووە، هەندێ لە ژمارەکانی هەفتانە دەرچوون کەچی هەندێ لە ژمارەکانیشی دوو هەفتە یا سێ هەفتە جارێک دەرچوون ماوەیەکی زۆریش کەوتوەتە نێوان هەردوو ژمارەی شەش و حەوت دا، کە لەو کاتەدا چاپخانەکە لە رواندزەوە گوێزراوەتەوە بۆ هەولێر.

لە پاڵ هەردوو گۆشەی چەسپاوی ئەدەب و شیعردا، گۆڤارەکە بابەتی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و زمانەوانی و زانستی بڵاوکردوەتەوە، هەروەها بابەتی هەمەڕەنگی وەک نووسین دەربارەی چاپخانەو فڕۆکە و کەشتییەکان، بایەخێکی باشیشی بە ژیاننامەو دیوانی شاعیرانیش داوە لە نموونەی خانی و مەولەوی و عەلی بەردەشانی و جەمیل سدقی زەهاوی. گۆشەیەکی تایبەتیشی بۆ نمایش کردنی کتێبە تازە چاپکراوەکان تەرخان کردوە، لاپەڕەیەکی لە هەندێ لە ژمارەکانی دا وەک هەردوو ژمارەی نۆو دەی بۆ نووسینی قوتابیان تەرخان کردوە، بۆ ئەوەی هانی لاوان بدات بە زمانی کوردی بنووسن، هەرچی ئاگادارییەکانیەتی بە زمانی عەرەبی و تورکی و کوردی بڵاوی کردونەتەوە.

دەکرێ پێداگیری گۆڤارەکە بەدی بکرێ لەوەی بابەتی وەرگێڕدراوی لە زمانانی دیکە بڵاوکردوەتەوە، هەروەها بە زنجیرە کەوتە بڵاوکردنەوەی رۆمانێکی کوردی، ئەویش رۆمانی (نازدار)ی محەمەد عەلی کوردی بوو لە ژمارەکانی حەوت و نۆو یازدەدا، کە دەربارەی ژیانی ئافرەتی کورد لە لادێ دا دەدوێت.

هەروەها شیعری نەناسراوی تازە دۆزراوەی شاعیرانی ناوداری بڵاوکردوەتەوە، بڵاوکردنەوەی هەندێ لە شیعرەکانی مەولەوی و ئاماژە کردن بەوەی دیوانەکەی ئامادەیە بۆ چاپ کردن لە ژمارە حەوت دا، پیرەمێردی وورووژاندو تووڕەی کرد، بۆیە لە ژمارە (٤٧٦)ی رۆژنامەی (ژیان) لە بەرواری ٢٥ی نیسانی ١٩٣٦ دا نامەیەکی کراوەی بڵاوکردەوە (بۆ جەنابی حوسێن حوزنی ئەفەندیی موکریانیی بەڕێز) تێیدا ئاماژە بەوە دەکات کە سێ ساڵە بە کۆکردنەوەی دیوانی مەولەوییەوە خەریکە، هەروەها کە حوسێن حوزنی مێژوونووسە و بۆی نییە بچێت بە لای شیعردا.

حوسێن حوزنیش لە ژمارە (١١)ی (روناکی)دا وەڵامی دەداتەوە، بە ئەدەبێکی زۆرو شێوازێکی بەرزی دیالۆگەوە لەگەڵ پیرەمێردا هاتوەتە دەنگ، لێرەدا چەند بڕگەیەکی دەخەینە روو، بۆ ئەوەی لە شێوازی بیرکردنەوەی خاوەنەکەی بگەین، هەروەها بۆ ئەوەی هەندێ لە کاری ڕۆژنامەوانی بگەین، کە لەو ڕۆژگارەدا بە گشتی لە کاری ڕۆشنبیری و نەتەوایەتی جودا نەدەبووەوە:

**(مامۆستای بەڕێزم، ئەدیبی عاقڵ، فەیلەسووفی گەورە، پیری کامڵ، سەرۆکی (کۆمەڵەی زانستی) و رابەری لاوان، خاوەنی نمەک و خوان ئاوەدان،بە سامی بە هەیبەت، خاوەنی شکۆ، تاقانەکەی سلێمانی، بەرزی زەمان، بەهێزی بە تین، بەڕێوەبەری (ژیان) جەنابی حاجی تۆفیق بەگ[٨٢] بەم دوو وشەیە ویستم دڵی بریندارم عەرزی ئێوە بکەم: ئێمە تاکو ئێستا، باوەکو ئەمە کوفریش بێت بە نیعمەت خودا، نەبووینەتە خاوەن چاپخانەو ڕۆژنامەی چەشنی ڕۆژنامەو پیسترین چاپخانەی گەلانی دەربەدەر، لە تواناشمان دا نییە ئەمە بێنینە دی، پاشان ئێمە تاکو ئێستا خاوەن یەک لاپەڕەی بە سوود نین بە هۆی نیفاق و حەسوودی و مل بە ملانێی یەکتر، چاپخانەکەی ئێوە هێشتا هەر ئەو چاپخانەیە کە مەیجەر سۆن لە سلێمانی دایمەزراند،هەرچی چاپخانەکەی منە، ئەوە لەو خراپترە کە بە سەرە قەڵەمی بڕیەند ڕێکم خستوە، بێ ئەوەی هیچ شتێکم بۆ زیاد کرد بێت و هەر بە رووتی و رەجاڵی و بێ پیت ماوەتەوە! ئێمە، بە هۆی ئەوەی یەکتر ئەزێت دەدەین،پاڵ و بە یەکدییەوە دەنێین، بۆ دانانی چاپەمەنی خۆمان تەرخان نەکردووە ئەوەتا ئیرەیی بە یەکدی دەبەین).**

سەرباری ئەوەی گۆڤارەکە بایەخی بە وتاری مێژوویی دەدا، بە تایبەتی دەربارەی مێژووی کورد، بە شێوەیەکی زانستی و قوول تا دەگاتە چاخە دێرین و کۆنەکان، زۆر بە گەرمییش پشتگیری لە نیشتەجێ کردنی هۆزە رەوەندەکان دەکرد، هەر وەک لە ژمارە (نۆ)دا، لایەنە چاکەکانی ئەم شتەی بۆ کەسانی ئەم هۆزانە و نیشتمانیش روون کردوەتەوە، بێ لەوە بایەخی بە منداڵیش دەدا، پارچە شیعری بۆ بڵاودەکردنەوە، هەروەک لە ژمارە (٣)دا، دایک و باوکانیشی لەوە ئاگادار

کردوەتەوە کە بە ترس رایان نەهێنین، هەروەها باسی کچۆلانی کردووەو سەبارەت بە پەروەردە کردن و پێگەیاندنیان لەسەر بنەمای دروست و رەوشتی چاک،نووسیویەتی هەروەها لە وەعزەکانیدا ئەوەی لە بیر نەچووە باسی جلوبەرگ ونەریتەکان و شێوازی قسە کردن و نان خواردن بکات وەک لە ژمارە (حەوت)دا دەردەکەوێت.

بە مەبەستی ئەوەی ئامانجە جەماوەرییەکانی بپێکێ (روناکی) بایەخی بە ژیانی خەڵکی دا لە شاری هەولێردا، لە ژمارە (٢) و ژمارە (٨)دا بە پێداگیرییەوە دەربارەی گرفتی ئاوی خواردنەوەی نووسیوە لە هەولێردا.

خەڵکیشی هان داوە بۆ چوونە قوتابخانەو بەدەست هێنانی زانست و زانین، هەروەها داوای ئەوەی کرد، چالاکییەکانی لیژنەی نەهێشتنی نەخوێندەواری کە شارەکانی عێراقی تەنیوەتەوە، شاری هەولێریش بگرێتەوە، هەروەک گۆڤارەکە لە ژمارە (٢)دا دەیڵێ.

وا دیارە ئەوانەی بەرپرس بوون لە گۆڤارەکە، لە بواری دابەش کردنی گۆڤارەکەیاندا چالاک بوون، ژمارەی هەیە گەیشتوەتە دەستی گشت ڕۆژهەڵاتناس و ئەوانەی بایەخ بە کاروباری کورد دەدەن[٨٣].

د. کوردستان موکریانی دەربارەی هۆی وەستانی (روناکی) باس دەکات: **(هۆی وەستانی ئەم گۆڤارە، هەر وەک لە مامۆستا گیوو زۆر لە هاوزەمانانی ئەو ماوەیەم بیستووە، ئەوە بوو کە داوای پەیدا کردنی ئاوی کردوە بۆ هەولێر،بەڵام لەم ڕۆژانەدا گوێم لە مامۆستا مستەفا نەریمان بوو (ئەرشیفکارێکی بە تواناو ناسراوی کتێب و گۆڤارە کوردییەکانە-لێکۆڵیار)، کە هۆیەکە ئەوە بوو، مامۆستا شیت مستەفا، بەرێوەبەری بەرپرسی، لەو ڕۆژگارەدا بە دادوەر دادەمەزرێت و لە هەولێر دوور دەکەوێتەوە. منیش لەو باوەڕەدام هەتا ئەگەر ئەوە بێت هۆیەکە، بە دادوەر کردنی** مامۆستا شیت لە پێناو داخستنی گۆڤارەکە بووە، چونکە مامۆستا حوسێن حوزنی،هەر لە سەرەتاوەو بەر لەوەی ئەم گۆڤارە لەدایک بێت،هەوڵی دا مۆڵەتی دەرکردنی گۆڤارێکی پێ بدرێت لە بری (زاری کرماجی) کاتێک هەوڵەکانی نوشوستیان هێنا، مامۆستا شیتی بەوە قایل کرد، مۆڵەت و بەرپرسایەتییەکە بە

ناوی خۆیەوە وەربگرێت، حوزنییش گشت ئەرکەکانی دەرکردنەکەی بگرێتە ئەستۆ، بەم جۆرە ئاواتەکەی هاتە دی، کە زۆری نەخایاند و ئەویش دوور خرایەوەو بە دەستبەسەری بردیانە بەغدا، هەر لەوێشدا ماڵئاوایی لە دنیای رووناک کرد[٨٤].

## زانستی

یەک ژمارەی گۆڤاری (زانستی) لە شاری سلێمانی دا دەرچووە، گۆڤارێکی ئەدەبی مێژوویی بوو، ساڵح قەفتان سەرنووسەری بوو، ئەم ژمارە تاقانەیە سەرەتای ساڵی ١٩٣٨ دەرچووە، جەباری جەباری لە کتێبە ئەرشیفییەکەی دەربارەی مێژووی رۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا، مێژووی دەرچوونی بە (١٥)ی شوباتی ١٩٣٨ دیاری کردووەو کە نیوە مانگانەیە.

هەرچەندە گشت ژێدەرە کوردییەکان و گشت ئەوانەی دیدەنیمان کردوون، دەرچوونی گۆڤارەکە دەسەلمێنن،بەڵام ئێمە نەمان دۆزییەوە، کەسێکیشمان نەدی گۆڤارەکەی دیت بێت، د. کەمال مەزهەر لەو باوەڕەدایە، بابەتەکانی بۆ چاپ ئامادە کراون، بەڵام چاپ نەکراوە، لە کاتێکدا رەفیق ساڵح پێی وایە گۆڤارەکە نوێنەرایەتی کۆمەڵەی رۆشنبیریی (زانستی)ی دەکرد کە قوتابخانەیەکی ئێوارانیشی بۆ فێرکردنی گەورەکان کردوەتەوە.

## پەراوێزی بەشی سێیەم

١- عەبدولڕەزاق بیمار، ژێدەری پێشوو، ل ١٦٣-١٦٤.
٢- د.کەمال مەزهەر، هەڵوێستی مەلیک فەیسەڵی یەکەم بەرامبەر بە دۆزی کورد لە عێراقدا، (لێکۆڵینەوەیەکی بڵاونەکراوەیە، لە دەزگای عەبدولحەمید شۆمان لە عەممان لە بری ئەو پێشکەش کرا-ئوردن ساڵی ١٩٩٨).
٣- زۆربەی کوردی مووسڵ و هەولێر دەنگیان بۆ هەڵبژاردنی دا (واتە هەڵبژاردنی فەیسەڵ-لێکۆڵیار) بە مەرجی ئیدارەی لامەرکەزی، کوردی کەرکووکیش دژ بە ئەو دەنگیان دا، هەرچی کوردی سلێمانییە هەر بەشداریی دەنگدانەکەیان نەکرد) - بڕوانە، د.فاضل حسین، ژێدەری پێشوو، ل١٥.
٤- ناوی تەواوی محەمەد ئەدیب عەبدولعەزیزە، وا پێ دەچێ لە چاپخانەکەدا پیت ڕێکخەر بووە، هەروەها لە قوتابخانەی ئامادەیی عوسمانیدا فێرە خوێندن بووە، خاوەنی بەهرەی شیعری و ڕۆشنبیرییش بووە.
٥- جەمیل سایب، لە خانەوادەیەکی ناسراوی ڕۆشنبیرە، لە دایک بووی سلێمانی ١٨٨٧/٨/١٦ فەرمانبەرێک بوو لە دارایی. پاشان بووە بەڕێوەبەری گەنجینە تا خانەنشین بوونی لە ساڵی ١٩٤٩ دا، لە بیستەکانەوە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە ئەدەب و ڕۆژنامەگەریی کوردیدا، بە پێشەنگی چیرۆکی نوێی کوردی دادەندرێ، ئەویش بە خاتری چیرۆکی (لە خەوما)ی کە بە زنجیرە لە (ژیانەوە)دا بڵاوی کردوەتەوە، دەسپێکی لە ژمارە (٢٨)ەوەیە لە ١٩٢٥/٦/٢٦ تا وەستانی (ژیانەوە) هەژدە ئەڵقەی لێ بڵاوکردەوە، پاشان پێنج ئەڵقەی دیکەشی بەدوادا هات لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا، هەرچەندە وشەی (ماوێتی) لە ئەڵقەی نیو ژمارە (٢٦)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٧/٢٩ی (ژیان)دا نووسراوە، وەلێ هیچ پاشماوەیەکی دوای ئەوە لێ بڵاونەکراوەتەوە، لە رووی هزرییەوە لە نەیارانی شێخ مەحمود بوو، ئەو دوو ساڵەی شێخ مەحمود تێیدا حوکمی سلێمانیی کرد، پاش ١٩٢٢، ئەو لە کەرکووک بەسەری برد، پاش جێگیر بوونی دەسەڵاتی ئینگلیزو پاشایەتی بەسەر شاردا لە ساڵی ١٩٢٤، ئەویش گەڕایەوە سلێمانی و بووە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ژیانەوە)، ساڵی ١٩٥١یش کۆچی دوایی کردووە.
٦- دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز، هەر بە چەشنی (ژیانەوە) سەرپەرشتیی (نجمە)شی دەکرد.
٧- لێرەدا ئاماژە کردنە بە پەندێکی کوردی بەوەی بێ هودەیە پیاو دوای کڵاوی با بردوو بکەوێت.
٨- ڕۆژنامەی (ژیانەوە) ژمارە یەک، ١٨ی ئابی ١٩٢٤، ل١.
٩- وەرگێڕانی ڕاستەقینەی، بە زمان و واتا (فی حلمی- لە خەوما)یە، چیرۆکەکە بریتییە لە گێڕانەوەی خەونێک.
١٠- حوسێن عارف، چیرۆکی هونەریی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٠، بەغدا، ١٩٧٧، ل ١٨-١٩.
١١- وا پێدەچێ سێ پیت بێت نەک دوو پیت.
١٢- لە ساڵی ١٩٣٩ (ژیان) دووبارە کەوتەوە دەرچوون، بەڵام بە ناوی (ژین)، هەردووکیان یەک واتایان هەیە، درێژەی بە هەمان ڕیزبەندی ژمارە دا، کە بە داهاتنی ساڵی ١٩٥٠ ژمارەکانی گەیشتە هەزار.
١٣- پیرەمێرد،واتە پیاوی پیر، تۆفیق بەگ کوڕی مەحمود ئاغا کوڕی هەمزاغا، لە دایکبووی سلێمانی ساڵی ١٨٦٧، زانستەکانی زمان و ئایینی لە قوتابخانە کۆنەکانی وڵاتی خۆی و لە بانەی کوردستانی ئێراندا خوێندووە، زۆر چاک فێرە زمانی کوردی و تورکی و فارسی بووە، ساڵی ١٨٨٢ بووە کاتبی نفووس لە سلێمانیدا، لە ١٨٨٦یشدا بووە کاتب ئەووەلی دادگای شارباژێر، لە

۱۸۹٥یشدا بووە جێگری داواکاری گشتی لە کەربەلادا، ساڵی ۱۹۸۹ یش بەرەو تورکیا چووە بە هاوڕێتی شێخ سەعیدی حەفید (باوکی شێخ مەحمود)، پاشان لە ساڵی دواتر لەگەڵ ئەودا حەجی مەککەی کردوە، لە ۱۸۹۹ دا بە ئەندامی ئەنجوومەنی باڵای مەعاریف لە ئەستەمبوڵ دامەزراوەو نازناوی (بەگ)ی پێدراوە. لە هەمان کاتدا کەوتە خوێندنی ماف و ئیجازەی تێدا وەرگرت. پاش ڕاگەیاندنی دەستوور لە ساڵی ۱۹۰۸ دا کەوتە کاری پارێزەرایەتی و ڕۆژنامەگەری و، لە کۆمەڵە نیشتمانییە کوردییەکانی ئەستەمبوڵدا بەشدار بوو، ڕۆژنامەی (ڕسملی کتاب) بە تورکی و (کورد)ی بە کوردی دەرکردو لە زۆری دیکەشدا بەشداری کردووە. بە قایمقام و دواتر بە متەسەڕیف لە ساڵی ۱۹۱۸ دا دامەزراوە، لە ۳۰ی کانوونی دووەمی ۱۹۲٥ دا گەڕاوەتەوە سلێمانی، لە ژمارە یەکەوە کاری لە (ژیان)دا کردووەو لە ۱۹۳۲دا بووەتە سەرنووسەری و لە ۱۹۳٤یشدا بووەتە خاوەنی ڕۆژنامەکە، کاتێک هەوڵی ئەوە درا چاپخانەکەی لێ بستێنن و (ژیان) دابخەن، خانووەکەی رەهن کردو چاپخانەیەکی تایبەت بە خۆی هێنا بۆ سلێمانی، ئنجا درێژەی بە دەرکردنی ڕۆژنامەکەی دا بە ناوی (ژیان) و زنجیرەکەی نەپچڕاند، واتە یەکەمین ژمارەی (ژیان) کە لە ۱۹۳۹/۱/۲٦ دا دەرچووە، دەستەواژەی ساڵی چواردەهەم و ژمارە (٥٥٤)ی لەسەرە، دوایین ژمارەی (ژین) لە کاتی مردنی پیرەمێردا لە ۱۹/٦/۱۹٥۰ ژمارە (۱۰۱٥)ی لەسەرە. لەتەک ڕۆژنامەگەریدا، بەشداری کردنی لە ئەدەبی کوردی بەهایەکی لە بن نەهاتووی هەیە، سەرباری دەرکردنی گەلێ کتێب لەوانە حەکایەت و ڕۆمانی مێژوویی و فۆلکۆری و (٤۸۰۰)پەندی کوردیشی کردوەتە هۆنراوە، هەروەها بە یەکەم کەس دادەندرێت، کە دابی ئاگرکردنەوەی سەر لوتکەی شاخەکانی زیندوو کردوەتەوە بە بۆنەی جەژنی نەورۆز، شیعرەکەشی دەربارەی نەورۆز بووە سروودێکی نەتەوەیی و گۆرانییەکی حەماسیی وا، کە تاکو ئێستا هەموو کورد لە نێو ئاهەنگەکاندا دەیڵێنەوە.

۱٤- جەمیل سایب، لە خەوما، (ئامادەکردن و پێشەکی جەمال بابان)، بەغدا، ۱۹۷٥.

۱٥- مەحمود زامدار، دەوری ڕۆژنامەگەریی کوردی لە ژیانی ڕۆشنبیری و کومەڵایەتیی گەلی کورد، ڕۆشنبیری نوێ (گۆڤار)، ژمارە (۱۱۳)، ئادار، ۱۹۸۷، ل ۲۳۱.

۱٦- محەمەد ئەمین زەکی بەگی وەزیری هەمیشەیی کورد، لە کابینەکەی حیکمەت سلێماندا کە پاش کودەتاکەی بەکر سدقی هات، بە وەزیر دەست نیشان نەکرا، بەڵکو هیچ وەزیرێکی کورد، بەدەر لەوەی کە باو بوو، یا دژ بەو بنەما نیشتمانیانەی کە مەلیک فەیسەڵی یەکەم لە کاتی دامەزراندنی مەملەکەتی عێراق دایانابوون، بۆ ئەو کابینەیە دەست نیشان نەکرا ،بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە کابینەکەی حیکمەت سلێمان، بڕوانە. عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقيه، الجزء الرابع، ط ۷، دار الشؤون الثقافيه العامه، بغداد، ۱۹۸۸، ص ۳۳۰-۳۳۱.

۱۷- مەبەست کتێبەکەی (خولاسەیەکی تاریخی کوردو کوردستان)ە، کە لاپەڕەکانی هەردوو بەشەکەی بە زمانی کوردی ۸۲۹ لاپەڕەیە، دووجار لە ۱۹۳۱ و ۱۹۳۷ لە بەغدا چاپ کراوە.

۱۸- جەبار جەباری، ژێدەری پێشوو، ل ۲۷.

۱۹- جەمال خەزنەدار، لاپەڕەیەکی بێگەرد لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا، ڕۆژی کوردستان (گۆڤار) بەغدا، ژمارە (٥٦)،تشرینی دووەمی ۱۹۷۹، ل۳۷.

۲۰- عەبدولڕەزاق بیمار، ژێدەری پێشوو، ل ۱۷٦.

۲۱- ڕۆژنامەکە گەلێ گۆڕانی تەنانەت لە ناوەکەشی بەسەردا هات، ئەو درێژەپێدانی (نجمه)یە، ساڵی ۱۹٥۸ ناوی بووە (گاورباغی) پاشان گەڕایەوە سەر ناوی (کرکوک)، بڕوانە/ جەبار جەباری، ڕۆژنامەی کەرکووک بە تەمەنترین ڕۆژنامەیە لە کوردستاندا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٤٣-٤٤)- ۱۹۷٥/۹/۲۱، ل ۲٤.

۲۲- یەکەمین چاپخانە لە کەرکووک ساڵی ۱۲۹٦ی ڕۆمی لە سەردەمی والی (فەیزی پاشا) دامەزراوە،

پاشان به فەرمانی والی (تەحسین پاشا) بۆ مووسڵ گواستراوەتەوە، پاش ئەوەی مەڵبەندی ویلایەت لە کەرکووکەوە بۆ مووسڵ گواسترایەوە،ساڵی ۱۹۱۱ ئەحمەد مەدەنی چاپخانەیەکی لە بەلجیکا کڕی و هێنایە کەرکووک و ناوینا (حەوادس-حوادث)، لە ۱۹۱۸دا ئینگلیزەکان دەستیان بەسەردا گرت و ڕۆژنامەی (نجمه)یان تێدا چاپ کرد، ساڵی ۱۹۲۶یش شارەوانی چاپخانەیەکی تایبەت بەخۆی تێدا دروست کرد.

٢٣- خەڵکی سلێمانی پەیڤی (زمان) بە واتای زمانی قسەکردن و ئاخاوتن بەکار دەهێنن، بەڵام (زبان)یش هەر وشەیەکی ڕەسەنی کوردییە.

٢٤- جەمال خەزنەدار، لاپەڕەیەکی بێگەرد لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی، ل٤٠.

٢٥- ساڵح قەفتان (١٨٨٤-١٩٦٨)، لە سلێمانی هاتوەتە دنیا، لە قوتابخانەی عەسکەریی ڕوشدی دا خوێندوویەتی، چووە ئەستەمبوڵ و لە نێو لەشکری عوسمانیدا بە پلەی مولازم کاری کردووە، پاش جەنگ گەڕایەوە سلێمانی و لە کاری سیاسەت و ڕۆژنامەوانیدا بەشداری کرد، هەروەها ماوەیەکی زۆر وەک مامۆستای سەرەتایی لە قوتابخانەکان دا خزمەتی کردووە.

لە بەرهەمەکانی:

- بەراوردێکی تەئریخی، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٣٦.
- پەندی تەئریخی، چاپخانەی ئەلنەجاح، بەغدا، ١٩٣٧.
- نەتەوەی کورد تورکمان نین، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی،١٩٥٩.
- مێژووی نەتەوەیی کورد، چاپخانەی سەلمان ئەلئەعزەمی، بەغدا،١٩٦٩.
- لە وڵاتی گوڵە زەنبەقی سپی دا، چاپخانەی سەلمان ئەلئەعزەمی، بەغدا، ١٩٧٠.

٢٦- د. کەمال مەزهەر،مێژوو، ل ١٥١.

٢٧- هەمان ژێدەر، ١٧٦.

٢٨- نەگەیشتینە ڕاستیی دانەکانی هەر یەک لەو ڕۆژنامانەی باسمان کردن، تەنیا (ئومێدی ئیستیقلال)نەبێ، کە لە هەر ژمارەیەکی هەزار دانەی لێ چاپ دەکرا.

٢٩- ساڵی ١٩٣٠ مینۆرسکی سەردانی سلێمانیی کردووە، ئەویش بە بۆنەی سەردانی کردنی ئێران و ئامادەبوونی لە میهرەجانی یادی نۆ سەد ساڵەی کۆچی دوایی ئەبولقاسم فیردەوسیی شاعیر، سەردانی چاپخانەی شارەوانیی کرد کە (ژیان)ی چاپ دەکرد، دیدەنیی ڕۆشنبیرانی شاری کردو هەندێ کاتی لەگەڵ پیرەمێردا بەسەر برد، هەروەها لەگەڵ حوسێن حوزنی موکریانییش بەوەی سەردانی کردوە، لە بەغداش سەری لە چاپخانەی مەریوانی داو هەندێ کاتی لەگەڵ تۆفیق وەهبی بەسەر برد.

٣٠- سسیل جۆن ئەدمۆندز، لە پێشەوەی پسپۆڕانی کاروباری کوردە، لە ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٩ لە ئۆساکای ژاپۆن دا لەدایک بووە چونکە باوکی وەک قەشەیەک لەوێ دا کاری دەکرد، لە زانکۆی کامبردج دا خوێندوویەتی و فێرە زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی بووە، لە ١٩١٠وە لە بواری کونسوڵگەری دا لە ئەستەمبوڵ و بووشەهردا کاری کردووە، لە ماوەی یەکەمین جەنگی جیهانیدا وەک یاریدەری ئەفسەری سیاسی دامەزرا لە هەڵمەتە سەربازییەکەی سەر عێراق (١٩١٥)، کە هەر بەم سیفەتە لە عێراق و ئێران و کوردستان دا کاری کردوە، پاش دامەزراندنی حکومەتی عێراق، وەک سەرپەرشتیاری ئیداری لە کەرکوک و سلێمانی دامەزرا (١٩٢٢)، پاشان بووە یاریدەری ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ (١٩٢٥)، ئنجا ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ (١٩٣٥-١٩٥٤). پاشان گەڕایەوە لەندەن و وەک ڕاوێژکار لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا کاری کرد، پاشان بۆ پلەی وەزیری ڕاسپێردراو لە دامەزراوە نێو نەتەوییەکانی پەنابەران دامەزرا، تا واز هێنانی لە خزمەت لە ساڵی ١٩٥٠ دا، بۆ ئەوەی دەستبەتاڵ بێت بۆ وتنەوەی وانەکانی زمانی کوردی لە ئامۆژگای دیراساتی

ڕۆژهەلات و ئەفریقای سەر بە زانکۆی لەندەن لە ١٩٥١ەوە تا ١٩٥٧. لە کاتی خزمەتەکەی دا لە عێراق، ئەرکێکی تایبەتی پێ سپێردرا لە کوردستان لەو کاتەی شۆڕشی شێخ مەحمودی تێدا لە بەین برا لە ساڵی ١٩٢٢، کاتێکیش شاندی کۆمەڵەی گەلان بۆ دیاری کردنی چارەنووسی ویلایەتی مووسڵ لە ساڵی ١٩٢٥ دا هات، سیفەتی ئەفسەری پەیوەستی پێ درا، پاشان لە لیژنەی دیاری کردنی سنووری نێوان عێراق - تورکیا کاری کرد (١٩٢٥) و سنووری نێوان عێراق - سوریا (١٩٣٢)، هەروەها راوێژکاری وەفدی عێراقی بوو لە کۆمەڵەی گەلان دا لە کۆبوونەوەی ساڵانەی ١٩٣٢ تا ١٩٣٨. دۆستێکی نزیکی تۆفیق وەهبی بوو، بە هاوبەشی فەرهەنگێکی کوردی - ئینگلیزی -یان دانا (١٩٦٦)، گەلێ کتێبی گرنگی داناوە، لە هەموویان ناودارتر کتێبی (کوردو تورک و عەرەب) کە (سیاسەت وگەشت ولێکۆڵینەوەی دەربارەی باکووری ڕۆژهەلاتی عێراق ١٩١٩-١٩٢٥)تێدایە، ئینگلیزییەکەی لە ١٩٥٧ دا چاپ کراوە،ساڵی ١٩٧١ جەرجیس فەتحوڵڵا وەریگێڕاوەتە سەر عەرەبی، لە بەغدا لە چاپخانەی تایمس و لە لایەن کۆمپانیای خانەی عرووبەی جیهانی بۆ بڵاوکردنەوەو دابەش کردن بە ٣٩٢ لاپەڕە چاپ کراوە.

٣١- جەبار جەباری، ژێدەری پێشوو، ل ٣٩.

٣٢- د.کەمال مەزهەر،تێگەیشتنی ڕاستی، ل ٢٣٣.

٣٣- جەبار جەباری، ژێدەری پێشوو، ل ٣٦.

٣٤- وەرگێڕانێکی پڕ بە پێست بۆ ئەم پەیڤە نییە ،واتای خەبات لە پێناوی کورددا دەگەیەنێ، دەکرێ لە عەرەبی دا بەرامبەر بە (العروبە)ی دابنێین، مەسعود محەمەد بەم جۆرە کوردایەتی دەناسێنێ: (خەباتێکی زیرەک و دڵسۆزانەو زانستییە لە پێناو گەیاندنی کورد بە مافە ڕەواکانی لە ئازادی و سەربەخۆیی و بە ختەوەریی مومکین). (بڕوانە: مەسعود محەمەد. پەرژینی بێدەنگی، لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی فەرهەنگیی سوید - کوردستان، سوید، ١٩٩٦، ل ٥٥-٥٦).

٣٥- بابەتەکانی گۆڤارەکە ناوی هیچ نووسەرو شاعیرێکی لەسەر نییە، بەڵام ئەو پێرستەی لە ناوەوەی بەرگی دواوەدا نووسراوە، بەرامبەر بە هەر بابەتێک ناوی خاوەنەکەی داناوە.

٣٦- د.کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی، ل ٢٣٤.

٣٧- مستەفا شەوقی، تا ئێستا ئەم کەسایەتییە نەناسراوە، بەڵام پتر پێ دەچێ (مستەفا شەوقی ڕەمەزان) بێت،کە لە ساڵی ١٨٩٣دا لە سلێمانی لە دایک بووە وەک ئەفسەرێک لە سوپای عوسمانی دا خزمەتی کردووە، ساڵی ١٩٢٤ کاتێ گەڕایەوە عێراق لە سوپای عێراق دا بە سیفەتی مولازم وەرگیراوە،دواتر هێندەی نەبرد خانەنشین کرا، پاشان بەکر سدقی لە ساڵی ١٩٣٧ دا بە پلەی (مقدم) هێنایەوە بەر خزمەت و، کردیە ئەفسەری تەجنیدی ڕواندز، کە کتوپڕ لە ساڵی ١٩٣٨ دا هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد، هەر ئەویش سەرنووسەری سێ ژمارەکەی (بانگی کوردستان) بوو کە ساڵی ١٩٢٦ مستەفا پاشا یامولکی لە بەغدا دەری کردوون، هەر ئەویش بەڕێوەبەری کارگێڕی گۆڤاری (دیاری کوردستان) بوو، کە ساڵح زەکی ساحێبقڕان ساڵی ١٩٢٥ دەری کردوە، ئەویش ناوی (ڕەشید شەوقی)ی بەکارهێناوە. هەروەها هەر ئەویش خودانی (پەیژە)یە (بڕوانە. کەمال ڕەوف محەمەد، دوو مستەفا شەوقی، کاروان (گۆڤار)، هەولێر، هەردوو ژمارەی ٤١-٤٢، شوبات و ئاداری ١٩٨٦). دەربارەی ئەم شتە مومتاز حەیدەری دەڵێ: پیاو وا هەست دەکا ئارەزووی گریانی هەیە، گریان نەک بۆ مستەفا شەوقی کە لە ساڵی ١٩٢٦ دا سەرنووسەری (بانگی کوردستان) بوو، دواتر گۆڤاری (پەیژە)ی بڵاوکردەوە، ئاواتیشی بوو ڕۆژنامەیەکی کوردی دەربکات،دواتر لە پڕ وەک بەردی بن گۆم ناوی نەما، گریان بۆ ئەو نییە نەک لەبەر ئەوەی هەموو ئەو شتانە هیچ نین، هەروەها گریان بۆ نەتەوەی کورد نییە کە پیاوانی دڵسۆزی بەر لە پەنجا ساڵی خۆی ناناسێ و لە بیری کردوون، چونکە نموونەی لەم جۆرەمان گەلێ زۆرە، بەڵکو گریان بۆ ئەو زانایانەیە

که مـەزەندەی ئەوە دەکـرێت خۆیان لە خـەوو خـۆراک کـرد بێـت، کـه شـاعـیـرانی کـۆنی کـورد تازە دەکەنەوەو مردووانی نەناسراویش بۆ ژیان دەگێڕنەوە، هەروەها بچووکترین رستەیەک کە لە کـتـێبێکی کـۆن دا دەربارەی کـوردی ئەو سـەردەم گـوتراوە، ئەوان دەیخـەنە بەرچاو و لە بارەیەوە دەدوێن و مەلبەندێکی تازەی شانازی کردنی لەسەر دادەمەزرێنن، بەڵام کاتێک لە بارەی مستەفا شەوقییەوە لێیـان دەپرسی، خاو دەبنەوەو سەریان سوڕدەمێنێ. (بڕوانە. مومتاز حەیدەری، مستەفا شەوقی و پەیژە، هەولێر، ١٩٨٥، ل١٤).

٣٨- عبدالرزاق الحسني، العراق قديما وحديثا، الطبعه الثالثه، بغداد،١٩٥٨، ص٢٤٢-٢٣٤.

٣٩- د. جەلیلی جەلیل، ژێدەری پێشوو، ل ١٤١.

٤٠- هەمان ژێدەر، ل ١١٧.

٤١- د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەغدا، ١٩٨٥، ل ٢٣٤.

٤٢- وا زانراوە کە میرنشینی سۆران لە پاش خۆ بە دەستەوەدانی میر محەمەد و سەربازەکانی بە سوپای عوسمانی، رووخا، لە سۆنگەی ئەو فەتوایەی مەلای خەتێ گەورەترین زانای ئایینی رواندز دای، بە حەرام کردنی شەڕ لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی.

٤٣- میرکۆر، واتا میری خێل یا یەک چاو، راستتر مێژووی رووخانی ساڵی ١٨٣٦ز.

٤٤- د. عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافيه مغموره فی كوردستان، بغداد، ١٩٧، ص ٤٤.

٤٥- د.كمال مظهر، رای للمناقشه-ا لاطار الزمنی لتاريخ العراق الحديث و المعاصر، الحكمه (مجله)، بغداد، العدد الخامس،تشرين ثانی - كانون اول، ١٩٩٨، ص ٢٣.

٤٦- ئیسماعیل ئەنوەر، یەکەم کتێبخانە لە رواندز،رەنگین (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (١٥)، کانوونی دووەم ١٩٨٩، ل ٢٣.

٤٧- د. کەمال مەزهەر، کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهان دا،ل ١٤٧ (د. کەمال لە پەراوێزی هەمان لاپەڕەدا دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی گومان لە راستیی ئەو ژمارانە بکات و وا دەبینێ کە زێدەڕۆییان تێدایە).

٤٨- د.كمال مظهر، دور الشعب الكوردی فی ثوره العشرين العراقيه، بغداد، ١٩٧٨، ص ١٣٦.

٤٩- د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، ل ١٦٨.

٥٠- هەمان ژێدەر، ل ٢٣٨.

٥١- ئەمە یەکێک بوو لەو هۆیانەی وای لە ئینگلیزەکان کرد شێخ مەحمود لە تاراوگەی هیندستانەوە بەرەو کوردستان بگێڕنەوە، لە هەلومەرجی ململانێ لەسەر ویلایەتی مووسڵ، واتە دەڤەری کوردان، بەڵام شێخ پشتی تێکردن.

٥٢- بڕوانە. د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد،ل ١٢١.

٥٣- عەبدولرەزاق بیمار، ژێدەری پێشوو. ل١٦٢.

٥٤- A.M Hamiltton ,Road Through Kurdistan, The Narrative of an Engineer in Iraq, London,1939 P.P 122-123,237.

ترجمة جرجيس فتح الله بعنوان (طريق في كوردستان) واصدر عام ١٩٧٣ عن منشورات شركة دار العروبة العالمية للنشر و التوزيع في بغداد، طبع في مطبعة دار الجاحظ بـ ٢٦٤ صفحة.

٥٥- د. کەمال مەزهەر، مێژوو، ل ١٧٢.

٥٦- بە زۆر ناوی خوازراو دەینووسی، دیارترین نازناوی (داماو)ە، لە کاتێکدا حوزنی دەگەڕێتەوە سەر (حوزن)ی عەرەبی واتە (خەمگین). (بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە، رەمزەییە سابیر محەمەد، حوزنی موکریانیی نووسەرو رۆژنامەنووس، ئەتروحەیەکی بڵاونەکراوەی ماجستێرە پێشکەش بە کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین کراوە، هەولێر، ١٩٩٣).

٥٧- یەکێ لە وتارەکان ناوی (کوردستان) و (چیای کرمانج) و (دیاربەکر) و (سۆران) و (ئارارات) و (بۆتان) دێنێ وەک ڕۆژنامەگەلێک کە ژمارەی دانەکانیان لە دەی تێنەپەڕاندووە. (بڕوانە، مەغدید حاجی، کاروانە سەخت و پیرۆزەکەی چاپخانەی کوردستان، کاروان، ژمارە (٣٢)، مایسی ١٩٨٥، ل ١٢).
٥٨- د. کەمال مەزهەر، مێژوو، ل ٦٦).
٥٩- هەمان چاپخانەکەی مەیجەر سۆنە، کە بە چاپخانەی حکومەت ناونرا، ئێستاش لە نێو مۆزەخانەی سلێمانی دایە.
٦٠- گوزارەکە لە گیوی موکریانی وەرگیراوە لە پێشەکییەکەی دا بۆ کتێبی (پێشکەوتن) کە دەربارەی ژیانامەی حوسێنی برای دەدوێ، (بڕوانە ، حوسێن حوزنی موکریانی، پێشکەوتن، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان- هەولێر، ١٩٦٢، ل٢).
٦١- (دەنگی گێتی تازە) گۆڤارێکی مانگانەی گشتییە، لیژنەی پەیوەندییە گشتییەکان لە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا لە نێوان نیسانی ١٩٤٣ و ١٩٤٧ دا دەری دەکرد.
٦٢- (گەلاوێژ) گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی و ڕۆشنبیری بوو، لە ماوەی نێوان کانوونی یەکەمی ١٩٣٩ و ئابی ١٩٤٩ دا (١١٦) ژمارەی لێ دەرچووە، ئیبراهیم ئەحمەد بەڕێوەبەری بەرپرس و خودانی بوو، عەلادین سەجادییش سەرنووسەری بوو، زۆر کەس لەوانە د. کەمال مەزهەر وا پەسنیان کردووە، کە یەکێک بووە لە گۆڤارە هەرە گرنگەکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین لە سەردەمی خۆی دا.
٦٣- (هەتاو) گۆڤارێکی نیوە مانگانەی کوردی بوو، لە ساڵانی نێوان ١٩٥٤ و ١٩٦١ دا (١٨٨) ژمارەی لێ دەرچووە، گیوی موکریانی خاوەن ئیمتیازو بەڕێوەبەری گۆڤارەکە بوو، پارێزەر ئیبراهیم عەزیز دزەیی بەرپرسی گۆڤارەکە بوو، پاشان پارێزەر محەمەد شەهاب دەباغ بوەتە سەرنووسەری.
٦٤- هەولێر، گۆڤارێکی مانگانە بوو شارەوانیی هەولێر بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکرد، محەمەد مەولود (مەم)ی چیرۆکنووس سەرنووسەری بوو، سەعدی محەمەد ئەمین دزەییش بەڕێوەبەری بوو، لە ماوەی نێوان مایسی ١٩٧٠ و ١٩٧٢ دا دەرچووە.
٦٥- تیشک، گۆڤارێکی ساڵانەی پەروەردەیی بوو لە لایەن قوتابخانەی (مامۆستایان)ی سەرەتایی کوڕانەوە دەردەچوو دەستەی نووسەرانی لە مەجید ئاسنگەر و، حەمە کەریم هەورامی و، فاتیح محەمەد پێک هاتبوو. دوو ژمارەی لە ١٩٦٩ و ١٩٧٠ لێ دەرچووە.
٦٦- بیری نوێ، گۆڤارێکی ساڵانەی ئەدەبی و زانستیی گشتی بوو، لە لایەن لیژنەی زمان و ئەدەبی کوردی لە دواناوەندیی هەولێری کوڕان و بە سەرپەرشتی عەبدولڕەحمان سەعدی وانەبێژی زمان و ئەدەبی کوردی لە قوتابخانەکەدا، دەردەچوو، کاردۆ گەلاڵی سکرتێری نووسینی بوو، یەکەمین ژمارەی لە ١٩٧٢دا دەرچووە.
٦٧- هەولێر، ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی گشتی بوو، لە لایەن یەکێتی مامۆستایانەوە لە هەولێر بە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی دەردەچوو ، یەکەمین ژمارەی لە ١٩٥٠/١٢/١٦ دا دەرچووە و تا ١٩٥٣ بەردەوام بوو، حوسێن ڕەشوانی و عیزەدین فەیزی و ئەستێرە سەعید سەرپەرشتیی نووسینەکەیان دەکرد، بە سەرپەرشتی جەمیل ڕەشید ئامێدی.
٦٨- عەبدولڕەزاق بیمار، ژێدەری پێشوو، ل ١٧٤.
٦٩- زاری کرمانجی، ژمارە حەوت، ٣ی کانوونی دووەم ١٩٢٧، (هەروەها بڕوانە د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، ڕێنووسی کوردی بە پیتی عەرەبی، بەغدا، ١٩٨٦، ل ٣٠-٣١، ٣٢).
٧٠- عەبدولڕەزاق بیمار، ژێدەری پێشوو، ل١٧٥.
٧١- وتارەکە لە ڕەسەندا پوخت نییەو بە پەلە نووسراوە، بۆیە لە کاتی وەرگێڕاندا، ویستمان شاشییەکەی بپارێزین.

٧٢- زاری کرمانجی، ژماره نۆ، ١٩٢٧/٦/٢، ل ٢٣.٢٢، (وتاری وەلامی یەکێ لە نوێنەرانی گەل).
٧٣- لە لایەن کەریم مستەفا شارەزاوە وەرگێڕدراوە، لە وتاری (حوزنی موکریانی و ڕۆڵی لە پەرەپێدانی هونەری وتاری کوردی)، کاروان (گۆڤار)، بەشی عەرەبی، ژمارە (٧٠)کانوونی یەکەمی ١٩٨٨، ل ١٣٢.
٧٤- بەشیر موشیر لە ڕۆشنبیرە سادەو دڵسۆزەکانی کوردە، نماینده‌ی دابەش کردنی ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێبە کوردییەکان بوو لە بەغدا تا ساڵی کۆچی دوایی کردنی لە ١٩٦٣ دا، دوکانی بەرگدرووەکەی لە حەیدەرخانە شوێنی بە یەک گەیشتنی گەورە ڕۆشنبیران کورد بوو لە بەغدا، وەک: ئەمین زەکی و، ڕەفیق حیلمی و، عەلادین سەجادی و، مەعرووف جیاوۆک و ، ئیبراهیم ئەحمەد و غەیری ئەوان لە قوتابیانی کورد کە لە بەغدا دەیانخوێند و ڕۆشنبیرانی کە بە سەردان دەهاتن. بە هۆی ئەو پەیوەندییە بە تینەی لەگەڵ ڕۆشنبیرانی کوردا هەی بوو ،بووە دیاردەیەک لە دیاردەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی کوردی، کە تا ئێستا یادگارەکانی دەنگ دەدەنەوە، ڕۆشنبیرانی کورد لە خۆشەویستیدا بە (ئوستاد) ناویان دەبرد، (بڕوانە عیزەدین مستەفا رەسووڵ، ئوستاد، سلێمانی، ١٩٩٨).
٧٥- هەمان ژێدەر، ل ١٣٢.
٧٦- نزار جرجیس علی، صحافه اربیل، دار الثقافه والنشر الکوردیه، بغداد، ١٩٨٨ ،ص١٣٦.
٧٧- کۆمەڵی لاوان ڕێکخراوێکی قوتابیان بوو، چەند کەسایەتییەکی دیاری ناسراوی وەک ئەمین زەکی بەگ و تۆفیق وەهبی پشتگیرییان لێ دەکرد، نزیکەی حەفتا قوتابیی تێدا بوو لەوانەی لە کۆلیژەکانی بەغدا دەیانخوێند کە لە شارە جۆراوجۆرەکانی کوردەوە هاتبوون. ساڵی ١٩٣٣ کۆمەڵەکە لە بەغدا دامەزرا، گرنگیی ئەم کۆمەڵەیە لەوەدایە کە بووە هەوێنی پارتە نەتەوەیی و چەپەکان، گۆڤارەکەشی بووە هەوێنی گۆڤاری (گەلاوێژ). ئیبراهیم ئەحمەدو، فازڵ ڕەوف تاڵەبانی و، حامید فەرەج و، دکتۆر عەبدولڕەحمان عەبدوڵڵاو، شاکر فەتاح بەشدارییان لە نووسینی گۆڤارەکەدا دەکرد، هەروەها شاعیرانی شۆڕشگێڕی وەک گۆران و بێکەس شیعریان تێدا بڵاوکردوەتەوە.
٧٨- ژین واتە (الحیاه) هیواش واتە (الامل) هەردوو پەیڤەکە من وەکو خۆیان بەکارم هێنان چونکە وەک ئاشکرایە ناوی کەسن، یەکەمیان بە گشتی بۆ کچان بەکار دێت، کەچی (هیوا) بە زۆری ناوی کوڕە، ئەم شتەش لەوانەیە ئەو رایە دووپات بکاتەوە کە (یادگاری لاوان) بۆ ڕێزگرتن لە یادی ڕاپەڕینی ئەیلوولی ڕەش لە ساڵی ١٩٣٠ لە سلێمانی دەرچووە، تێیدا زۆر کەس کوژران، هەروەها ناوی گۆڤارو کۆمەڵەیەکی دیکەن لە کوردستان تورکیا، گۆڤارێکی دیکەیان دەردەکرد بە ناوی (ژین) و (هیڤی)کە واتای (هیوا) دەگەیەنێ بە شێوەزاری سۆرانی.
٧٩- لەوانەیە ئەمانیش ناوی کەس بن.
٨٠- بڕوانە غەفوور میرزا کەریم، یادگاری لاوان و دیاری لاوان، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨، ل ١٢-١٣.
٨١- (جماعه الاهالی) ڕێکخراوێکی لاوانی ڕۆشنبیری عەرەب بوو لە بەغدا لەوانەی داوای بایەخدان بە گرفتە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانیان دەکرد، پێداگیریشیان لە داواکردنی دیموکراتیەت و لیبراڵیەت دەکرد، ڕەوتی گشتیشیان ناونرا (الشعبیه - میللییەت) کە زۆر لە سۆسیالیزم نزیک دەبێتەوە، سەرەتای ساڵی ١٩٣٢ ڕۆژنامەی (الاهالی) یان دەرکرد (بۆ زیاتر ئاشنا بوون بڕوانە/ فؤاد حسین الوکیل،جماعه الاهالی فی العراق، دار الرشید للنشر، بغداد، ١٩٧٩).
٨٢- زۆر پیرەمێرد بە (برنادشۆ) دەچوێندرێ ئەوەی حوزنییش لێرەدا دەیڵێ بە راستی روانینی هەمووانە بۆ پیرەمێرد، لێرەشدا حوزنی تەنیا لە رووی گلەیی و گازاندەوە کردوویەتی.
٨٣- د. کوردستان موکریانی، کچی گیوی موکریانیی برای حوزنی، دەڵێ، لە نێو پاشماوەکانی حوزنیی مامیدا نامەیەکی کۆمەڵەی گەلان هەیە، تێیدا سوپاسی (رووناکی) دەکات کە دوو دانەی بۆ ئەم

ڕێکخــراوە نێــو نەتەوەییــە ناردووە هەر وەکــو نەریتی ناردنی دانە بۆ ڕۆژهەڵاتناس و زانکۆ جیهانییەکان تا ئێستا لە نێو ڕۆژنامەنووسانی کوردا برەوی هەیە، دەکرێ لێرەوە بایەخی ئەم کارەمان بۆ روون بێتــەوە، کــە زۆربەی ڕۆژنامــە کــوردییــە کۆنەکــان لە کــتێبــخــانەکــانی ئەوروپاو دەزگــا ئەکـادیمیــیــەکــانیــدا دۆزراونەتەوە کــە بایەخــیــان بە چاپەمــەنیــیــە کــوردییــەکــان داوەو زۆر چاک پاراستوویانن، لە کاتێکدا لە نێو کوردستاندا نەماون یا یەکجار کەم دەست دەکەون، لەم بوارەدا ناوی گەورە دێتە بەرچاو، کە ئەدمۆندزو مینۆرسکی لە پێشەوەیان دێن.

٨٤- د.کوردستانی موکریانی، تیشکێک بۆ سەر گۆڤاری (ڕووناکی)، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٠٧)، ئەیلوولی ١٩٨٥، ل ٢٦٤.

# پوختەیەک

دەکرێ بڵێین ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩١٤ و ١٩٣٩ ، زۆر بە روون و رەوانی رەوشی مۆلەق و ناجێگیری گەلی کوردی لە عێراقدا لەو ماوەیەدا نمایش کردووە، کە کەوتووەتە بن دەسەڵاتی داگیرکەری عوسمانی و ئینگلیز،پاشان بزووتنەوەکانی شێخ مەحمودو راگەیاندنی وەکو حوکمدار، پاشان راپەڕینی دژ بە ئینگلیزو راگەیاندنی خۆی وەک مەلیک. هەر لەو کاتەدا گرفتی ویلایەتی مووسڵ ورووژێندراو، لە رێی کۆمەڵەی گەلانەوە چارەسەر کرا، ئەو کێشەیە لە راستیدا واتای کێشەی کوردی دەگەیاند، پاشان هەوڵی حکومەتی پاشایەتی، کە لە لایەن بەریتانیاوە پشتیوانیی لێ دەکرا، بۆ خۆدزینەوە لەو بەڵێنانەی کە بە کوردیان دابوو بەرامبەر بە دەنگدانیان بۆ چوونە سەر عێراق،هەروەها هەوڵی حکومەت، بە تایبەتی لەگەڵ زیادبوونی هێزی عەرەبە قەومییەکان و دەست رۆیشتنیان لە سیاسەتی ئەو حکومەتانەی دادەمەزران، لەپێناو دوور خستنەوەی کورد لەوەی بە مافەکانی خۆی بگات، لە پێشەوەی ئەو مافانەش فێربوونی تەواو بە زمانی خۆیان، هەروەها هەوڵی بەردەوامیان بۆ رێ نەدان بە کورد کە گوزارە لە بوون و قەوارەی نەتەوەییان بکەن بە شێوازە باوەکانی شارستانیەت،وەکو گۆڤارو ڕۆژنامە، بۆیە بە درێژایی ئەو ساڵانە، کە نزیکەی یەک چارەکە سەدە دەکات، تەنیا یەک ڕۆژنامە لە سلێمانی دەرچووە، لەگەڵ هەندێ گۆڤار لێرەو لەوێ، کە نەیانتوانی درێژە بە دەرچوونیان بدەن، تەنیا بۆ ماوەیەکی زۆر کورت نەبێ، بە هۆی پشتیوانی نەکردنی حکومەت لێیان، بەڵکو دانانی ئاستەنگ لە بەردەمیان، سەرەنجام هەر هەموویان لە هەمان ماوەدا، لە دەرچوون وەستان.

لە تێکڕای کاروانی ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا لە ماوەی ١٩١٤-١٩٣٩ دەگەینە ئەم ئاکامانە:

١- دەرکەوتنی ناوی گەورە بە شێوەیەکی دەگمەن و تاکە کەسی خزمەتی ڕۆژنامەگەرییان کردووە، کە بەرامبەر بە کارو دەسکەوتەکانی دەزگای سەربەخۆی

ڕۆژنامەنووسی دەوەستێت، وەکو مەیجەر سۆن و حوسێن حوزنی موکریانی و پیرەمێرد.

٢- دەیان سەربازی نەناسراو هەیە، تەنانەت شوکری فەزڵی،نووسەری سەرەکیی (تێگەیشتنی ڕاستی)، گومان خرایە سەر کورد بوونی لە کاتێکدا تا ئەمڕۆ شتێکی زۆر کەم دەربارەی مستەفا شەوقی دەزاندرێ.

٣- ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامەو گۆڤارو بە دوو زمان و سێ زمان و لەوانەیە چوار زمانیش دەرچووە، ئەوەش حاڵەتی دوودڵیی نووسەرانی ڕۆژنامەکان دەردەبڕێت لە ئاست ئەو زمانەی کە پێویستە خوێنەرانی پێ بدوێندرێ لە کۆمەڵگایەکدا لە چەشنی کۆمەڵگای ئەو ڕۆژگارەی کوردەواری.

٤- کەمیی ژمارەی گۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکان بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی لەو ڕۆژگارەدا دەردەچوون با ئەوە بێنینەوە بیری خۆمان بەرامبەر بە حەفتا ڕۆژنامەو پتر لە بیست گۆڤار کە دوای کودەتای عوسمانی (١٩٠٨) لە عێراقدا دەردەچوون، ژمارەی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان سفر بووە.

ئەم حاڵەتە لە ساڵانی سەرەتای لێکۆڵینەوەکەمان هەر بەردەوام بووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ حکومەت مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردیی نەدەدا، چونکە چینی ڕۆشنبیری کورد نە کەم بوو، نە سست و بێ هێزیش بوو، بەڵکو گەلێ پەرۆش بوو، بە گەرمی هەوڵی ئەوەی دەدا لە ڕێی ڕۆژنامەگەرییەوە گوزارە لە خۆی بکات، بەڵگەش بۆ ئەوە،ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە بوو کە لەگەڵ هەر دەرفەتێکدا لە کۆتایی ساڵانی بیست و سی لە دەرەوەی عێراق یا ناوەوەی دەردەچوون، بەڵکو هەر سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٧ دا لە یەک کاتدا دوو ڕۆژنامەی گرتە خۆی، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە ڕۆشنبیرانی سلێمانی لە توانایاندا بوو هەر خۆیان گەر دەرفەتیان هەبێ،چەندین ڕۆژنامەو گۆڤار دەربکەن، هەروەها بە نیسبەت ڕۆشنبیرانی شارە کوردییەکان دی، وەک هەولێر بە تایبەتی.

٥- کەمی و کۆنیی چاپخانەکان بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش.

٦- دەرکردنی ڕۆژنامە لە لایەن دەسەڵاتەوە، ئەویش بەپێی پێویست و بە مەبەستی هێنانی خەڵک بە لای سیاسەتەکانیدا، هەروەها ئامادەکردنی هزرو بیری خەڵک بۆ پێشوازی کردنی هەر گۆڕانکارییەکی دەسەڵات دەیەوێ فەرزی بکات.
٧- دەسەڵاتی بەرپرس دژایەتی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییە نارەسمییەکانی دەکرد، هەوڵی فەرزکردنی سانسۆرێکی توندی دەدا بە سەریاندا، ئنجا پەناشی دەبردە بەر داخستنی ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی هەوڵی بەزاندنی هێڵە سوورو دیاری کراوەکانیان دەدا.
٨- پشت بەستنی ڕۆژنامەو گۆڤارە ئەهلییەکان بە بودجەیەکی کەمی کەسانێک، بە زۆری هەر ئەوانیش بوون گشت کارەکانیان دەکردو، قوربانییان بە هەموو شتێکی ژیانیان دا لەپێناو بەردەوام بوونی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیان.
٩- هیچ ڕۆژنامەو گۆڤارێک دەستەی نووسەرانی نییە، بەڵکو دەرچوونی هەر کامێکیان بە تەنیا پشتی بە سەرگەرمی و سەرچڵیی کەسێک یا دوو کەس دەبەست.
١٠- دەرچوونی هەندێ گۆڤار وەک (پەیژە) و (یادگاری لاوان) بە شێوەی پاش و پێش گرتنەوە بووە لە ئیمتیاز، چونکە ئیمتیاز ئاسان نەبوو بدرێتە کورد.
١١- زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان ڕێڕەوێکی روونی نەتەوەییانەی کوردانەیان گرتوەتە بەر. شیاوی باسە یەکەمین گۆڤارێک کە بە ناوی (بانگ کرد-بانگی کورد)ەوە لە بەغدا دەرچووە، خاوەن و نووسەرە سەرەکییەکانیان، وەک جەمال بابان و عومەر نەزمی، هیچ هەڵوێستێکی دیاری نەتەوەییانەیان لێ بەدی نەکراوە بە درێژایی ژیانیان، وێڕای ئەوە گۆڤارەکە بە شێوەیەکی روون خاوەنی ڕێڕەوێکی نەتەوەیی بوو.
١٢- بەغدای لێ دەربچێت ، ڕۆژنامەکان بە تەنیا لە شاری سلێمانی دەرچوون، ئەویش گەر چاو لە دەرچوونی گۆڤاری (زانستی) بپۆشین، هیچ گۆڤارێکی بەخۆوە نەدیوەو، بە تاقە ڕۆژنامەیەک باسی لێ کردوە، بۆ ئەوەی ڕۆشنبیران و خوێنەرانی بە دەوردا کۆ ببێتەوە.

١٣- گۆڕانی مەڵبەندی چالاکیی ڕۆژنامەوانی، یا راستتر ڕۆشنبیری، لە ئەستەمبوڵەوە بە بەغدا، ئەوە سەبارەت بە شارە ناکوردییەکان،بەغدا بووە رووگەی ڕۆژنامەنووسی و ڕۆشنبیرانی کورد.

١٤- دەکرێ (ژیانەوە) کە ساڵی ١٩٢٤ دەرچووە، بە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی دابنێین کە لە مەملەکەتی عێراق دەرچووە، ئەو مەملەکەتەی ساڵی ١٩٢١ دامەزراوە، واتە پاش سێ ساڵ لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق و پاش هەرەس هێنانی حوکمداریەتی شێخ مەحمود.

١٥- نارێکیی کاتی دەرچوونی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی سەردەمی باسەکەمان، هەروەها بەردەوام نەبوونیان لەبەر هۆی مادی یا بە هۆی سیاسەتی حکومەت بەرامبەریان، با ڕۆژنامەی (ژیان) بێنینەوە یاد، کە ساڵانێکی زۆر مایەوەو ژمارەکانیشی هەزاری تێپەڕاند، چەندین جار وەستاو تەنانەت بە غەیری ناوی خۆشی دەرچووە.

١٦- ڕۆژنامە سیاسییەکان لە هەواڵ و تەنانەت هەندێ بەدواداچوونی ڕۆژنامەوانیدا، پشتیان بە ڕۆژنامە عەرەبی زمانەکانی بەغدای پایتەخت دەبەست، هەرچی گۆڤارەکانیش بوو، بە گشتی مۆرکی گۆڤاری ئەدەبی و ڕۆشنبیرییان بەخۆوە دەگرت.

١٧- پێشکەوتنی پلە بە پلەی زمان و ڕێنووسی کوردی بە پیتی عەرەبی و پشتیوان لێکراو بە هەندێ پیتی دی، بە هۆی ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانەوە.

١٨- بەشداری کردنی ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانە، بە شێوەیەک لە شێوەکان، لە بەرەو پێشبردنی ڕەوشی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی گەلی کورد لە عێراقداو، کارکردن لەپێناو زیاتر هۆشیار کردنەوەی هاووڵاتیان لە بواری دەروبەری خۆیان و جیهانەکەیان.

١٩- تێکەڵبوونی ئاشکرای نێوان ئەدەب و ڕۆژنامەگەری و پشتیوانی کردنیان لە یەکتر، بەڵکو ڕۆژنامەگەری ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە پەرەپێدانی شیعری سیاسی و نیشتمانیدا، کە زۆربەی جار مۆرکێکی ئەدەبیانەی پێ بەخشیوە.

٢٠- بەردەوام بوونی هەندێ نووسەرو شاعیر لە ڕۆژنامەی لە ڕەوت دژ بە یەک دا وەکو ڕۆژنامەکانی شێخ مەحمودو ئەوانی پاشتر، ئەوە دەردەخات کە دەرووی دیکەیان بۆ بڵاوکردنەوە لە بەردەم دا نەبووە، هەروەها درک کردنیان بە بایەخی گەیشتن بە خوێنەرانیان لە ڕێی ڕۆژنامەگەرییەوە، جا هەر چییەک بێت ڕەوتی ئەو ڕۆژنامەگەرییە.

٢١- لە زۆر حاڵەتدا ئاوێتە بوونی خەباتی کوردو خەباتی عەرەب، کە برایەتی نیشتمانیی عەرەب و کوردی بەرجەستە کردووە، هەروەک لەو گۆڤارانەی لە بەغدادا دەرچوون، دەردەکەوێت، زۆربەیان لە چاپخانەگەلێک چاپ کراون کە خاوەنەکانیان عەرەب بوون و سەرباری یەکبوونی هەست و گوزارە لەو ڕۆژگارە پڕ لە دەستەوەستانییەدا. هەر بۆ نموونە با پێشکەشەکەی د.کەمال مەزهەر، کە دیارترین مێژوونووس و هزرەوەری کوردە، لە کتێبی (تێگەیشتنی ڕاستی)دا بخوێنینەوە: (پێشکەش بە زانای شکۆدار کە (تێگەیشتنی ڕاستی)ی لە فەوتان ڕزگار کردووە (ئەنستانس ماری ئەلکەرمەلی)! بۆ ئەو(شوکری فەزلی)یە کە ئەگەر کورد بوو بێت زۆر بەرزو پایەدار بووە، خۆ ئەگەر عەرەبیش بوو بێت ئەوە بەرزو پایەدارترە!).

# ئەو گۆڤارە کوردییانەی لە ساڵانی ١٩١٤- ١٩٣٩ لە عێراقدا دەرچوون

| ز | ناوی گۆڤارەکە | شوێنی دەرچوون | ئامانجەکان | سەرنووسەر | جۆری دەرچوون | رۆژی دەرچوونی یەکەمین ژمارە | کۆی ژمارەکان | دوایین ژمارە | ژمارەی لاپەڕەکانی | قەبارە بە (سم) | زمان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | بانگی کورد | بەغدا | ئایینی رۆشنبیری کشتوکاڵی مێژوویی | جەمال بابان | نیو مانگانە | ١٩١٤/٢/٨ | ٥ | ........... | ٢٤ | ١٥.٥×٢٢.٥ | کوردی و تورکی |
| ٢ | دیاری کوردستان | بەغدا | ئەدەبی کۆمەڵایەتی | ساڵح زەکی ساحێبقران | هەفتانە | ١٩٢٥/٣/١١ | ١٦ | ١٩٢٦/٥/١١ | ٢٤ | ١٦×٢٢ | کوردی و |
| ٣ | زاری کرمانجی | رەواندز | کۆمەڵایەتی مێژوویی هونەری وێژەیی | حوسێن حوزنی موکریانی | مانگانە | ١٩٢٦/٥/٢٥ | ٢٤ | ١٩٣٢/٧/٣١ | ٢٠، ٢٤، ١٦، ١٢ | ٢٠×٢٨ | عەرەبی و تورکی کوردی |
| ٤ | پەیژە | بەغدا | ئەدەبی کۆمەڵایەتی | مستەفا شەوقی | .......... | ١٩٢٧ | ١ | ........... | ٤٦ | ١٢×١٨ | |
| ٥ | یادگاری لاوان | بەغدا | ئەدەبی کۆمەڵایەتی رۆشنبیری | ................. | ساڵانە | ١٩٣٣ | ٢ | ١٩٣٤ | ٨٠ | ٢٢×١٦.٢ | کوردی |
| ٦ | رووناکی | هەولێر | زانستی کۆمەڵایەتی ئەدەبی | شێت مستەفا | هەفتانە | ١٩٣٥/١٠/٢٤ | ١١ | ١٩٣٦/٥/١٦ | ١٦ | ٢٠×٢٨ | کوردی |
| ٧ | زانستی | سلێمانی | ئەدەبی مێژوویی | ساڵح قەفتان | .......... | ١٩٣٨/٢/٢٥ | ١ | ........ | ........... | ............. | کوردی کوردی |

- خشتەیەکی ئەو رۆژنامە کوردییانەی لە سالانی ١٩١٤-١٩٣٩ لە عێراقدا دەرچوون.
- خشتەیەکی ئەو گۆڤارە کوردییانەی لە سالانی ١٩١٤- ١٩٣٩ لە عێراقدا دەرچوون.
- ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەی لە دەرەوەی عێراقدا دەرچوون (١٨٩٨-١٩٣٩).

## ئەو رۆژنامە کوردییانەی لە سالانی ١٩١٤-١٩٣٩ لە عێراقدا دەرچوون

| ژ | ناوی رۆژنامەکە | شوێنی دەرچوون | مەبەست و بابەت | جۆری دەرچوون | سەرنووسەر | رۆژی دەرچوونی یەکەمین ژمارە | کۆی ژمارەکان | مێژووی دوایین ژمارە | ژمارەی لاپەڕەکان | قەبارە بە (سم) | زمان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | تێگەیشتنی راستی | بەغدا | سیاسی کۆمەلایەتی | نیو هەفتانە، هەفتانە | مەیجەر سۆن و شوکری فەزلی | ١٩١٨/١/١ | ٦٧ | ١٩١٩/١/٢٧ | ٤.٢ | ٢٤×٣٦ | کوردی |
| ٢ | پێشکەوتن | سلێمانی | گشتی | هەفتانە | مەیجەر سۆن | ١٩١٩/٤/٢٩ | ١١٨ | ١٩٢٢/٧/٢٧ | ٦.٤ | ٢١×٣٣، ٢٠×٣٢ | کوردی |
| ٣ | بانگی کوردستان | سلیمانی، بەغدا | زانستی کۆمەلایەتی ئەدەبی نەتەوەیی | هەفتانە | مستەفا پاشا یامولکی | ١٩٢٢/٨/٢ | ١٧ | ١٩٢٦/٤/١ | ٤.٦ | ٢١.٥×٣٤، قەبارەی باوی ئێستا | کوردی و فارسی و تورکی |
| ٤ | رۆژی کوردستان | سلێمانی | سیاسی ئەدەبی کۆمەلایەتی | هەفتانە | شێخ نوری شێخ سالح | ١٩٢٢/١١/١٥ | ١٥ | ١٩٢٣/٣/٣ | ٤ | ٢١.٥×٣٤ | کوردی و فارسی و تورکی |
| ٥ | بانگی حەق | سلێمانی | سیاسی کۆمەلایەتی | ................ | سالح زەکی | ١٩٢٣/٣/٢٨ | ٣ | ١٩٢٣/٤/١٢ | ٢ | ٣٣×٢١ | کوردی |
| ٦ | ئومێدی ئیستیقلال | سلێمانی | سیاسی ئابووری ئەدەبی کۆمەلایەتی | هەفتانە | خواجەئەفەندی زادە، ئەحمەد سەبری*، رەفیق حیلمی، حوسێن نازم | ١٩٢٣/٩/٢٠ | ٢٥ | ١٩٢٤/٥/١٥ | ٤ | ٢١×٣٤ | کوردی و فارسی و تورکی |
| ٧ | ژیانەوە | سلێمانی | سیاسی ئەدەبی کۆمەلایەتی | نیوهەفتانە، هەفتانە | جەمیل سایب، م. ئەدیب | ١٩٢٤/٨/١٨ | ٥٦ | ١٩٢٦/١/١٤ | ٤ | ٢٠×٣٢ | کوردی |
| ٨ | ژیان | سلێمانی | سیاسی ئەدەبی کۆمەلایەتی | هەفتانە | حوسێن نازم، پیرەمێرد | ١٩٢٦/١/٢١ | ٥٥٣ | ١٩٣٨/٣/١٠ | ٤ | ٢٠×٣٢، ٢٨×٣٨ | کوردی |
| ٩ | کەرکووک (سالی ١٩٣٠و ١٩٣١) | کەرکوک | سیاسی | هەفتانە | هیجری دەدە کاکەیی | ١٩٢٦/١٠/١٢ | ٢٠٣٣ | ١٩٧٢/٨/٢٠ | لاپەڕەی کەم و زۆر | قەبارەی جۆراوجۆر | عەرەبی و تورکی و کوردی |
| ١٠ | زبان | سلێمانی | گشتی | هەفتانە | سالح قەفتان | ١٩٣٧/٩/١١ | ٩٤ | ١٩٤١/١/١٨ | ٦ | ٢٨×٣٨ | کوردی |

* ئەو (وێرگول)ەی لە نێوان ناوی خواجەو ئەفەندی زادەو ئەحمەد سەبری زادەو هەردووکیان بە یەکەوەن.

# ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەی لە دەرەوەی عێراق دەرچوون
# (١٨٩٨-١٩٣٩)

## رۆژنامەکان

### (١) کوردستان

یەکەمین رۆژنامەی کوردییە، میقداد مەدحەت بەدرخان سەرپەرشتی دەرچوونەکەی دەکرد، پاش ئەویش عەبدولڕەحمان بەدرخانی برای. لە ماوەی نێوان ٢٢ی نیسانی ١٨٩٨ـەوە تا ١٤ی نیسانی ١٩٠٢، ٣١ ژمارەی لێ دەرچووە. هەر زوو وەک خوێنەرانی، تووشی دەربەدەری هات، لە قاهیرەو جنێف و لەندەن و فولکستون و جارێکی دی لە جنێفدا دەرچووە. زمانی رۆژنامەکە کرمانجیی سەرووە.

### (٢) کورد تەعاون وە تەرەقی غەزەتەسی

رۆژنامەیەکی دینی سیاسی و کۆمەلایەتیی هەفتانە بوو بە کوردی و تورکی. ئۆرگانی کۆمەڵەی تەعاونی و تەرەقیی کورد بوو لە ئەستەمبوڵدا، هەردوو بنەماڵەی شەمزینی و بەدرخانی سەرپەرشتییان دەکرد. پیرەمێردی شاعیر خاوەن ئیمتیازی بوو، ئەحمەد جەمیل پاشاش سەرنووسەر. یەکەمین ژمارەی لە پێنجی کانوونی یەکەمی ١٩٠٨دا دەرچووە و نۆ مانگ بەردەوام بووە.

* «هەموو ژمارەکانی لە کتێبێکدا دووبارە لە سوید لە لایەن مامۆستا محەمەد ئەمین بۆز ئەرسەلان چاپ کراوەتەوەو گەیشتۆتە کوردستان- ع. زەنگەنە».

### (٣) کوردستان

پاش راگەیاندنی دەستوور لە ١٩٠٨دا لە لایەن سورەیا بەدرخانەوە لە ئەستەمبوڵ دەرچووە، تا رۆژی سێزدەی نیسان ١٩٠٩ بەردەوام بووە، کاتێک خاوەنی دەسگیر کرا، پاش ئەوەی (ئیتیحاد و تەرەقی)، دوای داگیرکردنی ئەستەمبوڵ لەلایەن سوپای مەحموود شەوکەوت پاشاوە، هاتە سەر دەسەڵات.

### (٤) پەیمان

هزری و سەربەخۆو هەفتانە بوو بە هەردوو زمانی تورکی و کوردی، یەکەمین ژمارەی لە (٥)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٠٩ لە دیاربەکر دەرچووە، ژمارە دوازدەشی لە ٣١ی ئابی ١٩٠٩ دەرچوو. خاوەن ئیمتیازو بەڕێوەبەری بەرپرسی کاتب زادە شوکری بوو، سەرنووسەرەکەشی ل باقی بوو، لە چاپخانەی ویلایەتی دیاربەکردا چاپ دەکرا.

* «پێم وایە ئەو رۆژنامەیە بە کوردی دەرنەچووە، بەڵکو تەنیا ژمارە (١٢)ی دوانێکی تێدا بڵاوکراوەتەوە، رۆژنامەکە خۆی بەزمانی تورکیی عوسمانی دەرچووە- ع. زەنگەنە».

### (٥) شەرق و کوردستان

ئیسلامی بوو بە کوردی و تورکی. ساڵی ١٩٠٨ لە لایەن ئەحمەد شەریف هەرسکلی و بەدری مەلا تەلی و ئیسماعیل هەرسکلییەوە دەرچووە. تایبەت بوو بە دەعوەی ئیسلامی.

### (٦) کوردستان

لە قاهیرە بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی لە لایەن ئەحمەد سورەیا بەدرخانەوە دەردەچووە، هەر خۆشی بەڕێوەبەر و بەرپرسی بوو. لە چاپخانەی (ئەبی لهوول)دا چاپ دەکرا، لە نێوان ئەیلوولی ساڵی ١٩١٧و، ٢٨ی کانوونی دووەمی ١٩١٨دا، بە شێوەیەکی نیوە مانگانە یازدە ژمارەی لێ دەرچووە.

* «بابەتێکم لە گۆڤاری رەنگین خوێندۆتەوە باس لەوە دەکا (١٢) ژمارەی لێ دەرچووە - ع. زەنگەنە».

### (٧) سەربەستی

ساڵی ١٩٢١ بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی لە ئەستەمبوڵدا دەرچووە،

مـەولانا زادە رەفـعـەت بەگی کـوردی خـاوەن ئیـمـتـیـازی بوو، یاریدەدەری سەرنووسەریشی جەلادەت عالی بەدرخان بوو.
«ناوهێنانی جـەلادەت وەک یاریدەدەری سـەرنووسـەر شـایانی سـەرنجـە-ع.زەنگەنە».

(٨) **رۆژی کورد- شەوی عەجەم**
**رۆژی کورد**
**کورد**

هەواڵدەرێکی سیاسی ئەدەبی هەفتانە بوو بە هەر دوو زمانی کوردی و فارسی. زمانحاڵی بزووتنەوەی (سمکۆ) بوو، محەمەد تورجانی (مەلا محەمەد قزڵجی) سەرپەرشتیاری گشتیی بوو. لە سەرەتای حوزەیرانی ١٩٢٢ یەکەمین ژمارەی لە ورمێ دا دەرچووە، پاش چەند ژمارەیەک وەستا، چەند جارێ ناوی خۆی گۆڕی.

(٩) **رێ یا تازە**

ئۆرگانی حزبی شیوعی بوو لە ئەرمینیای سۆڤێتیدا. یەکەمین ژمارەی لە ٢٥ی ئاداری ساڵی ١٩٣٠ لە یەریڤان (پایتەختی ئەرمینیا) دەرچووە، تا ساڵی ١٩٣٨ بەردەوام بەپیتی لاتینی دەردەچوو، لە ژمارە ٦١٢دا وەستا، بۆ ئەوەی سەر لە نوێ لە شوباتی (١٩٥٥)دا دووبارە بە پیتی رووسی- سلاڤی دەربچێتەوە. (رێ یا تازە) رۆژنامەیەکی سیاسیی هەفتانە بوو، سەرەتا (میرۆی ئەسەد) و (قەچاغی موراد) سەرنووسەری بوون، تا ئێستاش بەردەوام دەردەچێت.

## گۆڤارەکان

### (١) رۆژی کورد

### هەتاوی کورد

یەکەمین گۆڤاری کوردییە، یەکەم ژمارەی لە شەشی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٣دا دەرچووە، ئۆرگانی (کۆمەڵەی هیڤی کورد) بوو لە ئەستەمبوڵ، سەرنووسەریشی عەبدولکەریم ئەفەندی بوو. یەکێ بوو لە رۆشنبیرانی سلێمانی، یەکەمین سێ ژمارەی بە ناوی (رۆژی کورد) دەرچووە، پاشان دوو ژمارەی بە ناوی (هەتاوی کورد) دەرچووە، بەر لەوەی بە هۆی بەرپا بوونی شەڕەوە بوەستێت. بابەتەکانی بە زمانی کوردی و تورکی بڵاودەکردەوە.

* «رۆژی کورد» چوار ژمارەی لێ دەرچووە خاوەنەکەی عەبدولکەریم کەرکوکلی زادە بووە دواتر «یک بوون» بڵاو کراوەتەوە ئینجا دواتر «هەتاوی کورد» دە ژمارەی لێ دەرچووە - ع. زەنگەنە.

### (٢) ژین

دینی کۆمەڵایەتی ئەدەبی ئابووری بوو بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی. خاوەن ئیمتیاز و بەرپرسەکەی ئەشرەف حەمزە بوو، پاشان مەمدوح سەلیم. ئۆرگانێکی (نارەسمی) کۆمەڵەی کوردستان بوو لە ئەستەمبوڵ دا. ژمارە یەکی لە ٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ دەرچووە. لە شوباتی ١٩١٩وە کۆمەڵەی تەعمیمی مەعارف و نەشریاتی کوردی ئەرکی دەرکردنەکەی گرتە ئەستۆ. بیست ژمارەی (ژین) دەرچووە، کە لە مانگێک دا سێ تا چوار ژمارەی لێ دەردەچوو.

بەرێز رەفیق ساڵح وای دەبینێ کە مەمدوح سالم لە ئایاری ١٩٢٠دا سەرنووسەرایەتییەکەی گرتوەتە دەست، هەروەها سکرتێری گشتیی کۆمەڵەی تەشکیلاتی کۆمەڵایەتیی کوردیش بوو، کە ئەمین عالی بەدرخان پاش لێک ترازانی کۆمەڵەی تەعالی و دامەزراندنی (کۆمەڵەی کوردو کوردستان) لە لایەن سەید عەبدولقادری شەمزینی دایمەزراند. (ژین) گۆڤارێکی کاریگەر بوو، لە خۆشیی

رۆڵی مەزنی ئەو، پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٣٩دا لە سلێمانی رۆژنامەکەی ناو نا (ژین).

بەڕێز رەفیق ساڵح، بەپێی سەرچاوەکانی خۆی، ئەو گۆڤارە پاش ژمارە (٢٥)ی گۆڕا بە رۆژنامە.

**(٣) یەک بوون**

یەکەمین ژمارەی لە یەکی ئەیلوولی ساڵی ١٩١٣دا دەرچووە، تەنیا چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچووە، د. کەمال مەزهەر ئەوە بە دوور نازانێت کە بەرپابوونی شەڕ هۆی وەستانی بێت. گۆڤارەکە بابەتەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی بڵاودەکردەوە.

* (تەنیا سێ ژمارەی لە لایەن محەمەد ساڵح بەدرخانەوە دەرچووە، خاوەنەکەی بەسەردا گیراوە بۆیە وەستاوە. دوای ئەم بڵاوکراوەیە (هەتاوی کورد) دەرچووە- ع. زەنگەنە).

**(٤) کوردستان**

مژدەهێنەرانی پرۆتستانت لە ورمێ دا دەریان کردو، عەبدولڕەزاق بەدرخانیش سەرپەرشتی دەکرد. یەکەمین ژمارەی لە نیسانی ساڵی ١٩١٤دا دەرچووە، تەمەنی کورت بوو، هەر چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچووە.

**(٥) کوردستان**

ساڵی ١٩١٥ بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی لە حەلەب دا دەرچووە.

* (لەو بڕوایەدانیم گۆڤارێکی وا بەم ناوە لەم شارە دەرچووبێت- ع. زەنگەنە).

**(٦) ژین**

نیو مانگانە بوو بە کوردی و عەرەبی و تورکی دەردەچوو، ساڵی ١٩١٦ سورەیا

بەدرخان لە قاهیرەدا دەری دەکرد.

* (نابێ گـۆڤـارێکی وا بەم ناوەوە دەرچووبێ، ئەگـەر هەبا خـاوەنەکـەی وەکـو ڕۆژنامەکەی ساڵی ١٩٠٨ لە ڕۆژنامەی کوردستانی ١٩١٧ لە میسر باسی دەکرد- ع. زەنگەنە).

### (٧) کوردستان

یەکـەمین ژمـارەی لە ٣٠ی کـانوونی دووەمی سـاڵی ١٩١٩ لە ئەستەمبـوڵ دا دەرچووە، نیو مـانگانە بوو، هەرچەندە دەستەواژەی (بێ لە سیاسەت هەفتانە هەموو بابەتێک بە هەر زمـانێک بێت بڵاوی دەکـاتەوە)، بابەتەکـانی تەنیـا بە زمـانانی کوردی و تورکی و عـەرەبی و فـارسی و فـەرەنسی، بڵاوکردەوە. د. کـەمال مـەزهەر وەها پەسنی دەکـات: (گـۆڤـارێـکی زۆر باش بوو، زۆر لە ژمـارەکـانیـشی بە وێنەی ناودارانی کورد رازا بوونەوە).

### (٨) هاوار

لە شـامـەوە جـەلادەت بەدرخـان دەری دەکـرد. یەکـەمین ژمـارەی لـە ١٥ی ئایاری سـاڵی ١٩٣٢دا دەرچووە، تا ژمـارە (٢٣)ی بابەتەکانی بە پیـتی عـەرەبی و لاتینی بڵاو دەکـردەوە، لە ژمـارە (٢٤)یشـەوە، ڕێکەوتی ١ی نیـسـانی ١٩٣٤ سـەرجەم بابەتەکانی بە لاتینی بڵاو دەکردەوە.

ئەم گـۆڤارە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لـە نێـو ڕۆشنبیـرانی کوردی عـێراق، کـە تا ژمـارە (٢٤)ی زۆر بە فراوانی بابەتـیـان تێـدا بڵاو دەکردەوە، بەر لەوەی دەسـەڵاتی حکوومـەتی عێراق ڕێ لە هاتنی بگرێت بۆ عێـراق، هەر (هاوار)یش وشەی گۆڤاری داهێنا، کە ئێـستا باوو چەسپاوە. [بڕوانە/ د. کەمال مەزهەر، گۆڤاری (هاوار)و کوردی عێراق، بەیان (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە ١٨٣ی ساڵی ١٩٩٩، ل ٣].

* «ئێمە کاتی خۆی دوای بڵاوبوونەوەی ئەو بابەتەی بەڕێز د. کەمال مەزهەر بە نامـەیەک ئاگـادارمـان کـردەوە، کـە حـسێـن حوزنی مـوکریانی یەکـەم کـەس بووە لە

گـۆڤـاری زاری کـرمـانجی ئەو وشـەیەی بەکـارهێناوە، بۆیە بە ڕێزیش وا دیارە بۆ وەرگێڕی بابەتەکەی بۆ زمانی عەرەبی ئەو راستییەی باس کردووەو ئەویش لە ژمارە (٣-٤)ی گـۆڤـاری (پەیڤین العـربي) لە پەراوێزی ژمـارە (٤) نووسـیـویە (ويقـول الباحث كاتب المقال ان الاستـاذ د. عبدالله زنگنه ذكر له فيـما بعد ان أول من استعمل هذه الكلمة بمعناها المتداول اليوم حسين حزني المكرياني في مجلة زاري كرمانجي- المترجم). ئەوەی شایانی باسە کـاتی خۆی مـامۆسـتا سـەلاح سەعدوڵڵا سەرنجی د. کەمالی بۆ ئەوە راکێشابوو گوایە جەلادەت بەدرخان یەکەم کەس بووە ئەم وشەیەی بەکار هێناوە. کاتی خۆی ئێـمەش بە هۆی مـامۆسـتـا دیار محەمەد سەعـید دۆسکی هەمـوو ژمارەکانی گۆڤارەکەمان دیوە، ٥٧ ژمارەی بەسێ قۆناغ لێ دەرچووە، سوپاسی هاریکاری دەکەم - ع زەنگەنە»

# وێنەی بەرگی
# هەندێ لەو گۆڤارو رۆژنامانەی
# لە ساڵانی نێوان ١٩١٤ - ١٩٣٩ دا دەرچوون

زمار ١

ادبی ؛ اجتماعیيه بەکوردی بوکوردایەتی ادوی

---

دانەری

# مصطفی شوقی

---

(حقوق چاپ بو دانەریەتی)

---

مطبعة الفرات ٥ بغداد

١٣٤٥ — ١٩٢٧

# روناكى

فهرست




موصل لە چاپخانە ى موصل حديثە چاپ كرا

٢٤ تشرين يكه م ١٩٣٥

بو ھەموشتیك

مخابرات بەزاوی

ادارەخانەوە ئەكری

§

ادارەخانە لەبنای بلدیەدایە

عنوان : سلیمانی ژیان

نسخەی بە[٥] فلسە

حەکر باز

بەشش مانك ٢٢٥

بەسالیك ٤٠٠ فلس دەدا

بو دەرەوە اجرتی

پوستەی علاوە اكری

اعلانات

بو جارێك پینج صد

بوسە جار ١٥٠٠ فلس

لسیزی

نسخەی بە پینج فلسە

ھەموشتێك لەوسی ھەفتەی جارێك دەردەچی غەزەتەیەكی كوردیە

٣ رمضان ١٣٥٢   ٢١ ك ١ ١٩٣٣   [پنجشمبە]   تاریخ انتشار ٢١ كانون ثانی ٢٦


## رمضان

وا رمضان و زستان دست بە دستەوە سازد و سر سەریان دەركەوت ، ایمەیش خواردەمەنی خواردنمان بەر كەوت . رمضانی امسال هیجی پێ نالیم روژكاری هیندە كورتە اكر میزەر بمایە ئەم كوت پیچی میزەریكە ، بو چاو برسیەكانی روژوە وانیش بازار رازاوەتەوە هر چی ئەوس پیەوی هیە ، ام سیوە لاسورە و هری ناسكە و ترێ اسمرە و هنار و پرتقالە جوانە ، خوطبلەكی میرزای ایرانی كە لە جوار ریانی كارازەكانا دای ناوە و بە شور و راكەوە ئەیفروشی ، امسال ھەوییكی ترێ بو پیدا بوە بابولەی سەلاتەی هیلكەیشی سەر بارە و هەر لە تەنشتیەوە جایخانە زلە كە جای بە دو فلسن . دەردی ترك ئەلی : (كل كیفم كل) بر راست جایخانەمان هاتە خیال امسال زر و درشتەكان نیا ئەكەن جایخانەی بلفجەی سرا داخرا ئەم خەلكە لە كوی احەوینە وە ؟ بەلی قادر آغای عطار تەنیا بە ھەتی خویەوە قرائتخانەیكی ریك خستوە ئمونە ذوقیكی شیرینو موبیلەی رنكین و كتیبیكی زوری پەسند و رنكین و غارصونەكانی پاك و تمیز و بە آغر و سنكین و مجری كورانی دلنشین و هەر جیشی بخویتەوە هرزان و پاك و خاوین ھەل دەكریت لە جیێكدا كە یاری تیا نەبی آمشوی ئەوی بكەیت بلام ئەترسم جونكە هرزان بهایە وەك جایخانەكە لای قشلە لی بی اكر قبوە خانەكەی ئەودیو كە هاوین شانامەیان تیا دەخویند بداتە دەم ئەوەی بو نەخویندەوار و قرائتخانەكەش كران بكات بو خویندەوار ئەزیین هەمو بچین و لەوی راببوێرین . بلام باور ناكم رمضان كسی بو بچی جونكە قار خانەی زور و زەبندە و قاریش برەوی زوری لم مانكە مباركەدایە بە روژ دەم بە دەست و بە شەو كیسە كراوە . خو ملا نیم هر وعظ بدەم و كس نەیكرێتەوە هەر ئەوەم پی خوشە كە دلین (اوصیكم عباداللە . اول نفس بتقوی اللە) ایستایش هرجی بلیم لبر (اتأمرون الناس) كویم كاسە ؟

سال : ١
تاریخ تأسیسی : ١٥ شعبان المعظم ١٣٤٣
ژمارە : ١
خذ ما صفا
دع ما کدر
دیاری
کوردستان
هدیة کوردستان
DIYARI-YI-KOURDISTAN
صاحب امتیاز و سر محرر : صاحبقران زاده
١٥ شعبان المعظم
چوارشه مو
١١ مارت ١٩٢٥ — ١٣٤٣

امید استقلال صحیفه ۱

...یر مسئول
...ر سر محرر
...تبی علمی
...ات به دیریك
...اه ده سوغرت
...شتیك مراجعت
...بر غزته دکری
...نه‌ی به آمیکه

# امید استقلال

سیاسی ، ادبی ، اجتماعی غزته‌یکی وکسی‌یه
هفته جاریك دردچی

بدل آبونه
به ۳ مانك روپیه و
نیو یك به شش مانك
۲ به سالیك شش روپیه به
بخارج اجرت پوسطه
علاوه ده‌کری
تأسیس تاریخی
۲۰ ایلول ۳۳۹
سلیمانی

...ال ۱ زماره ۱۲ (پنجشنبه) ۲٦ ربیع الآخر ۳٤۲ ٦ کانون اول ۳۳۹

بانگ کردستان صحیفه ۱

صاحب امتیاز و مدیر مسئول
و سر محرر
مصطفی پاشا

اعلانات به دیریك

بو هر شتیك مراجعت
به صاحب امتیاز اکری

# بانگ کردستان

بو خارج اجرت پوسطه
علاوه ده‌کری

تأسیس تاریخی
۲ آغستوس ۱۹۲۲
سلیمانی

هفته جاریك دردچی

بو هەمو شتیك مخابرات ساوی
جابخانەی رەواکری

اعلانات

بە دیریك ٣ آنه دەسیریت

تاریخ انتشاری
١٨ اغستوس ١٩٢٤ سالیانی
لسخەی بە آنەیکە

بدل ابونە
بە ٣ مانك رو پیە و نیویك
بە شش مانك ٣ روپیە
بە سالیکی شش روپیە یە

لە ٣ مانك کەز ابونە قیدم ناکری

بو خارج اجرت پوسطە
علاوە دەکری
نسخەی بە آنەیکە

ام غزتەیە غزتەیکی حکومتیە
هفتة جاریك دەردەچی

سال ١ ژمارە ٩ (جمعە) ٢٤ ربیع الآخر ١٣٤٣ ٢١ تشرین ثانی ١٩٢٤


## قدوم

حضرت اشرف مندوب السامی روژ یکشـمە ١٦ تشرین ثانی بطیارة تشریفی هیتایە سلیمانی لە وقت مواصلتیدا عموم اشراف و متحیزان و تجار و مأمورین و قطعەیکی گورة عسکر و قطعەیکی پولیس سواری و پیادە و عموم کتبیە و اصناف و اهالی لە جیکای طیارە صف بستة استقبال و احترام بون ، فخامت مندوب بە نار پولی اهالیدا و بناو همو سرور و کیف خوشی اهالیدا تشریفی بردوتەوە بیل هاتە دائرە لبر درکای دائرە کذا لە بالقیکی تر زور بە کرم بخیر هاتنیان کرد و طلبة مکتب بە شعریکی زور خوش عرض خوش امدیان کرد .

فخامت مندوب ، لپاش قدری استراحت بە پی ترتیب خوارەوە ذوات محترمة قبول فرمو بو دیدەنی :

اشراف :

جناب محمد اغای عبد الرحمن اغا

» احمد بك توفیق بك

» عزت بك عثمان باشا

» احمد بك فتاح بك

» عبد الرحمن اغای احمد پاشا

» سید عبداللە افندی حاجی سید حسن

» غفور اغا

» محمد بك قادر پاشا

تجار :

جناب حاجی اغا فتح اللە

» حاجی ملا محی الدین

» حاجی ابراهیم اغا

» حاجی صالح خفاف

» حاجی امین کاکە حمە

» حاجی ملا سعید شالی

» حاجی قادر خفاف

مأمورات :

عموم رؤسای دوائر

عسکریە :

جناب قوماندان عسکریە و عموم ارکان و رؤسای عسکریە .

لە دواییدا جناب احمد مختار بك قائمقام حلبجە ، حمە سعید بك مدیر خورمال و احمد بك ویشین و احمد بك حمە صالح بك و سلیمان خان مدیر تانجرو و لە دوای اوان جناب سید احمد حاجی مامند و شیخ نجیب

# زاری کرمانجی

گوڤاریکی اجتماعی تاریخی فنی ادبی مانگی یە

ZARI KIRMANJI

| خیەوی دەبیری | مدیر ادارە |
| --- | --- |
| حسین مکریانی | عبد الرحمن |

بو هەموشتیک مخابرە لەتک خیەوی دەکریت

سالی دوازدە روپیە یە

بو دەرەوەی مزی پوستەی دیتەسر

مزاپوەنیشنە یە قبول ناکریت

تاریخی دامزراندنی

دوازەی ذی القعدە سالی هزار وسیصد و چل و چوار

لە رواندز لە مەرکەزی زار کرمانجی دامزرا

سالی دووەم ژمارە ١٢ — ٢٥ کانونی دوەم ١٩٢٨

# سەرچاوەکان

* ئەو گوتارو رۆژنامانەی لە سەردەمی لێکۆڵینەوەکەدا دەرچوون ١٩١٤-١٩٣٩ (چاپی ئوریجنال)
- (بانگی کوردستان» (رۆژنامە) هەموو ژمارەکان
- «رۆژی کوردستان» (رۆژنامە) هەموو ژمارەکان
- «ئومێدی ئستیقلال» (رۆژنامە) هەموو ژمارەکان
- «ژیانەوە» (رۆژنامە) هەموو ژمارەکان
- «ژیان» (رۆژنامە) هەموو ژمارەکانی دوو ساڵی یەکەم و ژمارە جیاجیاکانی ساڵانی دیکە
- «دیاری کوردستان» (گۆڤار) هەموو ژمارەکان
- «زاری کرمانجی» (گۆڤار) ژمارەی جیاجیا
- «یادگاری لاوان» (گۆڤار) ژمارەی یەکەم
- «روناکی» (گۆڤار) ژمارەی جیاجیا

* ئەو گوتارو رۆژنامانەی هەموو ژمارەکانی چاپکراونەتەوە لە کتێبدا «بە گوێرەی ساڵی دەرچوونی گوتارو رۆژنامەکان دانراون».
- کوردستان - یەکەمین رۆژنامەی کوردی ١٨٩٨- ١٩٠٢ (کۆکردنەوەو پێشەکی د. کەمال فوئاد) بەغدا ١٩٧٢ .
- رۆژی کورد ١٩١٣ (کۆکردنەوەو پێشەکی جەمال خەزنەدار) بەغدا ١٩٨١ .
- کوردستان - خولی سێیەم (کۆکردنەوە پێشەکی د. کەمال فوئاد) سلێمانی ١٩٩٨
- پێشکەوتن ١٩٢٠-١٩٢٢ (کۆکردنەوە عەلی ناجی کاکە حەمە ئەمین عەتار، سیروان بەکر سامی) پێشەکی د. مارف خەزنەدار - هەولێر ١٩٩٨.
- بانگی کوردستان (کۆکردنەوەو پێشەکی جەمال خەزنەدار) بەغدا ١٩٧٤.
- رۆژی کوردستان ١٩٢٢-١٩٢٣ (کۆکردنەوەو پێشەکی جەمال خەزنەدار) بەغدا ١٩٧٣.
- پەیژە (لە کتێبی پەیژەو مستەفا شەوقی. مومتاز حەیدەری ساڵی ١٩٨٥- هەولێر)

**چاوپێکەوتن**
- جەمال بابان (١٩٩٩/٥/٢٠)
- رەفیق ساڵح (١٩٩٩/٣/١٠)
- سینەم خان جەلادەت بەدرخان (١٩٩٩/٥/١٠)
- سەلاح سەعدوڵلا (١٩٩٩/٥/١٠)
- عەبدلڕەزاق بیمار (١٩٩٩/٦/٨)

- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چاوپێکەوتنی نیمچە ڕۆژانە.
- د. وەمیز جەمال عومەر نەزمی (١٤/٥/١٩٩٩)

*** نامەی زانکۆیی**

- ڕەمزیە محەمەد سابیر، حوزنی موکریانی نووسەرو ڕۆژنامەنووس، نامەی ماجستێر بڵاونەکراوەتەوە، کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر ١٩٩٣.
- فوئاد حوسێن - هۆنراوەی نیشتمانی لە ئەدەبی کوردیدا، نامەی دکتۆرا - بڵاونەکراوەتەوە، کولێژی پەروەردە - زانکۆی بەغدا ١٩٩٦ .

*** بە زمانی عەرەبی**

أ- دانراو.

- د. احسان عسكر - نشاة الصحافة السورية، دار النهضة العربية - القاهرة - ١٩٧٢ .
- د. بلەج شيركو، القضية الكردية - ماضي الكرد وحاضرهم. الطبعة الاولى، مطبعة السعادة، محافظة مصر، ١٩٣٠ .
- جبار جباري- تاريخ الصحافة الكردية في العراق، بغداد، ١٩٧٥ .
- جلال الطالباني- كردستان والحركة القومية الكردية، ط٢، دار الطليعة، بيروت- ١٩٧١ .
- جمال خزندار - مرشد الصحافة الكردية، بغداد، ١٩٧٣ .
- د. خليل صابات (و د. سامي عزيز و د. يونان لبيب رزق)، حرية الصحافة في مصر ١٧٩٨ - ١٩٢٤، القاهرة، ١٩٧٣ .
- زاهدة ابراهيم - كشاف الجرائد والمجلات العراقية، بغداد، ١٩٧٦ .
- د. سامي عزيز، الصحافة المصرية وموقفها من الاحتلال الانكليزي، القاهرة، ١٩٨٦

- د. شاكر خصباك - الاكراد - دراسة جغرافية اتنوغرافية - بغداد - ١٩٧٢.
- د. شاكر خصباك - العراق الشمالي ط١، بغداد، ١٩٧٣.
- د. عبدالله اسماعيل البستاني، جريدة الصحافة، دراسة مقارنة، القاهرة، ١٩٥٠.
- د. عبدالله الفياض - الثورة العراقية الكبرى، ط٢، مطبعة دارالسلام، بغداد- ١٩٧٥

- د. عبدالرحمن قاسملو- كردستان والاكراد. ط١، المؤسسه اللبنانية للنشر، بيروت، ١٩٧٠.
- عبدالرزاق الحسني- العراق قديماً وحديثاً، ط٣، بغداد، ١٩٥٨ .
- عبدالرزاق الحسني- تاريخ الصحافة العراقية، الجزء الاول، ط٣، صيدا - لبنان، ١٩٧٣ .
- عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الرابع، ط٧، دارالشؤون الثقافية العامة، ١٩٨٨ .
- عبدالرزاق الهلالي- تاريخ التعليم في عهد الاحتلال البريطاني، بغداد، ١٩٧٥.
- د. عبدالستار طاهر شريف - الجمعيات والمنظمات الكردية خلال نصف قرن، بغداد، ١٩٨٩.
- د. عزيز الحاج- القضية الكردية في العشرينات، ط٢، المؤسسة العربية للدراسات والنشر بيروت، ١٩٧٥ .
- د. علي الوردي، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، ج٣، بغداد، ١٩٧٨.
- د. عماد عبدالسلام رؤوف - مراكز ثقافية مغموره في كردستان، بغداد، ١٩٩٧.
- د. عناد الكبيسي - الادب في صحافة العراق، النجف، ١٩٧٢.
- د. فاضل حسين - مشكلة الموصل، ط١ مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٥٥.
- فؤاد حسين الوكيل - جماعة الاهالي في العراق، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٧٥
- د. كمال مظهر احمد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، بغداد، ١٩٧٨ .
- د. كمال مظهر. دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر- منشورات مكتبة اليقظة العربية- بغداد، ١٩٨٥ .
- منذر الموصلي - عرب واكراد - بيروت، ١٩٨٦ .
- منير بكر التكريتي - الصحافة العراقية واتجاهاتها السياسية والاجتماعية والثقافية، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٦٩ .
- ناجي الحديثي- العراق/ ١٩٨٨، دار المأمون للنشر، بغداد، ١٩٨٩ .
- نزار جرجيس علي، صحافة اربيل، دار الثقافة والنشر الكردية، بغداد، ١٩٨٨ .
- هادي طعمة، الاحتلال البريطاني والصحافة العراقية - بغداد، ١٩٨٤ .

**ب- وەرگێردراو بۆ عەرەبی**

- ادموندز، كرد وترك وعرب، سياسية ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقي من العراق ١٩١٩-١٩٢٥، ترجمة جرجيس فتح الله، بغداد، ١٩٧٨.
- باسيل نيكيتين- الاكراد، دار الروائع، بيروت، بلا
- ب. م. دانتسيغ - الرحالة الروس في الشرق الاوسط، ترجمة د. معروف خزندار، دار الرشيد، بغداد، ١٩٨١ .
- دبليو. آر. هي، سنتان في كردستان، ترجمة فؤاد جميل، الجزء الاول، بغداد، ١٩٧٣ .
- ستيفن همسلي لونكريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة جعفر الخياط، ط٦، بغداد، ١٩٨٥ .
- د. غسان العطية- العراق نشأة الدولة، ترجمة عطا عبدالوهاب، لندن، ١٩٨٨.
- ماليسانژ- بدرخانيو جزيرة بوتان، ترجمة شكور مصطفى، اربيل، ١٩٩٨ .
- محمد امين زكي، تاريخ الدول والامارات الكردية في العهد الاسلامي، ترجمة محمد على عوني، القاهرة، ١٩٤٥ .
- محمد امين زكي، تاريخ السليمانية وانحائها، ترجمة محمد جميل الروژبياني، بغداد، ١٩٥١ .
- هاملتون، طريق في كردستان، ترجمة جرجيس فتح الله، بغداد، ١٩٧٣ .

**جـ- باس و لێكۆڵینەوەو وتار**

- ابراهيم باجلان، لمناسبة مرور ثلاثين عاما على صدورها مجلة هەتاو - العراق (جريدة)، بغداد، ١٩٨٤/٥/١٤ .
- اسماعيل رسول - بعض مشكلات الصحافة- رۆژی کوردستان (مجلة)، بغداد العدد ٧٥، سنة ١٩٨٧.
- جمال بابان - عارف صائب بين الجد والغزل، رۆژی کوردستان، العدد ٢٨-٢٩ تموز، ١٩٧٥ .
- جمال خزندار، (مجلة «گەلاوێژ» نجمة الصبح ١٩٣٩-١٩٤٩ ومضه ستبقي تشير درب الصحافة الكردية)، رۆژی کوردستان - شمس كردستان (مجلة) العدد ٤٢-

تشرين الثاني، ١٩٧٦ .
- عبدالرحمن پاشا- قرارات في جريدة كردستان بعد قرن من الزمان، (العراق) «جريدة»، ٢٤ نيسان، ١٩٩٠ .
- عبدالفتاح على يحيى، الهجوم العثماني على كردستان وسقوط امارة سوران، القسم الثاني «كاروان» (مجلة)، اربيل العدد ٥٣، شباط ومارت ١٩٨٧ .
- عبدالفتاح على يحيى- الهجوم العثماني على كردستان وسقوط امارة سوران، القسم الثالث «كاروان» (مجلة)، العدد ٥٤، نيسان ١٩٨٧ .
- كريم مصطفى شارەزا- حزني المكرياني ودوره في تطوير فن المقال الكردي «كاروان» (مجلة)، العدد ٧٠ كانون أول - ١٩٨٨، القسم العربي.
- كريم مصطفى شارەزا، عبدالرزاق بدرخان البوتاني نشاطه الثقافي والسياسي «كاروان» (مجلة)، العدد ٦٥، حزيران ١٩٨٨ .
- د. كمال مظهر، موقف الملك فيصل الاول من المسألة الكردية في العراق - غير منشور.
- د. كمال مظهر - كرد السليمانية وبغداد بين الحربين العالميتين، غير منشور.
- د. كمال مظهر. رأي للمناقشة - الاطار الزمني لتأريخ العراق الحديث والمعاصر «الحكمة» (مجلة) بغداد. العدد الخامس، تشرين الثاني. كانون الاول ١٩٩٨ .
- د. كمال مظهر «گەلاوێژ» في لقاء مع الاستاذ علاءالدين سجادي، التأخي (جريدة) بغداد، العدد ١٤٤٩، الاثنين تشرين الاول ١٩٧٣ .
- مارتين ڤان برونيسين، ثورة سمكو ودور العشائر الكردية الايرانية، «ترجمة سعيد يحيى، «كاروان» (مجلة)، العدد ٦٤، مارس ١٩٨٨ .
- مسعود محمد، تثنية الحج الى اعتاب العلامة الخطي، القسم الاول «كاروان» (مجلة)، العدد ٧١، كانون الثاني ١٩٨٩ .
- مسعود محمد، تثنية الحج الى اعتاب العلامة الخطر، القسم الثاني (كاروان) (مجلة)، العدد ٧٢، شباط ١٩٨٩ .
- نزار جرجيس على، گيو المكرياني صحفيا رائداً العراق (جريدة)، ١٩٨٤/٤/٢١.
- بمناسبة رحيل العالم الكردي الدكتور كامران بدرخان، «رۆژی کوردستان» (مجلة)، العدد ٥٥، «حزيران» وتموز ١٩٧٩ .

**بە زمانی کوردی**

**أ- دانراوەکان**

- د. ئەورەحمان حاجی مارف، نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی، بەغدا، ١٩٨٥.
- د. ئەورەحمان حاجی مارف. رێنووسی کوردی بە پیتی عەرەبی، بەغدا، ١٩٨٦ .
- جەمال بابان- سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەشی دووەم، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی - بەغدا، ١٩٩٨ .
- جەمیل سائیب، لە خەوما (ئامادەکردن و پێشکەش کردن جەمال بابان)، بەغدا، ١٩٧٥ .
- حسین حوزنی موکریانی، پێشکەوتن، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦٢.
- حسین عارف، چیرۆکی هونەریی کوردی ١٩٢٥ - ١٩٦٠، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٧٥.
- رەفیق حلمی، یادداشت - کوردستانی عیراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، بەشی یەکەم، لە چاپکراوەکانی ئەمینداریتی کاروباری رۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٨.
- عەبدولڕەزاق بیمار، پەخشانی کوردی، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٩٨ .
- د.عزەدین مستەفا رەسوڵ، ئوستاد، سلێمانی، ١٩٩٨.
- عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەغدا، ١٩٥٢ .
- عەلائەدین سەجادی، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٧٨
- غەفور میرزا کەریم، یادگاری لاوان و دیاری لاوان، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨.
- د. کەمال مەزهەر، کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥ .
- د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کوردی، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٨.
- د، کەمال مەزهەر، «تێگەیشتنی راستی»و شوێنی لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٨.
- د. کەمال مەزهەر، مێژوو، بەغدا، ١٩٨٣.
- د. کەمال مەزهەر، شوکری فەزلی و چەند تێبینییەکی مێژوویی، کۆڕی زانیاری عیراق دەستەی کورد ، بەغدا، ١٩٩٠.
- محەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، جلدی یەکەم، (بەشی دووەم)، بەغدا، ١٩٣١ .
- مەسعود محەمەد، پەرژینی بێدەنگی، لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی فەرهەنگیی سوید-کوردستان، سوید، ١٩٩٦ .

- مستەفا نەریمان، بیبلیوگرافیای دوو سەد ساڵەی کتێبی کوردی، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٤ .

### ب- وەرگێردراوەکان بۆ کوردی

- د. جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی (وەرگێرانی د. کاوس قەفتان)، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٧ .
- میجەر نوئیل، یادداشتەکانی مەیجەر نوئیل لە کوردستان، (وەرگێرانی حسێن ئەحمەد جان و حسێن عوسمان نێرگسەجاری)، بەغدا، ١٩٨٤ .

### ج- باس و لێکۆڵینەوەو وتار

- ئاورەحمان حاجی مارف، رێنووسی کورد لە روانگەی «تێگەیشتنی راستی»دا، کۆڕی زانیاری عیراق - دەستەی کورد (گۆڤار)، بەغدا، بەرگی دەیەم، ١٩٨٣.
- ئومێد ئاشنا، چەند رۆشناییەکی نوێ بۆ سەر گۆڤاری «بانگی کورد»، رۆشنبیری نوێ (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە ١١٩، ئەیلوولی ١٩٨٨ .
- ئومێدی ئاشنا، چەند لایەنێکی شاردراوە لە ژیانی رۆژنامەگەریی پیرەمێردی نەمر، بەشی یەکەم (کاروان) «گۆڤار»، هەولێر، ژمارە ٣٩، کانونی یەکەمی ١٩٨٥ .
- ئیسماعیل ئەنوەر بەرزنجی، یەکەم کتێبخانە لە رەواندز، «رەنگین» (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە ١٥، کانونی دووەمی ١٩٨٩ .
- جەبار جەباری، رۆژنامەی «کەرکووک» بە تەمەنترین رۆژنامەیە لە کوردستاندا، «رۆشنبیری نوێ» (گۆڤار)، ژمارە ٤٣-٤٤، ١٩٧٥/٩/٢١ .
- د. جەبار قادر، رۆژنامەی کورد و چەند زانیارییەکی نوێ، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٣٢، مایسی ١٩٨٥ .
- جەمال خەزنەدار، لاپەڕەیەکی بێگەرد لە مێژووی رۆژنامەگەریی کوردیدا، «رۆژی کوردستان» (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە ٥٦، تشرینی دووەم ١٩٧٩ .
- جەمال محەمەد ئەمین، رۆژنامەی «بانگی کوردستان» لە خزمەت کردنی کاروانی وێژەیی و رۆشنبیری کوردیدا، «بەیان» «گۆڤار»، بەغدا، ژمارە (١٩٥)، ئابی ١٩٧٩ .
- حەجی جەعفەر، لدیف چوونەک لەسەر یەکەمین رۆژناما کوردی، «رۆشنبیری نوێ» «گۆڤار»، ژمارە ١٠٨، کانونی یەکەمی ١٩٨٥ .
- د. حسێن رەهبەر، جەلادەت بەدرخان وەک هێمداری ئەلف بێیا لاتینی کوردی، رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٠٥، ١٩٨٥ .
- س. ع. شادمان، ئاهەنگی بیستەمین ساڵەی رۆژنامەی «ژین» چۆن کرا لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٤٦، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٦٣، ئادارو نیسانی ١٩٨٨ .
- عەبدوڵڵا بابەعەلی بەرزنجی، شێخ مەحموودی حەفید، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٦٠،

تشرینی یەکەم دووەمی ١٩٨٨
- عەبدوڵلا بابەعەلی بەرزنجی، فایەق بێکەس، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٦٢، کانونی دووەمی شوباتی ١٩٨٨ .
- عەبدوڵلا حەمە ئاغا، رۆژنامەو رێکخراوە کوردییەکانی تورکیا لە سەردەمی یەکەمی جەنگی جیهانیدا، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٦٤، مایسی ١٩٨٨ .
- عەبدولڕەزاق بیمار، مستەفا پاشای یاملکی و رۆژنامەنووسیی و سیاسەت و ئەدەب، (رۆژی کوردستان) (گۆڤار)، ژمارە ٥٩، ئایارو حوزەیرانی ١٩٨٠ .
- عەبدولڕەزاق بیمار، زێوەرو شیعری سیاسی، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٤٠، کانوونی دووەمی ١٩٨٦ .
- عەبدولکەریم فندی دوسکی، گۆڤارا «ژین»ی و چەند راستیەک، «رۆشنبیری نوێ»، ژمارە ١٠٨، کانونی یەکەمی ١٩٨٥ .
- ع. بەسۆز- دیوانی شوکری و تێبینی من، «بەیان» (گۆڤار)، ژمارە (؟)، ساڵی ١٩٩٠.
- عەزیز رەشید حەریری، ئەسیری، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٣٦، ئەیلوول ١٩٨٥ .
- عەلی خورشید، شێخ رەزای تاڵەبانی، «کاروان»(گۆڤار)، ژمارە ٦٤، مایسی ١٩٨٨
- غەفووری میرزا کەریم، دوو هەڵوێستی گرنگ لە بواری تێکۆشانی ناو ئەنجوومەنی نوێنەراندا، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٨ - ئاداری ١٩٨٣ .
غەفووری میرزا کەریم، شوکری فەزلی ئەستێرەیەکی گەشی ئاسمانی ئەدەبی کوردو عەرەبە، «بەیان» (گۆڤار)، ژمارە ٤٩، مایسی ١٩٧٨ .
- غەفوور میرزا کەریم، کۆچی دوایی مامۆستا عەلائەدین سجادی، «رۆشنبیری نوێ» (گۆڤار)، ژمارە ١٠٨، کانونی یەکەمی ١٩٨٥ .
- لەتیف بەرزنجی، «شێخ مەحموود حەفید کارەساتێکی بە وەفاو جگەرسۆز بوو، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٦٩، تشرینی یەکەم و دووەمی ١٩٨٨ .
- کەمال رەئووف محەمەد، دوو مستەفا شەوقی - بەشی یەکەم، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٤١، شوباتی ١٩٨٦ .
- کەمال رەئووف محەمەد، دوو مستەفا شەوقی - بەشی دووەم، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٤٢، ئاداری ١٩٨٦ .
- کەمال رەئووف محەمەد، یەکەم رۆژنامەی هەولێر، «کاروان» (گۆڤار)، ژمارە ٤٨، ئەیلولی ١٩٨٦ .
- د. کەمال فوئاد، «بانگی حەق» یەکەمین رۆژنامەی شۆڕشی کوردستان، «مرۆڤایەتی» (گۆڤار)، پاشکۆ بە بۆنەی سەدساڵەی رۆژنامەنووسیی کوردی، سلێمانی، ١٩٩٨.
- د، کەمال مەزهەر، چەند راستییەکی نوێ دەربارەی یەکەم گۆڤاری کوردی، «رۆشنبیری نوێ» (گۆڤار)، ژمارە ٧١، تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ١٩٧٨ .
- د. کەمال مەزهەر، مەعروف جیاوک و سەید تەها و هەڵوێستێک، «رەنگین»

(گۆڤار)، ژماره ۸۳، ۱۵ ئەیلوولی ۱۹۹۵ .
- د. کەمال مەزهەر، گۆڤاری «هاوار» و کوردی عیراق، «بەیان» گۆڤار، ژماره ۱۸۳، ساڵی ۱۹۹۹ .
- د. کوردستانی موکریانی، رۆشناییەک لەسەر گۆڤاری «روناکی»، «رۆشنبیری نوێ» (گۆڤار)، ژماره ۱۰۷، ئەیلوولی ۱۹۸۵ .
- گوشاد حەمە سەعید، کوردستان و بزووتنەوەی رووناکبیری لە نێوان ساڵانی ۱۸۹۸-۱۹۱٤، بەشی دووەم. «رۆژی کوردستان» (گۆڤار)، ژماره (٦٧)، حوزەیرانی ۱۹۸٤.
- جەمیل رۆژبەیانی، سەرنجێکی سیپارەی شوکری فەزلی، رۆشنبیری نوێ (گۆڤار)، ژماره ۱۳۰، ۱۹۹۳.
- د. مارف خەزنەدار، «رۆژی کورد» و «شەفەق» لە تۆماری زانستی و بیرەوەریدا، «رۆژی کوردستان» (گۆڤار)، ژماره ٥٤، ئاداری ۱۹۷۹ .
- مەحموود زامدار، دەوری رۆژنامەگەری کوردی لە ژیانی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی گەلی کورد، «رۆشنبیریی نوێ» (گۆڤار)، ژماره ۱۱۳، ئاداری ۱۹۸۷ .
- مستەفا ساڵح کەریم، چەپکێک نامەو یادگاری نێوان ئەمین زەکی و پیرەمێرد، «رۆشنبیری نوێ» (گۆڤار)، ژماره ۱۲۰، کانونی یەکەمی ۱۹۸۵ .
- مستەفا ساڵح کەریم، ئاهەنگی جەژنی نەورۆز لە مێژووی شاری سلێمانی داو دەوری پیرەمێرد لەم جەژنە نەتەوایەتییەدا، «کاروان» (گۆڤار)، ژماره ۷۳، ئاداری ۱۹۸۹ .
- مستەفا نەریمان، خەباتی نەوەی بەدرخان لە رۆژنامەی کوردستاندا بەشی یەکەم، «رۆشنبیری نوێ» (گۆڤار)، ژماره ۱۰۹، ساڵی ۱۹۸٦ .
- مەغدید حاجی، کاروانە سەخت و پیرۆزەکەی چاپخانەی کوردستان، «کاروان» (گۆڤار)، ژماره ۳۲، مایسی ۱۹۸۵ .

# پێرست



***